# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی حەوتەم

## تەفسیری سوورەتی (الأنفال)

عەلی باپیر

# تەفسیری قورئانی

# بەرز و بەپێز

عەلی باپیر

## بەرگی حەوتەم

## تەفسیری سوورەتی ( الأنفال )

## پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نـووســـەر : عەلـی باپـیـر.

نەخشەسازیی ناوەوە : عزالدین محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٣٧ ك– ٢٠١٦ز.

تـــیـراژ : ١٠٠٠ دانە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدِ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ باللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أن لاَ إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمـــران، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النســـاء، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلاَمُ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد ، پێش هەر قسەیەکی گرنگ ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتد، وە ئەم وتارە ، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجە: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفكرینو رامان، فێركردن، كارپێكردن ... هتد، بەباشترین جێگرتن جێگا دەگرێو ، خاوەنەكەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش كە - وەك باسكردنی چاكەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم كردۆتەوە، خوای بەبەزەییو بەخشەر چاكەی لەگەڵ كردوومو، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی كردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم، كە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بكەمو، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەكانی قورئانو تێوەرامانی ئایەتە پڕ بەرەكەتەكانیو، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێكڕای كتێبو نامیلكەو وتارو دەرسەكانم، كەمو زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، كە دیارە هەر ئەمەش شتێكی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، كە ئەویش هەر ڕوونكردنەوەی قورئانو چۆنیەتی جێبەجێكردنو كارپێكردنیەتی، شتێكی دیكەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو كە براو خوشكانێكی دڵسۆزی نزیكو ئاشنام، داوایان لێدەكردم كە دەست بكەم بە دانانی تەفسیرو لێكدانەوەیەكی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، كە ناوی خوای لێبهێنمو دەست بەو كارە گەورەو گرنگە بكەم، بەڵكو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێكی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێكی وام بۆ دەرەخسێ كە بتوانم خێرایی تێدا بكەمو خۆمی بۆ یەكلایی (متفرِّغ) بكەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بكەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێكدانەوەیەشم ، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی كە باونو ، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەرامانی خۆم لە خودی قورئان، چونكە بێگومان قورئان : هەندێكی هەندێكی ڕوون دەكاتەوە: (القرآن یُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونكە پێغەمبەری خواش ڕوونكەرەوە (مُبَیِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿ ... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل، واتە: وە زیكرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار ، تاكو ئەوەی بۆ خەڵكی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بكەیەوە، وە بەڵكو خۆشیان بیربكەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو ، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەکانیو کتێبەکانی سوننەتدا خەریکمو ، دەیان کتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانییەوە ، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی : (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك دەروشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێمو هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنوورداربوونی تواناو بڕستم ، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشم ویستوە کە زۆر بەمەلاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگاتو، بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە ؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخریج)ی سەرجەم دەقەکانی

---

١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو ، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانو، سەرجەم هەشت بەرگو دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەمو، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا ، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیرە کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر صالّحو ساغو سەلامەتو سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕانو کچان ، لەنێو گەلەکەماندا ، زۆر بکات .

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش **(جزء)**ەکانی قورئانو دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - **(حزب)** - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو ، سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستنو، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش **(جزء)** و شەست (٦٠) **(حزب)**، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا، دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەینو ، بە گوێرەی سوورەتەکان ، بەرگەکانی دیاریی دەکەین

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرسو وتار پێشکەش کراوە، بەلاّم دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەلاّم ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو **(خطبة الحاجة)**یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

**سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .**

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سوورەتی (التوبة)، سەرگەرمی سوورەتی (یونس)ەو عەزمیشی جەزم کردوە ، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ .

# پێشەكی ئەم بەرگە

بسْمِ اللَّه الرَّحمن الرَّحيم

الحَمـد للّه رَبّ العَـالَمِين ، وَالصَلاةُ والسـلام والبَرَكـاتُ عَلـى مُحَمَّدٍ الـمَبعُوث نَبِيّـاً ورَسـولاً الـى الإنسِ والجـنّ ، وآلِـهِ أَجْمَعِـين، مِـنَ الصَّحْبِ والأَزْوَاجِ وَالقَرَابَـةِ وَالتابعِيـنَ لَهُمْ بِإِحسَان وَ يَقّين.

خوێنـەری بەڕێـزو خۆشـەویستم !

سـتـایشی شـایسـتە بۆ خوای بەرزو مەزن و خـاوەن بەخششو بەزەیی بێ سـنوور، كە یارمەتیـی داین بەرگـی حەوتـەمی : {تەفسیـری قورئانـی بـەرزو بەپێـز} یـش بخەینـە بەردەسـتی خوێنـەرانی بـەڕێزو تینـووانی ئـاوی سـازگاری شـیرینـی تێگەیشـتینی فەرموودەی خـوا (كـلام اللّه) .

شـایانی باسیشـە ئـەم بەرگـە سـوورەتی (الأنفـال)ی گرتـۆتە خـۆی ، ئنجـا لـە سۆنگەی ئەوەوە ، كە سوورەتی (الأنفـال) باسو خواسـی ڕووداوەكانی جەنگـی بـەدری گـەورە ( غزوة بـدر الكبـرى)ی گرتوونە خۆی ، هەروەها گەلێك یاساو ئـەدەبی گـەورەو گرنگـی بـواری جـەنگو جیهـادی گرتوونـە خـۆی ، بـە پێویسـتم زانـی كـە بـەر لـە دەستپێكردنی تەفسیـركردنو شـیـركردنەوەی چەمكو واتـای ئایەتـەكانی ، دوو بابـەت وەك ڕێ خۆشـكـردن (تمهیـد) بێنیـن : یەكـەمیان لـەبارەی جـەنگو جیهـادەو ، دووەمیشیان لەبارەی جەنگی بەدرو ڕووداوەكانیـەوە .

هیـوادارپشـم توانیبـم بەهـۆی تەفسیـركردنی ئـەم سـوورەتە (الأنفـال)و دوایـیش سـوورەتی (التوبـة)ەوە ــ كـە پـێم وایـە ، بـە هەردووكیـان زۆربـەی یاسـاو ئـەدەبو بابەتـەكانی جـەنگو جیهادیـان كۆكردوونـەوە ــ تێگەیشـتنی ڕاسـتو دروسـتو هاوسـەنگو دوور لە تێپەڕاندنو بەزایـەدان (الإفراط والتفریط) كە لـەم ڕۆژگارەمانـدا

زۆرێك لە مسولْمانان پێیانەوە گیرۆدەبوون ، لەبارەی بابەتی جیهادو جەنگەوە ، بخەمە ڕوو.

هەڵبەتە مرۆڤیش دەبێ وریا بێو ، هیچ کاتێك شتێکی هەقو ڕاستی لەبەرچاو نەبێزرێ ، بەهۆی ئەوەوە ، کە بە شێوازێکی ناهەقو ناڕاستی مومارەسە دەکرێ .

شایانی باسیشە : لە سەرەتاوە ویستم ئەم سوورەتی (الأنفال)و سوورەتی (التوبة) بکەمە یەك بەرگ ، هەم لەبەر نیزیکیی نێوەڕۆکیان لە یەکدیو ، هەم لەبەر ئەوەش کە ڕایەکی زانایان هەیە دەڵێ : ئەو دوو سوورەتە ، هەر یەکن ، یانی : (التوبة ـ البراءة) هەر درێژکرانەوە (إمتداد) ی (الأنفال)ە ، بەلاّم دوایی لەبەر زۆر گەورە نەبوونی قەبارەکەی ، بۆ هەر کام لە دوو سوورەتە ، بەرگێکمان تەرخان کرد .

خوای میهرەبانیش یاریدەی خۆمو هاوکارانم بداتو ، سینەمان فراوانو ، کارمان ئاسانو زمانو قەڵەممان ڕاستو ڕەوان بکات ، بۆ تەواوکردنی ئەم تەفسیرە ، تاکو کۆتایی سوورەتە بەپێزەکانی قورئان .

٤ ی محرم ١٤٣٧ ك

١٧ ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٥ ز

## ڕێ خۆشکردن :

# پێناسەی سوورەتی (الأنفال) و بابەتەکانی لە حەوت بڕگەدا

**یەکەم** : سوورەتی ئەنفال بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف ، هەشتەمین سوورەتە ، کە لە دوای فاتیحەو بەقەرەو ئالی عیمران‌و نیساءو ئەنعام‌و ئەعراف دێ .

ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی ئەنفال ، حەفتاو پێنج (٧٥)ە ، هەندێکیشیان گوتوویانە : حەفتاو شەش (٧٦)ە .

وە سوورەتی ئەنفال لە ساڵی دووەمی کۆچیی ، پاش جەنگی بەدر دابەزیوە ، وە سوورەتێکی مەدینەییە، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، وە هەندێکیش گوتوویانە : حەوت ئایەت لە سوورەتی ئەنفال ، مەککەیین ، ئەو ئایەتانەی کە لێرەوە دەست پێدەکەن : ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ٣٠ ﴾، هەتا حەوت ئایەت دوای ئەوە ، بەڵام ئەو ڕایە بێهێزە ، چونکە ئەوەی لەو ئایەتانەدا خوای پەروەردگار دەیفەرموێ ، تەنیا بیری پێغەمبەر ﷺ دەخاتەوەو ، دەفەرموێ : وە یاد بکەوە ! کاتێك کە ئەوانەی بێبڕوا بوون ، پیلانیان لە دژی تۆ دەگێڕا : کە یان بتگرن، یان بتکوژن ، یان دەرت بکەن ، یانی : بیری دەخاتەوە ، نەك لەو کاتەدا ئەو ئایەتانە لە مەدینەدا هاتبنە خوار ، واتە : خوای زاناو کاربەجێ لە شاری مەدینە ، ڕووداوێك بیر پێغەمبەر ﷺ دەخاتەوە ، کە لە مەککە ڕوویداوە .

**دووەم** : چەند دەقێك لەبارەی سوورەتی ئەنفالەوە :

١ / ﴿عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ : أَنَّ النَّبِيّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكَعَتَيْنِ مِنَ الْمَغْرِبِ بِسُورَةِ الأَنْفَالِ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكَبِير) ، برقم : (٢٧٠١)، وَقَالَ الهَيْثَمِي رِجَالُهُ رِجَال الصَّحِيح}.

واتە: زەیدی کوڕی سابیت خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی شێوان دا سوورەتی ئەنفالی دەخوێند .

لێرەوە من دەمەوێ سەرنجی هەموو لایەك بۆ ئەوە ڕابکێشم ، کە زۆر لە پێشنوێژ خوێنەکان ، کردوویانە بە عادەت : سوورەتە کورتەکان دەخوێنن ، کە ئەوە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ ، چونکە ئەوە زەید خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی شێوان دا سوورەتی ئەنفالی دەخوێند ، واتە: بە هەردووکیان سوورەتەکەی تەواو دەکرد .

پاشان (أبو داود) و (النسائي) هێناویانە : {أَنَّ النَّبِيّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ بها في المغرب في الركعتين}[1].

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی شێوان دا ، سوورەتی ئەعرافی هەموو خوێندوە .

٢ / ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا : أَنَّ سُورَةَ الأَنْفَالِ نَزَلَتْ فِي بَدْرٍ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم : (٤٦٠٠)}.

واتە : عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : سوورەتی ئەنفال لە بەدر دابەزی ، واتە : لەو شوێنەی کە جەنگی بەدری لێ ڕوودا ، کە دیارە جەنگەکەش بۆیە ناوی لێنرا بەدر، وەك دوایی باسی دەکەین .

٣ / ﴿عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ، قَالَ: قُلْتُ لابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا : سُورَةُ الأَنْفَالِ؟ قَالَ : سورة بَدْرٍ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم : (٤٣٦٨)، ومُسْلِم برقم : (٧٧٤٣) }.

---

١) أخرجه أبو داود : (٨١٢ ) ، والنسائي : (١٧٠/٢) و إسناده صحيح .

واتە : سەعیدیی کوڕی جوبەیر دەڵێ : پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس کرد ، دەربارەی سوورەتی ئەنفال ؟ گوتی : ئەوە سوورەتی (بەدر)ە ، کەواتە : یەکێك لە ناوەکانی دیکەی سوورەتی ئەنفال ، بریتیە لە سوورەتی (بەدر) ، کە دیارە زۆربەی سوورەتەکانی قورئان لە ناوێك زیاتریان بۆ بەکارهاتوە .

**سێیەم** : سوورەتی ئەنفال هەمووی تەرخان کراوە بۆ باس‌و خواسی ڕووداوەکانی جەنگی بەدر ، دیارە جەنگی بەدریش ، وەك دوایی بە درێژیی باسی دەکەین ، لەبەر ڕۆشنایی کتێبەکەی ئبنو هیشام دا ، لە ساڵی دووەمی کۆچییدا ڕوویداوە ، وە بە وردیی لە حەڤدەی مانگی ڕەمەزاندا ، واتە : لە ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆدا[1] ، جا وێڕای ئەوە کە ئەم سوورەتی ئەنفالە ، بە تایبەت باسی جەنگی بەدر دەکات ، زۆر لە یاساکانی جەنگ‌و جیهادیشی گرتوونە خۆی ، وە من دەتوانم بڵێم : ئەم سوورەتەو سوورەتی تەوبە (بَرَاءَة) کە لە دوایەوە دێ ، بە هەردووکیان زۆربەی هەر زۆری باس‌و خواسی جەنگ‌و جیهادو حوکم‌و یاساکانیان ، گرتوونە خۆیان .

**چوارەم** : ئەم سوورەتە هەرچەندە لە (مَثَانِي)یە ، واتە : ئەو سوورەتانەی کە ژمارەی ئایەتەکانیان لە سەد کەمترە ، بەڵام خراوەتە ڕیزی (مِئِين)ەوە ، یانی : خراوەتە ڕیزی سوورەتە درێژەکان (السَّبْعُ الطِّوَال)ەوە، ئەویش هۆکارەکەی ئەوە بووە ، کە هاوەڵان دڵنیا نەبوون کە ئایا سوورەتی ئەنفال‌و تەوبە ، کە (بَرَاءَة)شی پێ دەگوترێ ، هەر یەك سوورەتن ، یاخود دوو سوورەتن ؟! وەك لەم دەقە دەردەکەوێ :

﴿عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، قَالَ : قُلْتُ لِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ : مَا حَمَلَكُمْ أَنْ عَمَدْتُمْ إِلَى بَرَاءَةَ وَهِيَ مِنَ الْمِئِينَ ، وَإِلَى الأَنْفَالِ وَهِيَ مِنَ الْمَثَانِي ، فَجَعَلْتُمُوهُمَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ وَلَمْ تَكْتُبُوا بَيْنَهُمَا سَطْرَ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم) ؟ قَالَ عُثْمَانُ : كَانَ النَّبِيُّ ﷺ مِمَّا يَنْزِلُ عَلَيْهِ الآيَاتُ ، فَيَدْعُو بَعْضَ مَنْ كَانَ يَكْتُبُ لَهُ وَيَقُولُ لَهُ : (ضَعْ هَذِهِ الآيَةَ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا

---

١) چونکە لە : (١٧ رمضان ١٤٣٦)ی کۆچیی دا ، دەستم بە تەفسیرکردنی سوورەتی ئەنفال کرد ، بەرانبەر : (٤ / ٧ / ٢٠١٥)ی زایینی بوو .

وَكَذَا) ، وَتَنْزِلُ عَلَيْهِ الآيَةُ وَالآيَتَانِ فَيَقُولُ : مِثْلَ ذَلِكَ ، وَكَانَتِ الأَنْفَالُ مِنْ أَوَّلِ مَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ بِالْمَدِينَةِ ، وَكَانَتْ بَرَاءَةٌ مِنْ آخِرِ مَا نَزَلَ مِنَ الْقُرْآنِ ، وَكَانَتْ قِصَّتُهَا شَبِيهَةً بِقِصَّتِهَا ، فَظَنَنْتُ أَنَّهَا مِنْهَا ، فَمِنْ هُنَاكَ وَضَعْتُهُمَا فِي السَّبْعِ الطُّوَالِ وَلَمْ أَكْتُبْ بَيْنَهُمَا سَطْرَ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)﴾ {أَخْرَجَهُ إِبنُ أَبِي شَيْبَةَ برقم: (١٧٨٠٢)، وَأَحْمَد برقم : (٤٩٩) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٧٨٧) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٣٠٨٦) ، وَالنَّسَائِي فِي (الكُبْرَى) برقم : (٨٠٠٧) ، وَابْنُ حِبَّان برقم : (٤٣) ، وَالبَزَّار برقم : (٣٤٤) ، وقال مؤلفا : الإستيعاب ج ٢ ، ص ٢٦٤ : هَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ ، وَصَحَّحَهُ الحَاكِم ، وَوَافقهُ الذَّهَبِي ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّان وَالضياء المقدسي ، ولكن ضَعَّفَهُ كُل مِنَ الألباني وشعيب الأنؤوط} .

واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : بە عوسمانی کوڕی عەففانم گوت (کە ئەو کاتە سێیەمین جێنشین بووە، خوا لێی ڕازی بێ) چ شتێك وای لێ کردن ، سوورەتی بەرائە کە لەو سوورەتانەیە ، ژمارەی ئایەتەکانیان لە سەد ئایەت بە پشتەوەیە ، لەگەڵ سوورەتی ئەنفال ، کە لەو سوورەتانەیە ژمارەی ئایەتەکانیان لە سەد کەمترە ، پێکەوەیان بێنن ، وە لە ڕیزی سوورەتە زۆر درێژەکانیان دا دابنێن ، وە لە نێوانیشیاندا ڕستەی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) نەنووسن ؟ عوسمان گوتی : پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتی بۆ دادەبەزێنران ، ئەوانەی کە قورئانیان بۆ دەنووسی ، یەکێکیانی بانگ دەکرد ، پێی دەفەرموو: ئەو ئایەتە لە فلان سوورەتەدا دابنێ ، کە فلانو فلان شتەی تێدا باس دەکرێ ، سوورەتەکەی پێ دەناساند ، وە شوێنی ئایەتەکەشی بۆ دیاریی دەکرد ، پاشان کە ئایەتێك یان دوو ئایەتی دیکەی بۆ دادەبەزێنران ، دیسان بەو شێوەیەی دەفەرموو ، وە سوورەتی ئەنفال لەو سوورەتانە بوو ، کە لە سەرەتای چوونمان بۆ مەدینە دابەزێنرا ، وە سوورەتی بەرائە لەو قورئانەیە ، کە لە کۆتایی قۆناغی مەدینەدا دابەزێنرا ، وە نێوەڕۆکی سوورەتی تەوبەش ، وەك نێوەڕۆکی سوورەتی ئەنفالە (واتە : هەردووکیان بابەتی جەنگو جیهاد دەگرنە نێو خۆیان) منیش پێم وا بوو ، سوورەتی تەوبەش هەر درێژەی سوورەتی ئەنفالە، لێرەوە من سوورەتی ئەنفالیشم لە ڕیزی حەوت سوورەتە درێژەکان دا دانا، وە ڕستەی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)م لە نێواندا نەنووسین .

دیارە عوسمان خوا لێی ڕازی بێ ، مەبەستی ئەوەیە بۆیە ئەو دوو سوورەتەی پێکەوە داناون ، چونکە پێی وا بووە ، کە سوورەتی تەوبە هەر درێژکەرەوەی سوورەتی ئەنفالە، وە بۆیەش (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ی لە نێوان دانەناون ، تاکو ئەگەر کەسێکیش بە یەك سوورەتیان دابنێ ، بۆی بگونجێ .

هەڵبەتە هەندێك لە زانایان گوتوویانە : دانانی سوورەتی ئەنفال لەو ڕیزبەندییەدا ، واتە: لە ڕێزبەندیی هەشتەم لە موصحەف دا ، ئەوە تەوقیفییە ، بەڵام ڕەنگە عوسمان لەبیری چووبێتەوە ، مەبەستیان ئەوەیە کە ئەوە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺی فەرمووە : سوورەتی ئەنفال لەو شوێنەدا دابنێ ، بەڵام ڕەنگە عوسمان لە بیری چووبێتەوە ، وە لەوبارەوە ئەوە بە بەڵگە دێننەوە، کە جبریل هەموو ساڵان لە مانگی ڕەمەزان دا ، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەوری قورئانی کردۆتەوە .

دەڵێن : ئنجا کە دەوری قورئانی لەگەڵ کردۆتەوە ، بە ڕیز بە سوورەتەکاندا هاتوە ، دیارە ڕیزبەندییەکیان هەبووە ، وا دیارە سوورەتی ئەنفالیش لەو ڕیزبەندییەدا بووە .

**پێنجەم** : منیش دەڵێم : ئەگەر لەو ڕیزبەندییەشدا بووبێ ، دیسان ڕێگر نیە لەوەی ئەنفالو تەوبە یەك سوورەت بن ، مادام (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)یان لە نێواندا نەبێ .

**شەشەم** : ئنجا شایانی باسە : لەم سوورەتەدا ، شەش (٦) جاران ڕستەی : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، هاتوە ، وە سێ جارانیش ڕستەی ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ﴾، هاتوە .

**حەوتەم** : من بۆ باش لێ تێگەیشتنی ئەم سوورەتە ، هەڵساوم بە دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ دە (١٠) دەرس ، بەم جۆرەی خوارەوە :

**دەرسی یەکەم**: لە ئایەتی (١ تا ٤)، کە زۆربەی سوورەتەکانی قورئان پێشەکییان هەیە ، ئەم چوار ئایەتەش پێشەکییو ڕێ خۆشکردنی باسو بابەتەکانی دیکەن ،

کە لە سوورەتی ئەنفالدا هاتوون ، کە خوای پەروەردگار تێیاندا، باسی حوکمی دەستکەوتی جەنگیی دەکات ، وە پاشان ئامۆژگاریی ئیمانداران دەکات ، بەوە کە پارێزکاربن ، وە پەیوەندیی نێوانیان چاك بکەن ، وە گرفتو کێشەکانیان چارەسەر بکەن ، دوایی پێناسەی ئیمانداران دەکات ، بە چەند سیفەتێکی بنچینەییان ، کە سەرجەم پێنج (٥) سیفەتن .

**دەرسی دووەم** : لە ئایەتی (٥ تا ١٤)یە، کە خوا ﷻ لەو ئایەتانەدا ، باسی سەرەتاو چۆنیەتی دەستپێکردنی جەنگی بەدر ، وە پاشان چۆنیەتی ئەنجام دانیو سەرەنجامەکەیمان بۆ دەخاتە ڕوو .

**دەرسی سێیەم** : لە ئایەتی (١٥ تا ٢٢)، تێیدا خوای پەروەردگار فەرمان بە ئیمانداران دەکات ، خۆڕاگربن ، وە بە بیریان دێنێتەوە ، کە چۆن یارمەتی داونو بە ئیمدادی تایبەتی خۆی ، پشتی گرتوون ، وە سەری خستوون ، وە دوایی فەرمانیان پێدەکات کە وەك بێبڕوایەکان بێ گوێ نەبن ، بیستنو فەرمانبەریی کردنیان بۆ خوا ﷻ، وە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەبێ .

**دەرسی چوارەم** : لە ئایەتی (٢٣ تا ٢٩)، دیسان خوا ﷻ فەرمان بە فەرمانبەریی بۆ خۆی وە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەکات ، وە سێ جاران ڕستەی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، دووبارە بۆتەوە ، جارێکیان بۆ ئەوەیە کە دەفەرموێ : بە دەم خواو پێغەمبەری خواوە بچن ، بۆ شتێك کە پێی زیندوو دەبنەوە، وە جاری دووەم پێیان دەفەرموێ : کە پارێزگاریی بکەن لەو سپاردانەی کە پێتان دەسپێردرێنو خیانەت مەکەن ، وە جاری سێیەم پێیان دەفەرموێ : ئەگەر پارێزکاربن ، خوای بەخشەر فورقانتان پێدەبەخشێ ، واتە : بەرچاو ڕوونییو دڵ ڕوونیی ، کە حەڵاڵو حەڕامو ، چاكو خراپو ، هەقو ناهەق ، لێك جیابکەنەوە .

**دەرسی پێنجەم** : لە ئایەتی (٣٠ تا ٤٠)، کە باسی پیلانی کافرەکان دەکات لە مەککە ، کە پیلانیان گێڕاوە بۆ ڕووبەڕوونەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە سێ بژاردەیان بوو ون : یان بیگرن ، یان بیکوژن ، یان دەری بکەن ، وە سەرەنجام بژاردەی سێیەم هەڵدەبژێرن ، وەك دوایی بە تەفصیلْ باسی دەکەین ، وە دوایش خوا باسی

هەڵوێستی نەرێنیی‌و خراپی کافرەکان دەکات ، لە بەرانبەری قورئاندا ، وە لە بەرانبەر پێغەمبەری خوادا ﷺ، وە باس دەکات کە چۆن سەروەت‌و سامانیان کۆکردۆتەوە ، بۆ دژایەتییکردنی مسوڵمانان ، کە دیارە زیاتر مەبەست پێ ئەو سەروەت‌و سامانەیە کە کۆیان دەکردەوە ، بۆ ئەنجام دانی ئەو جەنگەی ، کە دوایی ناوی لێنرا : جەنگی بەدر، وە دەشگونجێ مەبەست پێی جەنگی ئوحود بێ .

**دەرسی شەشەم** : لە ئایەتی (٤١ تا ٤٤)، کە خوا تێیاندا باسی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگیی دەکات ، وە باسی ئەوە دەکات کە دەستی قودرەت‌و حیکمەتی خوا ، زۆر جوان بەرجەستە بوو لەو جەنگەدا ، کە چۆن ئەو دوو هێزەی لە ڕاست یەك ڕاهێنان ، وە سەرەنجام ئەو جەنگە لە بەرژەوەندیی مسوڵمانان تەواو بوو .

**دەرسی حەوتەم** : لە ئایەتی (٤٥ تا ٥٤)، خوای پەروەردگار باسی فەرمان کردن بە خۆڕاگریی دەکات ، وە پاشان حەوت لە ئەدەبە گەورەو گرنگەکانی جەنگ‌و جیهاد فێری مسوڵمانان دەکات ، وە سەرەنجامی شوومی کافرەکانیش دەخاتەڕوو .

**دەرسی هەشتەم**: لە ئایەتی (٥٥ تا ٦٣)، خوای پەروەردگار باسی خراپیی بێبڕوایەکان دەکات ، کە لە هەموو ژیاندارێك خراپترن ، لە هەموو پێڕۆیەك‌و ئاژەڵێك خراپترن ، وە پاشان فەرمان بە ئیمانداران دەکات کە پابەندبن بە پەیمانەکانیانەوە ، وە کەسێك ئەگەر مەترسییان لێی هەبوو کە خیانەت‌و پەیمان شکێنیی بکات ، ئاگاداری بکەنەوە کە پەیمانیان لە نێواندا نەماوە ، وە دوایی فەرمانیان پێدەکات بە ئامادەکردنی هێز ، بۆ ئەوەی کە دوژمنانی خواو خۆیانی پێ بترسێنن ، وە دوایی فەرمانیان پێدەکات کە هەر کاتێك بەرانبەرەکانیان ، ملیاندا بۆ ئاشتیی‌و تەبایی ، ئەوانیش دەستپێشخەریی بکەن ، وە پشتیش بە خوا ببەستن ، وە مەترسیی ئەوەیان نەبێ ، کە لە پەنای ئاشتیی دا فێڵیان لێ بکرێ .

**دەرسی نۆیەم** : لە ئایەتی (٦٤ تا ٧١)، لەم هەشت ئایەتەدا خوای بە بەزەیی سێ جاران پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بە : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، دەدوێنێ ،

جاری یەکەم پێی دەفەرموێ : کە خوا بۆ تۆو بۆ ئیماندارانێك کە شوێنت کەوتوون ، بەسە ، کە پشتیوانتان بێ ، جاری دووەم پێی دەفەرموێ : کە ئیمانداران هانبدات بۆ فیداکاریی‌و جەنگ لە پێناوی ئیسلامدا، وە جاری سێیەم پێی دەفەرموێ : بەو دیلانەی کە لە لاتانن‌و فیدیەو قەرەبوویان لێ وەرگیراوە بڵێ : ئەگەر بێت‌و خوا چاکەو نیازو مەبەستی باشتان لە دڵ دا بزانێ ، باشتر لەو قەرەبووەی کە لێتان وەرگیراوە ، پێتان دەبەخشێ ، وە لێشتان دەبووریٚ.

**دەرسی دەیەم‌و کۆتایی** : لە ئایەتی (٧٢ تا ٧٥)ە، خوای پەروەردگار لەم چوار ئایەتەدا باسی یەك بابەتی زۆر گەورەو گرنگ دەکات ، ئەویش بریتیە لە پەیوەندیی پێکهاتەکانی مسوڵمانان ، مسوڵمانانی کۆچکەر، مسوڵمانانی پشتیوانان ، مسوڵمانانێك کە لە دەرەوەی قەوارەی ئیسلامیی دا دەژیان ، وە مسوڵمانانێك کە دوای مسوڵمان بوونیان کۆچیان کردووەو بە قەوارەی ئیسلامییەوە پەیوەست بوون ، دەبێ پەیوەندییان لەنێو خۆیان دا چۆن بێ ؟ وە پەیوەندییان لەگەڵ ئەهلی کوفردا چۆن بێ ؟ وە هەروەها پەیوەندیی ئەهلی کوفر پێکەوە چۆنە ؟ ئەمە بابەتی سەرەکیی ئەم چوار ئایەتەیە .

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم سوورەتە تایبەتە بە جەنگی بەدرەوە ، وە بەگشتیش زۆر باسی جەنگ‌و جیهادی تێدایە ، بە باشم زانی بەر لەوەی بچینە سەر تەفسیرکردنی ئایەتەکان ، دوو بابەت بکەینە ڕێ خۆشکەر :

## بابەتی یەکەم :

# کورتە باسێک لە بارەی جیهاد و جەنگەوە لە ئیسلام دا(١)

جێی داخو خەفەتە کە لەم ڕۆژگارەدا گرووپە پەڕگیرەکان ، گەلێك هەڵەو پەڵەو لادانو تاوان لەژێر پەردەی جیهاد لەڕێی خوا (الجِهَاد فِي سَبيل اللّه)دا دەکەنو ، سەرەنجام لەلای خەڵكێكی زۆری سادەو سەرکێڵ ، یان نا ئاشنا بە ئیسلام ، خودی ئیسلام دەکەوێتە ژێر نیشانەی پرسیارەوە ، چونکە وادەزانن کە ئەوەی ئەو گرووپو ڕێکخراوە پەڕگیرو لادەرانە ، بەناوی (جیهاد لەڕێی خوادا) ئەنجامی دەدەن ، لە شەریعەتدا ڕێی پێدراوەو ڕەوایە !

بۆیە بە پێویستم زانی لەم بابەتەدا تیشكێك بخەمە سەر جەنگو جیهاد ، لە ئیسلامدا ، وەك خوای کاربەجێو پێغەمبەری داناو زانامان موحەممەد ﷺ باسیان کردوە ، لە قورئانو سوننەتدا .

ئەویش لە حەوت بڕگەدا ، کە ئەمانە ناوونیشانەکانیانن :

---

١) ئەم کورتە باسەم لە کتێبی : (هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی پەڕگیریی) وەرگرتوە بە ناوونیشانی : (نابێ بە هەڵە ئەنجامدانی جیهاد ، جیهادمان لەبەرچاو بخات !)
بۆ نووسینی ئەو باسەش تا ڕاددەیەك سوودم لە (فقه الجهاد)ی د . یوسف القرضاوی وەرگرتوە .

١/ چەمك و واتـای (جهاد) و(قتـال) له ئیسلامدا .

٢/ هەرکام له تێپەڕاندن (إفْراط)و بەزایەدان (تَفْرِيط) لەبارەی جیهادەوە هەڵەن .

٣/ پێگەی جەنگو جیهـاد لە ئیسلامداو ، پاداشـتی جەنگاوەران و موجاهیـدان .

٤/ ئامانجەکانی جیهـادو جـەنگ لـەڕێی خـوادا .

٥/ حوکمی جیهـادو جـەنگ .

٦/ جیهـادو جـەنگ ئامرازن ، نەك ئامانج .

٧/ ڕەوشـتەكانی جیهـادو جـەنگ .

## ١/ چـەمك و واتـای ( جهاد ) و ( قـتـال ) له ئیسـلامدا :

زۆر کـەس پێی وایـە هـەردووك وشـەی (جهـاد) و (قتـال) یـەك چـەمكو واتایـان هـەیە ، بـەڵام بێگومـان ئەمـە ڕاسـت نیـە ، هەرچـەندە هەنـدێك جـاران وەك زاراوەی شـەرعیی لە جیـاتی یەكدی بەكارهێنـراون :

أ / (الجهـاد) : وشـەی (جهـاد) وشـەیەکی عەرەبییـەو لـە بنەڕەتـدا لـە (جَهَدَ يَجْهَدُ جَهْدًا)ەوە هـاتوە ، کە بـە مانـای : (جَدَّ و بالغ) دێ ، یـانی : کارەكەی بـە عەزمـەوە کـردو توانـای خـۆی تێـدا بەکارهێنـا ، وە چاوگی (جَهَدَ)ە ، (جَهْد) و (جُهد)ە ، کـە هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە : یـەك واتایـان هەیـە ، بـەڵام زۆربـەیان گوتوویانـە (جَهْد) بـە مانـای ئەوپـەڕ (الغایـة)ەو ، (جُهْد)یـش بـە مانـای وزەو توانـا (الوُسْع والطـاقة)یە ، وشـەی (جهاد)یش چاوگـەو لـە (جاهَدَ يُجاهِدُ جِهَاداً وَمُجَاهَدَةً)ەوە هاتـوە .

ئنجـا (جَاهَدَ) یـانی : توانـاو هێـزی خـۆی لە بـەرگرییو زاڵبـوونـدا بەكارهێنـا (بَذَلَ وسْعَهُ في المدافعة والمغالبة)[1].

١) بڕوانـە : معجم ألفاظ القرآن الكريم ، ج ١ ، ص ٢٢٦.

وە (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی : (الجهَادُ والـمُجَاهَدَةُ : إِستِفْرَاغ الوسع في مُدَافَعَةِ العَـدو) یـانی : (جِهَـاد ومُجَاهَـدَة) بـە مانـای بەکارهێنـانی ئەوپـەڕی توانـایـە ، لە بەرگریی کردن لە بەرانبـەر دوژمنـدا .

ب / (القتـال) : وشـەی (قتـال) کـە لـە (قاتَلَ ، يقاتِلُ ، قِتَـالاً ، وَمُقَاتَلَة)ەوە هـاتووە ، ئەویش لە (قَتَل ، يَقْتُل ، قَتـلاً)ەوە هـاتوە ، یەك مانای ڕوونـی هەیە ، کە بریتیە لـە یەکدی کوشـتن ، یان هەوڵـدان بۆ یەکدی کوشتنی دوو لایـەن ، یـان زیـاتر ، کـە بـە کـوردیی (جـەنگ)و (شـەڕ)ی پێدەگـوترێ .

کەواتە : وشـەی (جهاد) چەمكو واتایەکەی لە هی (قتـال) فراوانتـرە ، وە ئەگـەر سـەرنجی قورئـانو سـوننەتیش بدەین ، هـەروای دەبینینو ، وشـەی (جهاد) بـۆ هـەر کـام لـە :

یـەك : کـار لەسـەر نەفسی خۆکـردن بۆ پاکسازیی‌و چاکسازیی تێدا کردنی .

دوو : بانگـەوازو خـەباتی فیکریـی‌و ڕاگـەیاندن بـۆ گـەیاندنی پـەیامی ئیسـلامو بەرپەرچ دانەوەی ناحـەزانی .

سـێ : سـەرو ماڵ بەخشـین لە ڕێـی خـوادا .

بەکارهـاتوە ، باسـەرنجی ئەو ئایـەتو فـەرمووودانە بدەیـن :

١- ﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ ﴿٧٨﴾ الحـج .

٢- ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَجَٰهِدۡهُم بِهِۦ جِهَادٗا كَبِيرٗا ﴿٥٢﴾ ﴾ الفرقـان .

٣- ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٤١﴾ ﴾ التـوبـة .

٤- (وَالْمُجَـاهِدُ مَنْ جَـاهَدَ نَفْسَـهُ فِي طَـاعَـةِ اللَّهِ)[1].

١) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم : (٢٤٠٠٤) ، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم : (٤٨٦٢) ، وَالطَّبَرَانِـيّ ، بـرقم : (٧٩٦) ، وَالحَاكِمُ برقم : (٢٤)، وَالبَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان) برقم : (١١١٢٣).

٥- (جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ)(١).

وەك دەبینین چەمكو واتای وشەی (جهاد) لە هی (قتال) فراوانترە ، بەلاّم بێگومان ئەوە لە كاتێكدایە ، كە وشەی (جهاد) لەئایەتە مەدینەییەكاندا هاتبێ ، ئەو كاتە هەموو جۆرە خەباتو تێكۆشانێك دەگرێتەوە : جیهادی نەفسو ئارەزووەكانیو شەیتان ، وە جیهادی بانگەوازو خەباتی فیكرییو ئیعلامیی ، وە جیهادی سەرومالّ فیداكردن .

ئەگەرنا وشەی (جهاد) لە ئایەتە مەككەییەكاندا ، بە مانای جەنگو سەرو مالّ فیداكردن (كە لە قۆناغی مەدینەدا فەرز بووە) نەهاتوە .

شایانی باسیشە كە دواتر لە قۆناغی مەدینەدا ، وشەی (جهاد) بە مانای جەنگو بەخشینی سامانو گیان لە ڕێی خوادا بەكارهات ، چەمكو واتا مەدینەییەكەی بەسەر چەمكو واتا مەككەییەكەیدا زالّبووو ، داپۆشی ، بۆیە ئێستا زۆر كەس هەردووك وشەی (جهاد)و (قتال) هەر بە مانای جەنگو فیداكاریی بە سەرو مالّ لە ڕێی خوادا ، بەكار دێنێ ، بۆیەش ئێمە زۆرجار هەردووك وشەكە بەكار دێنیین .

پێویستە بشزانرێ كە لە سوورەتە مەدینەییەكاندا ، مەگەر چۆن دەنا وشەی (جهاد) هەر بە مانای جەنگ (قتال)و بەخشینی گیانو سامان هاتوە .

ئنجا ئەگەر بمانەوێ پێناسەیەكی پوختی وشەی (جهاد) بكەین ، دەبێ بلّێین : (**جیهاد** : بریتییە لە بەكارهێنانی ئەوپەڕی وزەو توانا ، لە نیازو مەبەستی دلّو قسەو دەربڕینی زمانو ، كردەوەی ئەندامەكانو ، بەخشینی مالّو سامانو ، فیداكردنی گیان ، لە پێناوی خواو بەرز ڕاگرتنی ناویو ، بەرجەستەكردنی ئایینو بەرنامەكەیدا لە واقیعی ژیاندا) .

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (١٢٢٦٨) ، وَالدَّارِمِيُّ برقم : (٢٤٣١) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٢٥٠٤) ، وَالنَّسَائِيُّ برقم : (٣٠٩٦) ، وَأَبُو يَعْلَى برقم : (٣٨٧٥) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٤٧٠٨) ، وَالحَاكِمُ برقم : (٢٤٢٧) وَقَالَ : صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

## ٢/ هەرکام لە تێپەڕاندن ( إِفراط ) و بەزایەدان ( تفریط ) لەبارەی جیهادەوە ، هەڵەن :

لەم ڕۆژگارەماندا لەنێو مسولّمـاناندا ، لەبـارەی جەنگو جیهادەوە ، سێ جۆرە بیروڕا هەن :

أ - ڕایەکی تێپەڕێنەر (مُفْرِط) : کە پێیوایە لەسەر مسولّمانان فەرزە ئیعلانی جەنگو جیهاد بکەن بەرانبەر هەموو دنیا !

ب - ڕایەکی کورتهێنەر (مُفَرِّط) : کە پێیوایە کە جەنگو جیهاد لە ئیسلامدا بۆتە بەشێك لە کەلەپوورو مێژووو ، نابێ ئێستا هەر باسیش بکرێ ، چ جای مومارەسە بکرێ !

کە بێگومان ئەو دوو ڕایە ، تا ڕاددەیەکی زۆر وەك کارو کاردانەوە (فعل و رد الفعل) لەژێر کاریگەریی یەکدی دان .

جـ - ڕایەکی میانجیی (وسَطْ) : کە دەڵێ : پێویستە جەنگو جیهاد دوور لە کاردانەوەو عاتیفە بۆی بڕوانینو ، ئەوکاتەش دەزانین کە ئیسلام نە فەرمان بە مسولّمانان دەکات ، کە دژی هەموو دنیا جیهاد ڕابگەیەننو ، وە نە پێشیان دەڵێ : لەم دنیایەدا پاساوی جەنگو جیهاد نەماوەو ، نابێ جیهاد دژی هیچ کەس بکرێ ، تەنانەت ڕژێمی زایۆنییو ، ئەو ڕژێمانەش کە بە ئاشکرا لە وڵاتانی مسولّماناندا بانگەشەی کوفرو ئیلحاد دەکەنو ، دژایەتیی ئیسلامو مسولّمانان دەکەن !

بەڵکو بە سەرنجدانی قورئانو سوننەت ، دڵنیا دەبین کە جەنگو جیهاد لە ئیسلامدا (هەتا مسولّمانان ستەمیان لەسەربێ ، وە بشتوانن بەرگریی بکەن) هەر بەردەوامەو بەڵگەو نیشانەی زیندوێتیی مسولّمانانیشە ، بەڵام پێویستە لێزانانەو دووربینانەو وردبینانەو لەکاتو شوێنی خۆیداو ، لەلایەن کەسانی پسپۆڕو شارەزا لە دینو ژیندا ، بڕیاری لەسەر بدرێو بکرێ ، نەك بە هەڵەشەییو بەبێ بەرچاو ڕوونییو ، بە شێوەیەکی سەرکێڵانەو دلگەرمانەو کەس بە کەسیی ، وەك بەداخەوە لەم ڕۆژگارەماندا بە زۆریی هەروابووە ، بۆیەش مەگەر چۆن دەنا مسولّمانان هەر لەسەری قەرزداربوونەوەو ، کارەکە بنەتۆوی خۆی نەکردۆتەوە ، لە بڕگەی سێیەمیشدا تیشکی زیاتر دەخەینە گرنگییو پێویستیی جەنگو جیهاد .

## ٣ / پێگەی جەنگو جیهاد لە ئیسلامداو پاداشتی جەنگاوەران و موجاهیدان :

ئایەتو فەرموودە لەبارەی پلەوپایەو پێگەی جیهادەوە زۆر زۆرن ، بەڵام ئێمە تەنیا وەك نموونە هەندێکیان لێ باس دەکەین :

١) ﴿ لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةًۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةًۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ ﴾ النساء .

واتە : بڕواداڕانی دانیشتووی بێ مەزەڕەت ، لەگەڵ تێکۆشەران لەڕێی خوادا بە سامانو گیانیان ، یەکسان نین ، خوا تێکۆشەران بە سامانو گیانیانی بەسەر دانیشتوواندا بە پلەیەك بەرز کردۆتەوە ، وە خوا گفتی باشی بە هەموویان داوە ، بەڵام خوا بە پاداشتێکی مەزن موجاهیدانی بەسەر دانیشتوواندا بەرز کردۆتەوە ، چەندان پلە لە خواوە ، وە لێبوردنو بەزەییەکی تایبەت ، وە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە .

٢) ﴿ أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ التوبة .

واتـە : ئایا (هەڵسـان بە) ئاودان بە حاجییانو خزمـەتی مزگـەوتی حەرامتـان ، وەك (کـاری) ئـەو کەسـە دانـا ، کە بـڕوای بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هێنـاوەو لەڕێی خوادا جیهادی کردوە ؟ لەلای خوا یەکسان نین ، وە خوا ڕێڕوونیی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات ، ئەوانەی بڕوایان هێنـاوەو ، کۆچیان کـردوەو جیهادیـان لـەڕێی خـوا بـە سـامانو گیانیـان کـردوە ، پلـەیان لـەلای خـوا مەزنتـرە ، وە هـەر ئەوانـە سـەرفرازن ، پـەروەردگاریان مـوژدەی بـەزەییو ڕەزامەنـدیی خۆییـان پێـدەدا ، هەروەها چـەند بەهەشـتێك کە نـازو نیعمـەتێکی بـەردەوامیان تێیانـدا هەیـە ، بـە هەمیشـەیی تێیاندا دەمێننەوە ، بەڕاستی خوا پاداشتی مەزنی لەلایـە .

٣) ﴿أَلا أُخْبِرُكم بِرَأْسِ الأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَ ذِرْوَةِ سَنَامِهِ ؟ رَأْسُ الأَمْـرِ الإِسلام ، وَعَمُـودُهُ الصَّلاةُ ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ﴾[1] .

واتـە : ئایـە هەواڵـتان پێبـدەم بـە سـەری ئـایینو کۆڵەکەکـەیو لووتکەکـەی ؟ سـەری ئایین ملکەچییـە (بۆ خوا) ، وە کۆڵـەکەکەی نوێژە ، وە لووتکـە بەرزەکـەی جیهـاد لە ڕێـی خوادایـە .

٤) ﴿عَـنْ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ مَسْـعُودٍ ، قَـالَ : سـألْتُ رَسـولَ اللهِ ﷺ أَيُّ الْعَمَـلِ أَفْضَـلُ ؟ قَالَ : (الصَّـلاةُ لِوَقْتِهَا) ، قَالَ : قُلْتُ ثُمَّ أَيّ ؟ قَـالَ : (بِـرُّ الْوَالِدَيْنِ) ، قَـالَ : قُلْتُ ثُمَّ أيّ ؟ قَالَ : (الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)﴾[2] .

واتە : لە پێغەمبەری خوام ﷺ پرسی : چ کردەوەیەك باشتـرە ؟ فەرمووی : نوێـژ لە کاتەکانی خۆیـدا ، گوتـم : ئـەدی دوای ئـەوە کامـە ؟ فـەرمووی : چاکە لەگەڵ بابو دایك دا ، گوتـم : ئەدی دوای ئەمە کامە ؟ فەرمووی : جیهـاد لە ڕێی خـوادا .

٥) ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، قَالَ قِيلَ : يَا رَسولَ اللهِ ﷺ أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَفْضَلُ؟ قَالَ : مُؤْمِنٌ مُجَاهِدٌ فِي سَبِيلِ اللهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ)[1] .

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم : (٢٢٠٦٩)، وَالتّرمِـذِيُّ بـرقم:(٢٦١٦) ، وَقَـالَ : حَسَنٌ صَـحِيح ، وَابْنُ مَاجَـهْ برقم : (٣٩٧٣) ، وَالحَـاكِمُ بـرقم : (٣٥٤٨) ، وَقَـالَ : صَحِيح عَلَـى شَرْطِ الشَّـيْخَين ، وَالبَيْهَقِي فـي (شعب الإيمان) برقم : (٤٢٢٥) .

٢) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ ، برقم : (٥٠٤) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (٢٦٢) وغيرهما.

واتـە : گـوترا : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! چ کەسـێك لـەنێو خـەڵك دا باشـترە ؟ فـەرمووی : بڕوادارێکی موجاهید بە گیانو سامانی لە پێناوی خـوادا .

هەڵبـەتە هەر لەبەر تیشکی ئـەو ئایـەتو فەرموودانەشـدا بـووە ، کە زۆربـەی هـەرەزۆری زانایـان گوتوویـانە : پـاش فـەرزە تایبەتییـەکان (الفـرائض العينيـة) جـەنگو جیهـاد لـە ڕێـی خـوادا ، چاکتـرینو گـەورەترین جـۆری تاعەتـە : بـۆ نموونە : (أحمد بن حنبل) گوتـوویەتی : (لا أعلم شيئاً من العَمل بعدِ الفرائض أفضل من الجهاد) بڕوانـە : (المغنـي ، ج ١٣ ، ص١٠) .

## ٤ / ئامانجەکانی جیهـادو جـەنگ لـە ڕێـی خـوادا :

ئیسلام پێنج ئامانجی سەرەکیی دیاریی کردوون ، بـۆ ئەنجامـدانی جـەنگو جیهادو ، جگە لەو پێنج ئامانجە ، دروست نیـە مسـوڵمانان بـۆ هـیچ ئامـانجو مەبەسـتێکی دیکە ، پەنـا بۆ چـەكو هێـز ببـەن :

<u>یـــەك : بەرپەرچـــدانەوەی دەسـتدرێژیـــی</u> : هەرکـات دەستدرێـژیـی کرایـە سـەر مسـوڵمانـان ، لـە ڕووی ئاییــن ، یـان لـە ڕووی ژیانیانـەوە ، نـەك هـەر بۆیـان هەیـە ، بگرە لەسـەریشـیان پێویستە کە بەرپەرچی بدەنەوەو ، لە بەرانبەریدا دەستەو ئـەژنۆ دانەنیشـن ، وەك خـوای دادگـەر فەرموویـەتی :

١) ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾ البقـرة .

واتـــە : وە لـــەڕێی خـــوادا دژی ئەوانـــە بجـــەنگن ، کـــە لـــەدژتان دەجـــەنگن ، وەدەستدرێـژیی مەکـەن ، بێگومان خوا دەسـتدرێژکارانی خۆشـناوێـن .

٢) ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩٤ ﴾ البقـرة .

---

١) أَخْرَجَهُ ، إِبْنُ أَبي شَيْبَة ، برقم : (١٩٨٣٦) ، وَالبُخَارِيُّ ، برقم : (٢٧٨٦) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٨٨٨).

واتـە : ئنجا هەر کەس دەستدرێژیی کردنە سـەر ، وەك دەستدریێژییەکـەی خـۆی دەسـتدرێژیی بکەنـەوە سـەر (بەرپەرچـی بدەنــەوە) وە پـارێــز لـە خــوا بکــەن‌و ، بزانـن کە خوا لەگـەڵ پارێزکاران دایـە .

**دوو : دەســـتەبەرکردنی ئـازادیی بانگـــەواز** : وەك خـوای کاربـەجێ ، فەرموویـەتی :

﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩٣﴾البقـرة .

واتـــە : وە لـە دژیـــان بجـــەنگن ، هەتـــا ئـــازارو ئەشکەنجـــەدان (ی کـــافران بـــۆ بـــڕواداران) نامێنــێ ، وە ملکـەچیی تەنیـا بۆ خـوا دەبـێ ، ئنجا هەرکــات وازیـــان هێنـــا (لـە سـزادان‌و ئـازاردانی بـڕواداران بـۆ هەڵگێـڕانەوەیـان لـە ئیسـلام) ئـەوە دەســتدرێژیی (واتـە : بەکارهێنـانی هێـز) تەنیـا بۆ سـەر ستەمکارانە .

یانی : ئیسـلام ڕێ نـادات بـە بـەکارهێنانی هێـزو جـەنگ کـردن ، مەگـەر دژی ئـەو سـتەمکارانەی کـە ڕێی دینــداریی ئـازادانـە لە خـەڵك دەگـرن .

کەواتـە : قـەوارەی ئیسلامیی (ئەگـەر بتوانـێ) دەبـێ ڕێ نەدات هیچ قەوارەیــەکی سیاسـیی ، ڕێی بڕواهێنـــان‌و هاتنە نێو ئیسـلام لە خەڵـك بگــرێ ، کە ئـەوە مانـــای (فتـنـة)یە ، بـەڵام بـە مەرجێــك ئـەو قـــەوارە سیاســییە ، هـاوپەیمـان نەبـێ لەگـەڵ دەوڵەتی ئیسـلامییدا ، چونکە لەو حاڵەتەدا دروست نیـە پـەیمان بشـکێنــێ‌و ، پشـتی ئـەو بــڕوادارە ئــازاردراوو ڕێــی دینــداریی لێگیـــراونە بگـرێ ، وەك خــوای دادگــەر فەرموویـــــەتی : ﴿وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٧٢﴾الأنفـال .

واتـە : وە هـەرکــات بـــڕواداران داوای کۆمەکییـــان لێتـان کـرد ، کـە لەســەر ئـایین ستەمیان لێدەکـرا ، ئەوە پێویستە پشـتیان بگـرن ، مەگـەر دژی کۆمـەڵێك کـە لـەنێوان ئێوەو ئـەواندا پەیمان هـەبێ .

دیـاره لـەم ڕۆژگارەشـدا بـەهۆی بـەرەو پێشـچوونی تـەکنۆلۆژیای ڕاگـەیاندنەوە ، تاڕاددەیـەکی زۆر کێشـەو گرفتـی گـەیاندنی پـەیامی خـوا بـە جیهانییـان چارەسـەر کـراوەو ، ئێسـتا بـۆ خەڵـك شـارەزا کـردن لـە ئیسـلام ، هیـچ پـەك لەسـەر سـوپای ئیسـلام ، نەکـەوتوە ، بـۆ لابردنـی کۆسـپو لەمپـەرەکانی سـەر ڕێـی بانگـەواز (إزالـة العقبـات عـن طريـق الدعـوة) ، تـەنیا مەسـەلەی بـەرگریی کـردن لـە بڕوادارانـی چەوسـێنراوە ، لـە لایـەن ڕژێمـە کـافرو چەوسـێنەرەکانەوە ماوەتـەوە ، ئـەویش بـە مەرجی نەبوونی پەیمان لە نێـوان دەوڵـەتی ئیسـلامیی‌و ئـەو قـەوارە ستەمکارەدا ، کـە پـێم وایـە بەشـداربوون لـە ڕێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتووەکـان (منظمـة الأمـم المتحدة)دا لـەم ڕۆژگارەدا ئەو پەیمانـە دەگـەیەنێ !

**سـێ : دەربـازکردنی چەوسـاوان لـە چـنگی سـتەمکاران** : وەك خـوای زانـاو توانـا فەرموویـەتی :﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾النسـاء .

واتە : ئـەوە چیتـانە ! لەپێناوی خواو (دەربازکردنی) چەوسێنراواندا ناجەنگن ، لـە پیـاوان‌و ئافرەتـان‌و منـداڵان ، ئەوانـەی دەڵـێن : پـەروەردگارمان ! لـەم ئاوەدانییـە قوتارمان بکە ، کە خەڵکەکەی ستەمکارن ، وە لە لایەن خۆتەوە سـەرپەرشـتیکارێکمان بۆ بڕەخسـێنە ، وەلە لایـەن خۆتـەوە پشـتیوانێکمان بۆ بنێـرە .

بـە سـەرنجدانی ئایەتەکـەش بـە ڕوونیـی دیـارە ، کـە ئـەو چەوسـێنراوەو بێچـارەوە دەرەتانانـە ، مسـوڵمان بـن یـان نامسـوڵمـان ، هـەر پێویسـتە دەوڵـەتی ئیسـلامیی هـەوڵـی ڕزگـارکردن‌و دەرهێنانیـان لەژێـر نیـری سـتەمکاران بـدات ، بـەڵام دیـارە ئەگەر لە توانـایدا هەبێ‌و ، هیچ پەرچ (مانع)ێك لەبەردەمیـدا نـەبێ ، چونکـە ئـەو کاتـە : ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقـرة .

**چوار : تەمبێکردنی پەیمان شکێنان** : وەك خوای بالا دەستو توانا فەرموویەتی : ﴿ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ٥٦ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٥٧﴾ الأنفال .

واتە : ئەوانەی پەیمانت لەگەڵ بەستوون ، دوایی هەموو جارێ پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێننەوەو پارێز ناکەن (لە شکاندنی پەیمان) ئنجا هەرکات لە جەنگدا بەرپەلت کەوتن (زەبری وایان لێ بدە) ئەوانەی لە پشتیشیانەوەن پرژو بڵاویان بکە ، بەڵکو پەند وەرگرن .

هەڵبەتە هەر لێرەشەوە لەو سزادانەی پێغەمبەر ﷺ بۆ هۆزی (بنو قريظة)ی جوولەکە تێدەگەین ، وەك لەم دەقەی سوننەتەوە دیارە :

﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ يَهُودَ بَنِي النَّضِيرِ وَقُرَيْظَةَ حَارَبُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَجْلَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَنِي النَّضِيرِ وَأَقَرَّ قُرَيْظَةَ وَمَنَّ عَلَيْهِمْ حَتَّى حَارَبَتْ قُرَيْظَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ، فَقَتَلَ رِجَالَهُمْ ، وَقَسَمَ نِسَاءَهُمْ وَأَوْلاَدَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ ، إِلاَّ بَعْضَهُمْ لَحِقُوا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَّنَهُمْ وَأَسْلَمُوا﴾[1] .

واتە : هەردووك هۆزی جوولەکەی (بني النَّضير وقريظة) جەنگیان لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ (بني النَّضير)ی دەرکرد ، وە چاکەی لەگەڵ (بني قريظة)دا کردو هێشتنیەوە ، هەتا دوایی جارێکی دیکە (قريظة) جەنگیان (لە دژی ئیسلام) کرد ، ئیدی ئەویش پیاوەکانیانی کوشتنو ، ئافرەتو منداڵەکانو ماڵو سامانیشیانی بەسەر مسوڵماناندا دابەش کرد ، جگە لە هەندێکیان کە چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش پەنایدان ، وە مسوڵمان بوون .

کەواتە : ئەو سزادانەی پێغەمبەر ﷺ بۆ هۆزی (بني قريظة)ی جوولەکە ، لەسەر ئەوە بووە کە دوو جاران پەیمانیان شکاندووە ، لە پشتەوە خەنجەری

---

١) أَخْرَجَهُ بُخاري ، برقم : (٣٨٠٤) ، و أبو داود ، برقم : (٣٠٠٥)، وغيرهما.

غەدریـان لـە مسـوڵمانان داوەو ، بـە زاراوەی سیاسـیی ئـەمڕۆ : خیـانەتی مـەزن (الخيانة العظمى)یان لـێ دەرکەوتـوەو ، سـزای ئـەوەش مەرگە !

**پێنج : جێگیرکردنی ئاشتیی نێوخۆیی :** دیارە ئەمجۆرە جەنگە دژی نامسوڵمانان نیـە ، بەڵـکو لـەنێو بازنـەی ئـەهلی ئیسـلامدایەو ، ئامـانج لێـی کۆتـایی پێهێنـانی ناکۆکـیی‌و شـەڕی نێوانیانـە ، وەك خـوا ﷻ فـەرموویەتی : ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجرات .

واتـە : وە هەرکـات دوو کۆمـەڵ لـە بـڕواداران پێکـەوە جەنگـیان کـرد ، ئێـوە صـوڵحیان لەنێوان دا بکەن ، ئنجا ئەگەر یەکیان سـتەمی لەوی دیکـە کـرد ، لـە دژی ئەوەیان بجەنگن کە ستەم دەکات ، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ژێر فەرمانی خوا ، ئنجا هـەر کات گـەڕایەوە ، ئەوە دادگـەرانە صـوڵحیان لە نێوان بکـەن ، وە دادگـەر بـن ، بێگـومان خوا دادگـەرانی خۆشـدەوێ .

وە پێغەمبـەری خـواش ﷺ لەوبـارەوە فەرموویـەتی : ﴿(أنْصُـرْ أخَـاكَ ظَالِمـًا أوْ مَظْلُومـًا) ، قِيـلَ : يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ نَصَـرْتُهُ مَظْلُـومَاً ؟ فَكَيْـفَ أنْصُرُهُ ظَالِمـًا ، قَـالَ : (تَمْنَعُـهُ مِنَ الظُّلْـمِ فَذَلِكَ نَصْرُكَ إيَّـاهُ)﴾[1] .

واتـە : برایەکـەت سـەربخـە سـتەمکـار بـێ ، یـان سـتەملێکـراو ، گوتیـان : ئـەی پێغەمبەری خوا ئەگەر سـتەملێکراو بێ سـەری دەخەین ، بەڵام ئەگـەر سـتەمکار بـێ چۆن سـەری بخەین ؟! فەرمووی : مەهێڵە ستەم بکات ، ئەوە مانای سـەرخسـتنیەتی .

بەڵـێ : ئـەو پێنجە ئامانجەکانی جـەنگ‌و جیهـادن لـە ڕێـی خـوادا لـە شـەریعەتی ئیسلامدا ، کە بێگومان هیـچ خـاوەن عەقڵـێکی بـە ویـژدان (عاقل مُنْصِف) ناتوانـێ ڕەخنـە لـە هیچ کامیـان بگـرێ‌و ، بڵـێ : نەدەبوایـە ببـێ !

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ ، برقم : (٢٥٨٤) ، وغيره .

ماوەتــەوە بڵێـین :

جـەنگو جیهاد لـە ئیسـلام لـە ئەسڵدا ئـەرکی قـەوارەو دەوڵەتـەو ، دروست نیـە هەرکـەسو لایـەنو گرووپێك ڕاسـتـبۆوە ، بڕیـاری لەسـەر بـداتو پێـی هەڵسـێ ، بـەڵام بێگومـان کاتێـك مسـوڵمانان دەوڵـەتو قـەوارەی سیاسییان نابـێ ، مانـای وانیـە جـەنگو جیهاد کۆتـایی پـێدێ ، بەڵـکو هـەر دەمێنـێ ، بـەڵام بێگومـان بـۆ بڕیـار لەسـەردانیو نەخشـە بـۆ کێشـانیو ئەنجامـدانی ، پێویسـتە مشـوورخۆرو چاوسـاغو قسـە بەدەسـتانی مسـوڵمانان (لـەو شـوێنەدا) پـاش لێکـۆڵینـەوەی وردو قـووڵو تێفکـرینو ڕاوێـژ ، ئەوجـار دەسـتبەکـار بـن .

پێغەمبـەری خـواش ﷺ لـەبارەی بـەردەوامیی جـەنگو جیهـادەوە ، لەنێـو ئۆممەتـدا ، فەرموویـەتی : ﴿لَـنْ يَبْـرَحَ هَـذَا الـدِّينُ قَائِمـاً يُقَاتِـلُ عَلَيْـهِ عِصَابَةٌ مِـنَ الْمُسْلِمِينَ ، حَتَّـى تَقُومَ السـاعَةُ﴾[١].

واتـە : بـەردەوام ئـەم ئایینـە ڕاوەسـتاو دەبـێ هەتـا قیـامەت دێ ، کۆمەڵێـك لـە مسوڵمانـان لەسـەری دەجـەنگـن .

## ٥ / حـوکمـی جیـهـادو جـەنـگو ، جـۆرەکـانی :

<u>یـەك : حـوکمی جـەنـگو جیـهاد</u> : زۆربـەو جـەماوەری زانایـان ڕایـان وایە کە جیـهادو جەنگ فەرزی کیفایە (فرض الكفاية)یـە ، واتـە : ئەگـەر ژمارەیـەکی وا لـە مسـوڵمانان پێـی هەڵسـان کـە پێیـان ئەنجـام بـدرێ ، گونـاه لەسـەر هـەموویان لادەچـێ ، ئەگـەرنا هـەموویـان گوناهبـارن .

هەندێکیشـیان ڕایـان وایـە کـە فـەرزی عەیـن (فرض العين)ە ، واتـە لەسـەر یـەك یـەکـی مسـوڵمانانی خـاوەن توانـا پێویسـتە پێـی هەڵسـن ، ئەگـەرنا گوناهبـارن ، بەڵام بێگومان هەرکام لە ئایەتی (٩٥)ی (النسـاء) کـە پێشـتریش هێنامـانو ماناشـمان کـردو ئەمـە دەقەکـەیەتی : ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (٢٠٩٨٥) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٩٢٢) ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَة .

عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ ﴾ ، وە ئایەتی ژمارە (١٢٢)ی (التوبة) كە ئەمە دەقەكەیەتی :

﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

واتە : وە بڕواداران بۆیان نیە تێكڕاو هەموویان بچنە جەنگ ، دەبووایە لە هەر كۆمەڵێكیان دەستەیەك بڕۆن ، تاكو لە ئایینـدا شارەزابن ، وە هەركات گەڕانەوە لای كۆمەڵەكەیان ، ئاگاداریان بكەنەوە ، بەڵكو وریابن .

بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی ڕای جەماوەرو زۆربەی زانایان .

دیارە تێكڕای زانایانیش لەسەر ئەوە كۆكن ، كە لە چوار حاڵاندا جیهاد دەبێتە فەرزی عەین :

١) لە كاتی هێرش و پەلاماری دوژمندا بۆ سەر وڵاتێكی مسوڵمان : بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن ، یەكێكیان ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەندق (غزوة الخندق)دا كە كافرەكان هێرشیان كردە سەر مەدینەو ئابڵووقەیاندا ، مۆڵەتی كەسی نەدا ، كە جیهاد نەكاتو ، خواش سەرزەنشتی ئەوانەی كرد ، كە بە بیانووی جۆراوجۆر دەیانویست مەیدان چۆڵ بكەن ، وەك فەرموویەتی : ﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ ﴾ الأحزاب .

٢) لە كاتی فەرمانكردنی حوكمڕاندا بە كەسێك یان كۆمەڵێك دیاریكراو : وەك خوای ﷻ فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ

ٱلْءَاخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ التوبـــة ، (الكمال بن الـهُمام)یش لەوبــارەوە گوتوویــەتی : (يصير الجهاد من فروض الأعيان ، سواء كان المُسْتَنْفِرُ عَدْلاً أو فاسقاً ، فيجب على جميع أهل تلك البلدة النَّفْرَةُ ...)[١].

واتە : لەو حاڵەتەدا جیهاد دەبێتە فەرز لەسەر یەك یەکیان ، یەکسانە بابای دەنگدەر بۆ جەنگ ، دادگەر بێ یان لادەر ، لەسەر تێکڕای خەڵکی ئەو شوێنە فەرزە دەربچن بۆ جیهاد .

٣) لە کاتی پێویستیی هەبوونی سوپای مسوڵمانانداا بە شارەزایی کەسێکی دیاریکراو: دەشگونجێ زۆر بەڵگان لەسەر ئەم حاڵەتەش بێنینەوە ، بۆ وێنە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ ، لا يَظْلِمُهُ ، ولاَ يُسْلِمُهُ)[٢].

واتە : مسوڵمان برای مسوڵمانە ، نە ستەمی لێدەکاتو نە پشتی بەردەدات لە تەنگانەدا .

٤) لە کاتی ئامادەبوونی جەنگدا : چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾الأنفال .

واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! هەرکات بەرەنگاری هێرشی بێبڕوایان بوونەوە ، پاشیان تێ مەکەن ، وە هەرکەس لە ئێوە لەو ڕۆژەدا پشتیان تێ بکات ، مەگەر وەك تاکتیکێکی جەنگ ، یان پەیوەست بوون بە کۆمەڵێکی دیکەی جەنگاوەرەوە ، ئەگەرنا تووڕەیی خوای پێبڕاوەو ، جێگای دۆزەخەو ، ئەوەش خراپترین سەرەنجامە .

---

١) شرح فتح القدير ، ج ٤ ، ص٢٨٠، ٢٨٤ .

٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ ، برقم : (٤٤٢) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (٢٥٨٠) .

**دوو : جۆرەكـانی جـەنگ‌و جیـهاد** : ئـەوە لەبـارەی حـوكمی جـەنگ‌و جیهـادەوە ، لـەبارەی جۆرەكانیشـیەوە ، هـەر بـە كورتـی دەڵـێین : لـە ڕاسـتیدا دابەشـكردنی (جـەنگ‌و جیهـاد) بـۆ هـەردووك جـۆری : بـەرگریی كـردن (الـدِّفاع)و بەدواكـەوتن (الطّلَب) هەڵقـوڵاوی ئیجتیهـادو بۆچـوونی زانایانـەو ، دوو زاراوەی بەكـارهێنراوی قورئـان‌و سوننـەت نیـن .

ئــەوە لــە لایەكـەوەو لــە لایــەكی دیكەشــەوە : پابەنــد (مُلْـزَم) بــوونی دەوڵــەتی ئیسلامیی كە دەبـێ ساڵانە جارێك جەنـگ بكـات !

دیسان ڕای زانایانەو ، پەیوەندیی هـەبووە بەو واقیعـە سیاسییەوە ، كە كاتی خۆی دەوڵەتی ئیسلامیی بەتایبەت‌و سـەرجەم دەوڵەتانی دنیا بەگشـتی تێیـدا ژیـاون ، كە هـەر كام بەهێـزتر بووبێ ، كەڵكەكەڵەی خستنە ژێر ڕكێفی خـۆی ، ئـەوانی دیكـەی كەوتۆتــە كەللــەوە ، وەك گـوتراوە : (ومَـنْ لـم یَظلْـم النـاس یُظلـم) ، وە ئـەو كـاتە پەیماننامە (میثاق)یەكیش نەبوو {وەك ئەوەی ئێستا هەیە لە پەیماننامـە (میثـاق)ی نەتەوە یەكگـرتووەكاندا} كە نـابێ هیچ دەوڵەتێـك هێرش بكـاتە سەر ئـەوی دیكـە .

ئەگــەرنا مـادام بناغـە لـە پەیوەنـدیی نێوان مسـوڵمانان‌و نامسـوڵمانـاندا ، ئاشـتیی (سِلْم) بێ .

وەك ئایەتەكانی قورئـان بە ڕوونیی دەیگـەیەنن ، بۆ نمـوونـە :

١) ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾ البقـرة .

٢) ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٦١ ﴾ الأنفـال .

٣) ﴿ لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٨ ﴾ الـممتحنـة .

بەڵێ مادام ئەسڵو بناغەی ئاشتیی بێ ، لە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتی ئیسلامییو دەوڵەتانی دیکەدا ، وە ئیسلامیش بە سروشت خوازیاری صوڵحو ئاشتیی بێو ، دژی جەنگو ئاژاوە بێ ، بە هیچ جۆرێك ناگونجێ قەوارەی ئیسلامیی هەمیشە قەوارە سیاسییەکانی دیکە بخاتە حاڵەتی ئاگادارکرانەوە (إنذار)ەوە ، هەر کامیان دەستی لەسەر دڵی بێ ، داخۆ ئەمساڵ نۆرەی کامیانە ، دەوڵەتی ئیسلامیی هێرشی بکاتە سەر !!

ئنجا ئاشکراشە لە حاڵێکی وادا دەوڵەتەکان گەلەکۆمەکێی لەدژ دەکەنو ، بەرلەوەی بیانکاتە خواردنی ئێوارە ، دەیکەنە خواردنی نیو ڕۆژ ! (یتغدَّوْن بها قبل أن تَتَعشَّی بهم) !!

## ٦ / جیهادو جەنگ ئامڕازە ، نەك ئامانج :

ئەمیش ڕاستییەکی ڕوونو ئاشکرایەو ، دەشتوانین زۆر بەڵگانی لەسەر بێنینەوە ، بەڵام ئەم ئایەتە موبارەکە بەسە بۆ ئەو مەبەستە : ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُواْ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾الأحزاب .

کە دیارە دەربارەی کۆتایی پێهاتنی ئابڵووقەی کافرەکانە لە جەنگی ئەحزابدا ، بەبێ ڕوودانی جەنگو کوشتار .

واتە : وە خوا ئەوانەی بێبڕوا بوون ، بە بێ مرادییو بە ڕقو داخی زۆرەوە بەرپەرچدایەوەو ، هیچیان بەردەست نەبوو ، وە خوا جەنگی لەکۆڵ بڕواداران کردەوە ، وە خوا بەهێزی زاڵە .

وەك دەبینین خوای بەخشەر کۆتایی پێهێنانی جەنگی خەندەکی بەبێ کوشتار ، بە نیعمەتی خۆی داناوە لەسەر بڕواداران ، کەواتە : جەنگو کوشتار لە ئیسلامدا ، شتێکی ویستراو (مرغوب فیه) نییەو ، بە ناچاریی پەنای پێ دەبرێ ، کەواتە : ئامراز (وسیلة)ە ، نەك ئامانج (هدف) !

# ئایەتێک و دوو دەقی سوننەتی مشتومڕ هەڵگر ، لەبارەی جەنگ و جیهادەوە :

ئەوانەی کە زێدە ڕۆیی دەکەن لەبارەی جەنگو جیهادەوەو ، زیاتر وەك ئامانج (هدف) تەماشای دەکەن ، نەك ئامراز ، چەند دەقێکی شەریعەت بە بەڵگەی ڕاستیی بۆچوونەکەیان دێننەوە ، کە باوترینیان ئایەتێکە ناویان ناوە ئایەتی شمشێر (آية السَّيف) ، وە دوو دەقی سوننەتن ، ئنجا بە پێویستم زانی تیشکێك بخەینە سەر ئەو سێ دەقەو چەمكو واتای ڕاستەقینەیان ، کە بە هیچ جۆرێك پشگیریی ئەو بیرو بۆچوونە لارەی ئەوان ناکات .

## یەکەم : ئایەتی شمشێر !

هەرچەندە ئەوانەی ئەو بیرو بۆچوونانەیان هەیە لەسەر ئەوە کە ئایا ئایەتی شمشێر کامەیە ؟ ڕێك نەکەوتوون ، بەڵام زۆربەیان ڕایان وایە کە ئایەتی : (٥)ە ، لە سوورەتی (التوبة) کە ئەمە دەقەکەیەتی : ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾ التوبة .

واتە : ئنجا هەرکات مانگە (جەنگ تێدا) حەرامکراوەکان تێپەڕین ، ئەوە لە هەر شوێنێك هاوبەشدانەرەکانتان لێ هەڵکەوت ، بیانکوژن ، وە بیانگرنو دەوریان بگرنو

لە هەموو کەمینگایەك لێیان بچنە بۆسەوە ، ئنجا ئەگەر گەڕانەوە (بۆ لای خوا)و نوێژیان بەرپاکردو زەکاتیان دا ، ئەوە ڕێیان بەردەن ، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە .

ئنجا شایانی باسە کە هەندێك لە زانایان گوتوویانە : ئەم ئایەتە سەدو چل (١٤٠) ئایەتی نەسخ کردۆتەوە ، کە بریتین لەو ئایەتانەی فەرمان بە خۆڕاگریی‌و لێبوردەیی‌و بانگەواز بە حیکمەت‌و ... هتد دەکەن !!

کە لە ڕاستیدا وانیەو ، بگرە هیچ ئایەتێك لە قورئان دا نیە {وەك لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)دا باسمان کردوە} بەو چەمك‌و واتایەی زانایانی پاشین (خَلَفْ) وشەی (نسخ)یان بۆ بەکارهێناوە ، کە بریتیە لە : لابردنی حوکمێکی شەرعیی بە بەڵگەیەکی شەرعیی دواتر ، (رفْعُ حكم شرعي ، بدليلٍ شرعي متأخر) ، وە هاوەڵان‌و زانایانی پێشین کە وشەی (نسخ)یان بەکارهێناوە ، مەبەستیان پێی : (تخصیص العام) یان (تقیید المطلق) یان (تبیین الجمل) بووە[١] .

ئنجا ئەگەر سەرنجی ئەو ئایەتانە بدەین ، کە ئایەتی ژمارە : (٥)ی (التوبة) لە ڕیزیاندا هاتوە ، زۆرباش ڕوون دەبێتەوە ، کە مەبەست لە ئایەتەکە جەنگکردنە دژی ئەو هاوبەشدانەرانە کە پەیمانشکێن‌و ئەهلی غەدر بوون ، نەك تێکڕای هاوبەشدانەران :﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١
فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ
٢ وَأَذَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ
ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥۚ فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ
مُعۡجِزِي ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٣ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ
ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ

---

١) بڕوانە : (إِعلام الموقِّعين) ، ج ١ ، ص ٢٨ ، وە (الموافقات ، ج ٣ ، ص ٧٥).

إِلَىٰ مُدَّتِهِمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ ﴾التوبة ، وەك دەبینین :

١ - ئەو ئایەتانە بە گشتی لەبارەی ئەو هاوبەشدانەرانەوەن ، کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانانددا بەستوە ، چ پێیەوە پابەند بووبن ، چ پابەند نەبووبن ، ئایەتی (١) .

٢ - وە ئەوانەی کە بە پەیمانەکانیانەوە پابەند نەبوون ، چوار مانگ مۆڵەت دراون ، کە هەڵوێستی خۆیان یەکلایی بکەنەوە ، لەو ماوەیەدا ، چ بە سەلماندنی پابەندییان ، چ بە مسوڵمان بوون ، چ بە ئامادەی جەنگ بوون ، مادام ئەوان هەر دەرفەتیان لێ هەڵکەوێ ، زەبر لە مسوڵمانان دەدەن ، لە بەرگی هاوپەیمانیەتییدا ! ئایەتی (٢ ، ٣) .

٣ - بەڵام ئەوانەی پابەندبوونەو ، هیچ کەموکورییان لە پەیمانداریێتییدا نەبووەو ، هاوکاریی دوژمنانی ئیسلامیان نەکردوە ، پێویستە پەیمانەکەیان لەگەڵ ببرێتەسەر ، ئایەتی (٤) .

٤ - بەڵام ئەوانەی پابەندنین بە پەیمانەکانیانەوەو ، هەر دەرفەتێکیان لێ هەڵکەوێ زەبر لە مسوڵمانان دەدەن ، ئەوە پاش ئەو چوار مانگە مۆڵەتە ، مسوڵمانان بۆیان هەیە لێیان بخەفتێنو دەستیان لێ بوەشێنن ، بەڵام نەك لەبەر بێئیمانییان ، بەڵکو لەبەر بێ پەیمانیی ! ئایەتی (٥) .

٥ - هەرکات یەکێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەران ، بە مەبەستی گوێ بیست بوونو لێتێگەیشتنی قورئان ، داوای پەنادران (جوار)ی کرد ، پێویستە پەنا بدرێو ، پاشانیش ، ئەگەر قەناعەتی بە ئیسلام نەهات ، بە سەلامەتیی بگێڕرێتەوە شوێنی دڵنیایی خۆی ، ئایەتی (٦) .

کەواتە : ناونانی ئایەتی ناوبراو بە ئایەتی (شمشێر) هیچ پاساوێکی نیە ، وە ئایەتی ناوبراو بە هیچ شێوەیەك جاڕدانی جەنگی گشتیی (إعلان النّفير العام)ی تێدا نیە دژی ئەهلی کوفر ، بە بەڵگەی فەرزبوونی پابەندیی بە پەیمانی کافرانی پابەند بە پەیمانەکانیانەوە ، وە پێویستبوونی پەنادانی هاوبەش بۆ خوا دانەری پەنابەر (المشرك المستجير) بۆ تێگەیشتنی قورئانو شارەزابوونی ئیسلامو ، پاشانیش گەیاندنەوەی بە شوێنی دڵنیایی خۆی .

## دووەم : دەقی ﴿بُعِثْتُ بين يدي الساعة بالسَّيف ...﴾ :

دەقێکی دیکە لەوبارەوە ئەو فەرموودەیە کە ئەمە دەقەکەیەتی : ﴿بُعِثْتُ بَيْنَ يَدَيْ الساعَةِ بِالسَّيْفِ حَتَّى يُعْبَدَ اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ ، وَجُعِلَ رِزْقِي تَحْتَ ظِلِّ رُمْحِي وَجُعِلَ الذُّلُّ وَالصَّغَارُ عَلَى مَنْ خَالَفَ أَمْرِي وَمَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ)[1] .

واتە : پێش هاتنی کاتی کۆتایی هاتنی دنیا بە شمشێرەوە ڕەوانە کراوم ، هەتا تەنیا خوا دەپەرسترێو هاوبەشی نابێ ، وە بژیوم خراوەتە سێبەری نێزەمەوە ، وە زەبوونییو ملکەچیی لەسەر هەرکەسێك دانراوە کە دژی فەرمانمە ، وە هەرکەسێك خۆی بە کۆمەڵێك بچوێنێ ، ئەوە لەوانە .

دیارە زانایان چ لە ڕووی سەنەدو ، چ لەڕووی نێوەڕۆك (مَتْن)ەوە ، قسەی زۆریان لەسەر ئەو فەرموودەیە کردوە :

### یەك : لە ڕووی سەنەدەوە :

بەشێك لە زانایان لە ڕووی سەنەدەوە ئەو دەقەیان بە باش (حسن) ، یان ڕاست (صحيح) داناوە ، وەك (أحمد شاكر)و (الألباني) ، بەڵام بەشێکیان بە بێهێز (ضعيف)یان داناوە ، وەك : (شعيب الأرناؤوط ، ومحمد نعيم ، والعرقسوسي ، وإبراهيم الزيبق) کە (تخريج)ی (المسند)ی (أحمد)یان کردوە ، گوتوویانە : (إِسنادٌ ضعيف) .

---

١) رواه أَحْمَد برقم : (٥١١٤) ، وَصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع الصغير ، وزيادته : ٢٨٣١.

دیـارە ئـەویش بەهـۆی ڕاجیاییـانەوە لـەبارەی یەكێـك لـە گێـڕەرەوە (راوي)ەكـانی ئـەو دەقـەوە كـە (عبدالرحمن بن ثابت ابن ثوبان)ە .

بۆ وێنـە :

(الحـافظ الـمِزِّي) لـە كتێبـی : (تهـذيب الكمـال)دا بـە ژمـارە : (٣٧٧٥) باسـی (ابـن ثوبان) دەكـاتو ، لـەم زانـایانەوە ئەم هەڵسەنگاندنانە لەبـارەیانەوە دێنـێ :

١ -أحـمد بن حنبل : أحاديثهُ مناكيـر .

٢ -يحيـى بن مَعين : ضعيف ، لە شوێنێكی دیكـە : صـالح ، وە لـە جێیـەكی دیكە لا شـيء .

٣ -النسـائي : ضـعيف ، لَيْس بالقـوي ، ليس بثقـة .

٤ -أبو داود : ليس بـه بأس .

٥ -إبن خِراش : في حديثه لـين .

٦ -إبن الجـوزي : من الضـعفاء .

٧ -الحـافظ ابـن حجـر : صـدوق يُخطـيء ، ورُميَ بالقـدر ، وتغيَّـر بأَخـرة .

هەڵبـەتە بابـایەكی ئـاواش ناگونجـێ فەرموودەیـەكی بـەو نێـوەڕۆكـە مەترسـیدارەی لـێ وەربگیـرێ :

كـە گوایـە ئیسـلام ئایینـی شـمشـێرەو ، بـژیوی پێغـەمبـەریش لـە سـێبەری ڕمو نێـزەی دایـە !!

## دوو : لە ڕووی نێـوەڕۆكــەوە :

لە هیچ ئایەتێكدا خوای كاربەجێو زاڵ نەیفـەرمووە كە پێغەمبـەری كۆتـایی خـۆی بە هێـزو شـمشـێرەوە ناردوە !

بەڵكو لە چەندان ئایـەتدا ڕایگەیاندوە ، كە پێغەمبەری كۆتـایی خـۆی بە :

١/ ڕێنمایـیو ئـایـین هـەق (بالهدى ودين الحق) .

٢/ بەزەیـی بۆ جیهـانییـان (رحمة للعالمين) .

٣/ ئامۆژگاریی‌و شیفا (موعظة و شفاء) .

٤/ ڕوونكەرەوەی هەموو شتێك‌و موژدە (تبياناً لكل شيء و بشرى) .

٥/ هەق‌و ڕاستیی (بالحق) .

٦/ موژدەدەرو ورياكەرەوە (بشيراً ونذيراً) ، ناردوە ، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی :

١) ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾التوبة .

٢) ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الفتح .

٣) ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ ﴾الصف .

٤) ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾الأنبياء .

٥) ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾يونس .

٦) ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ النحل .

٧) ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۖ وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَـٰبِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٩﴾ ﴾البقرة .

کەواتـە :

دەقـی ناوبراو نە لە ڕووی سـەنەدەوە ، نـە لـە ڕووی نێوەڕۆکـەوە ، ناگونجـێ پشـتـی پێ ببەسـترێو ، بە فـەرموودەی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ دابنـرێ .

**سـێیـەم : دەقی : ﴿أُمِـرْتُ أَنْ أُقاتِلَ النَّاسَ حَتّى يَشْـهَدوا أَنْ لا إِلهَ إِلاّ اللهُ ...﴾ :**

دەقێکی دیکە کە پەڕگیـرانو تێپەڕێنەران لە بواری جیهاد دا ، پشتی پێ دەبەسـتن ، ئەم فەرموودەیـەیـە :

﴿أُمِـرْتُ أَنْ أُقاتِـلَ النَّـاسَ حَتّـى يَشْـهَدوا أَنْ لا إِلـهَ إِلاّ اللّهُ وَأَنَّ مُحَمَّـداً رَسـولُ اللّهِ ، وَيُقيمُوا الصَّلاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكـاةَ ، فَـإِذا فَعَلُـوا ذَلِـكَ عَصَـمُوا مِنّـي دِمَـاءَهُمْ وَأَمْوالَهُمْ إِلاّ بِحَقِّ الإِسْلامِ ، وَحِسـابُهُمْ عَلى اللّهِ﴾[1] .

واتـە : فەرمانم پێکراوە لە دژی خەڵك بجەنگم ، تاکو : شـایەتمان دێنـن : کە جگـە لە خوا هیـچ پەرسـتـراو نین ، وە کە موحەممەد ڕەوانەکـراوی خوایـە ، وە نوێـژ بەرپـا دەکەنو ، زەکـات دەدەن ، ئنجا ئەگەر ئەوانەیان کـرد ، ئەوە خوێنو سـامانی خۆیانیـان لەمن پاراستوە ، مەگەر بە هەقی ئیسـلام ، وە لێپرسـینەوەشـیان عـایدی خوایە .

دیـارە پەڕگیـران وا لـەم فەرموودەیـە حـاڵی بـوون ، کە ئـەوە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئیعلانـی جـەنگ دژی هـەموو مرۆڤایـەتی کـردوە ، هـەتا دێنـە نێـو ئیسـلامەوەو دەبنـە مسـوڵمان !! شـایانی باسیشـە کـە زۆرێـك لـە زانایـان قسـەیان لەسـەر ئـەم فەرموودەیە کــردوە ، چونکــە ڕواڵــەتەکەی لەگــەڵ زۆر ئایــەتو فــەرموودەو ســیــرەو ژیــانی پێغەمبەریشـدا تێـکدەگیـرێ ، بابـزانین چـۆن ؟! :

١ / ئـەوەی لـە دژی مسـوڵمانان نەجـەنگێ ، دروسـت نیـە جـەنگی لـە دژ بکـەن :

﴿ وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾ البقـرة .

---

١) أَخْرَجَـهُ البُخَارِيُّ ، برقم : (٢٥) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (٢٢).

٢ / هەرکات ئەهلی کوفری شەڕەنگێز ، مەیلی ئاشتییان کرد ، دەبێ ئەهلی ئیسلامیش لای ئاشتیی بگرن : ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾﴾ الأنفال .

٣ / نامسوڵمانانێك كە بێ لایەنیی (الحِیادْ) لە نێوان ئەهلی ئیسلامو ئەهلی کوفردا هەڵدەبژێرن ، دروست نیە مسوڵمانان جەنگیان لە دژ بکەن : ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَـٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَـٰتِلُوا۟ قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَـٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾﴾ النساء .

٤ / ئەو نامسوڵمانانەی پەیمانیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەیە (کە دژی یەکدی جەنگ نەکەن) دروست نیە تەنانەت لەسەر دەستدرێژیی کردنە سەر مسوڵمانانی ژێر دەستیشیان ، پەیمانیان لەگەڵ بشکێنرێو جەنگیان لە دژ بکرێ : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَـٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يُهَاجِرُوا۟ مَا لَكُم مِّن وَلَـٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ ۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾﴾ الأنفال .

أ ـ ئیسلام لە نامسوڵمانانی خاوەن کتێب (أهل الكتاب)و ، بێ کتێب قبووڵ دەکات ، کە لە دەوڵەتەکەیدا هاووڵاتیی بن ، بەو شێوەیەی کە بە یەکەوە رێك دەکەون ، لە رووی سەرانە (جزية) دانو نەدانەوە .

ب ـ باشترین نموونەش : سێ هۆزە جولەکەکەی نێو مەدینەن : (بني قينقاع ، بني النضير ، بني قريظة) .

ئنجا هەر بۆیەش زانایان خۆیانیان بە ناچار بینیوە ، کە ئەو فەرموودەیە تەئویل بکەن ، یان بە جۆرێك مانا بکەن ، کە لەگەڵ ئەو هەموو ئایەتو فەرموودانەدا تێکنەگیرێ ، کە بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنن ، کە ئیسلام ئیعلانی جەنگی نەکردووە ناکات دژی مرۆڤایەتیی !

دیارە زانایان بە چەند شێوەیەك هەوڵی لابردنی ئەو ئیشکالە ڕواڵەتییەیان داوە ، بۆ وێنە :

١) (الحافظ ابن حجر العسقلاني) شەش وەلامی هێناون ، بڕوانە : فتح الباري ، ج ١ ، ص ١٤٥ ، ١٤٦ .

بەلام بەڕای من لە هەموویان بەهێزتر ئەو ڕایەیە ، کە دەڵێ : مەبەست لە (الناس) کافرانی شەڕفرۆش (الكفار المحاربون)ە‌و ، ئەلیفو لامی سەر (ناس) بۆ (عهد)ە ، نەك بۆ (جنس) ، ئەوکاتەش مانایەکەی ئاوای لێدێ : فەرمانم پێکراوە کە لە دژی خەڵکی کافری شەڕفرۆش بجەنگم ، تاکو دەڵێن : لا اله الا الله ... .

٢) (ابن تيمية)ش لەبارەی ئەو فەرموودەیەوە ، گوتوویەتی : (والمعنى : أنّي لم أُؤْمَرْ بالقتال الاّ الى هذه الغاية وليس المراد : أنّي أُمِرْتُ أن أقاتِلَ كل أحدٍ الى هذه الغاية ! فإنّ هذا خلاف النَّصِّ والإجماع ، فإِنه لم يفعل هذا قط ، بل كانت سيرتَهُ : أَنَّ مَنْ سالَمَهُ لم يُقاتِلْهُ)[1].

واتە : مانایەکەی : من فەرمانم پێنەکراوە بجەنگم ، مەگەر هەتا ئەو ئامانجە ، وە مەبەست ئەوە نییە : من فەرمانم پێکراوە کە لە دژی هەرکەسێك بجەنگم هەتا ئەو ئامانجە ! چونکە ئەمە پێچەوانەی دەقو کۆڕاشە ، چونکە هەرگیز شتی وای نەکردوە ، بەڵکو سیرەی وابووە ، کە هەر کەس ئاشتیی لەگەڵدا کردبێ لە دژی نەجەنگاوە .

٣) هەروەها (الصنعاني)یش لەوبارەوە قسەیەکی جوانی کردوە ، کە گوتوویەتی : (... بأَنَّ الحديث سيق لبيان الغاية ، التي أُبيحَ اليها القتالُ ، بحيث اذا فعلوها

---

١) قاعدة مختصرة في قتال الكفار ، ومهادنتهم وتحريم قتلهم لمجرد كفرهم ، ص ٢٣٦ ، ٢٣٨.

حَـرُمَ قتـالُهم ، أي : لـم أُؤْمَـر بقتـالهم الاّ الـى أن يَقـعَ مـنهم هـذا القـولُ ، فـإذا قالـوهُ حَرُمَ قِتالـهم ...)[١].

واتـە : ئەو فەرموودەیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئـەو ئامانجـە هـاتوە ، کـە جـەنگی بـۆ ڕەوا کـراوە ، بـە جۆرێـك کـە ئەگـەر کردیـان ، کوشـتاریان قەدەغـەبێ ، یـانی : فەرمـانم پێنـەکراوە لـە دژیـان بجـەنگم ، مەگـەر تـا ئـەو کـاتەی ئـەو قسـەیە دەکـەن ، ئنجـا هەرکـات گوتیـان ، کوشتاریان قەدەغەیە .

## ٧ / ڕەوشـتەکانی جیهـادو جـەنـگ :

لـە ئیسـلامدا خووڕەوشـتی بـەرزو بەهـا جوانەکـان ، هـەوێنو هـەناون بـۆ هـەموو شتێكو ، مسولْمانان پێویستە لە هەموو بوارەکانی دینـدارییو دنیاداریيـدا ڕازاوە بـن بـە ئاکاری پەسندو ڕەوشتی جـوان ، وە بواری جەنگو جیهادیش لەو بنچینەیە بەدەر نیە .

هەڵبـەتە دەشـگونجێ زۆر شـت لـەبارەی ڕەوشـتو ئاکـارە پەسـندەکانی بـواری جیهادەوە بـاس بکـەین ، بەڵام بە خستنە ڕووی حەوتیان واز دێنـین :

**<u>یـەك : بـەس خوا پـێ مەبەسـت بوون</u> :**

یەکەمینو سـەرەکیتـرین ئاکـاری بـەرزو پەسـندی پێویسـت بـۆ ئەنجامـدانی جـەنگو جیهـاد لـەرێی خوادا ، بریتیـە لە نیـازو مەبەسـتی خـۆ سـاغکردنـەوە (إخـلاص النِّيّـة) بـۆ خـوا ﷻ چونکـە کـردەوە باشـەکان ، بـەبێ ڕووحـی خـوا پـێ مەبەسـت بـوون ، وەك جەستەیەکی مردوون ، هەر بۆیەش خـوای بـە بـەزەیی فەرموویـەتی :﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۝٥ ﴾البينة .

واتە : تەنیا بەوە فەرمانیان پێکرابوو کە بە ملکەچییەکی ساغـەوە خوا بپەرسـتنو ، خۆیـان دوور بگرن لە هـەر ڕێبـازێکی دیکـە .

---

١) بڕوانە : بحث في قتال الكفار ، ضمن مجموعة : ذخائر علماءِ اليمن ، ص ١٥٤.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی : ﴿إنّمَا الأَعْمَالُ بالنِّيّاتِ ، وَإنَّمَا لِكُلِّ امرِئٍ مَا نَوَى﴾[1].

واتە : بێگومان کردەوە (چاکە)کان بەپێی نیازو مەبەست وەردەگیرێن ، وە هەرکەس تەنیا بەگوێرەی نیازی (نێو دڵی) پاداشت دەدرێتەوە .

وە بەتایبەت لەبارەی جەنگو جیهادەوە فەرموویەتی : ﴿مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾[2].

واتە : هەرکەسێك بۆ ئەوە بجەنگێ کە وشەی خوا بەرزترین بێ ، ئائەوە لەڕێی خوادایە .

وە من قەناعەتم وایە کە دڵسافییو نیازو مەبەست ساغیی لەگەڵ خوادا ، دەبێتە مایەی ڕێنمایی مرۆڤ بەرەو حەقو ، پارێزرانی لە خلیسکان بەرەو زەلکاوی هەڵەو تاوان ، بۆیە کاتێك کەسانێك دەبینم بەناوی جیهاد لەڕێی خوادا ، ستەمو دەستدرێژیی دەکەنە پیشە ، لە مێشکمدا نیشانەی پرسیار دەکەوێتە سەر نیازو مەبەستو دڵو دەروونیشیان ! بەڵگەشم فەرمایشتی خوایە کە فەرموویەتی :

﴿ وَٱلَّذِينَ جَـٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾العنكبوت .

واتە : وە ئەوانەی لەپێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن ، مسۆگەر ڕێبازەکانی خۆمانیان (یانی ئەو ڕێبازو شێوازانەی ئێمە پێمان پەسندن بۆ تێکۆشان) پێشان دەدەین ، وە بەدڵنیایی خوا لەگەڵ چاکەکارانە .

کەواتە : سەرگەردانییو ڕێ دەرنەکردن بەرەو حەقو چاکە ، بەڵگەی نەبوونی قیبلەنومای ئیخلاصو تەنیا خوا پێ مەبەست بوونە ! .

---

[1] أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ ، برقم : (٦٥٥٣) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٩٠٧) ، وَأَبُو دَاوُدَ ، برقم : (٢٢٠١) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (١٦٤٧) ، وَالنَّسَائِيُّ ، برقم : (٣٧٩٤) ، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (٤٢٢٧).

[2] أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (١٩٥١١) ، وَالبُخَارِيُّ ، برقم : (٧٠٢٠) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٩٠٤) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٢٥١٧) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (١٦٤٦) ، وَالنّسَائِيُّ ، برقم : (٣١٣٦) ، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (٢٧٨٣) .

## دوو : خۆ دوورگرتن لە دەستدرێژیی و ستەم :

چونکە خوای دادگەر دەستدرێژیی (إعتداء)ی قەدەغە کردوە ، دیارە هەموو دەستدرێژییەکیش ستەمە ، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾البقرة .

کە پێشتر مانامان کردووەو (إعتداء)یش لێرەدا دوو واتایان هەڵدەگرێ :

أ - جەنگ کردن لە دژی نامسوڵمانانێك کە لە دژی مسوڵمانان ناجەنگن ، وە پشتی دوژمنانیشیان لە دژیان ناگرن .

ب - کوشتنی کەسانێك کە جەنگ ناکەن ، وەك : ژنو منداڵو پیرو نەخۆشو جوتیارو کرێکارو ... هتد کە نە بە جەستەیان ، نە بە بیروڕاو تەگبیریان بەشداریی جەنگ ناکەن .

وە لە ڕاستیدا هەردووك واتایەکەش لە یەك کاتدا مەبەستنو وشەی (إعتداء) دەیانگرێتەوە ، چونکە هەردووکیان ستەم (ظلم)نو ستەمیش قەدەغەیە ، وەك خوای بەرزو مەزن لە فەرمایشتێکی قودسییدا فەرموویەتی : ﴿يَا عِبَادِي ! إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي ، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا ، فَلا تَظَالَمُوا﴾[(١)].

واتە : ئەی بەندەکانم ! من ستەمم لە خۆم قەدەغەکردوە ، وە لە نێو ئێوەشدا گێڕاومە بە قەدەغەکراو ، دەجا ستەم لە یەکدی مەکەن .

## سێ : نەکوشتنی جگە لە جەنگاوەران :

هەرچەندە خاڵی پێشووش ئەمە دەگرێتە خۆی ، بەڵام لەبەر زێدە ترسناکیی تاوانی کوشتنی بە ناهەق ، بەتایبەتیش هێنامان .

دیارە ئێمە پێشتریش باسی ئەم مەسەلەی کوشتنی بە ناهەقمان کردوە ، بۆیە لێرەدا بە کورتیی لەوبارەوە دەدوێینو بەهێنانی دوو فەرموودە ، کە یەکەمیان پێشتریش هێناومانە ، وازی لێ دێنین :

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ ، برقم : (٤٦٧٤).

﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ، أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ ، فِي بَعْضِ مَغَازِي ﷺ ، مَقْتُولَةً؛ فَأَنْكَرَ رَسولُ اللهِ ﷺ قَتْلَ النِّساءِ وَالصِّبْيَانِ﴾[1].

هەروەها ئەم فەرموودەیەش دێنین :

﴿لاَ تَقْتُلُوا شَيْخاً فَانِياً ، وَلاَ طِفْلاً صَغيراً ، وَلاَ امْرَأَةً﴾[2].

شایانی باسیشە هەندێك لە زانایان ئەو فەرموودەیە (كە ئێستا دەیهێنن) ئیشكالی بۆ دروست كردوونو ، ناچاری كردوون بڵێن : ئەو فەرموودانەی پێشتر هێنامانن ، نەسخیان كردۆتەوە !

فەرموودەكەش ئەمەیە : ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاس أَنَ الصَّعْب بن جَثَّامة ، قَالَ : مَرَّ بي النبيُّ ﷺ بالأبواء (أو بودّان) فَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ، فيُصَابُ مِنْ نِسائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ ، قَالَ : هُمْ مِنْهُمْ)[3].

واتە : پێغەمبەر ﷺ لە ئەبواء (یان لە وەددان) بەلامدا تێپەڕی ، لەبارەی ماڵێكی هاوبەشدانەرانەوە پرسیاری لێكرا : كە شەبەیخوونیان دەكرێتە سەرو ژنو منداڵیان دەپێكرێن ؟ فەرمووی : ئەوانیش لە خۆیانن .

بەڵام ، وەك (الخطّابي) گوتوویەتی ، پێویست بەوە ناكات بڵێین : فەرموودەكەی (الصّعب بن جَثّامة) نەسخ كراوەتەوە ، بەڵكو دەڵێین : كە فەرموویەتی : (هم منهم) واتە ، لە كاتی شەبەیخوون (بیات)دا ، چونكە ناگونجێ لە یەك جیا بكرێنەوە ، وە دروستە جەنگ لە دژی كافرەكاندا بكرێ ، با ژنو منداڵیشیان پێوە بن ، وە ئەو فەرموودانەی دیكەش ، باسی ئەوە دەكەن كە دروست نیە ژنو منداڵی كافرانی جەنگاوەر بكرێنە ئامانج ، بەو شێوەیەش فەرموودەكان پێكەوە كۆدەكرێنەوە[4] .

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي ، برقم : (٣٠١٤) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٧٤٤) .
٢) أَخْرَجَهُ إبْنُ أَبي شَيْبَة ، برقم : (٣٣٧٩٠) ، وَأَبُو دَاوُدَ ، برقم : (٢٦١٤) ، وَالبَيْهَقِيُّ ، برقم : (١٧٩٣٢).
٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ ، برقم : (٣٠١٢) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٧٤٥).
٤) بڕوانە : معالم السنن ، الخطابي ، ج ٣ ، ص ١٤، ١٥، وە (فتح الباري) ، ج ٧ ، ص ٥٧٨.

## چوار : خۆ دوورگرتن لە ئەتككردن‌و شێواندنی جەستەی کوژراوانی دوژمن :

وشـەی (مُثْلَة) یـان (تمثیـل) بـە كـوردیی (ئـەتك)و (شـێواندنی جەستـەی مـردوو)ی پێدەڵێن ، وە ئیسلام ئەو ڕەفتارەی قەدەغـە كـردوە ، نەك هـەر وەك دەسـتپێشـخەریی بەڵـكو وەك كاردانـەوە مامەڵـەی هاوشـێوە (ردُّ الفعـل و معاملـة بالـمثل)یـش ، ئنجـا لەبەرئـەوەی دواتـر لـە {ئاڵـقەی (٨)ی زنجیـرەی دووەمـدا}[1] بـە درێژیـی باسـی ئـەم مەسـەلەیە دەكـەین ، لێـرەدا بـە هێنانـەوەی ئـەم دوو فەرموودەیـە وازدێـنین ، كـە پێشـتـریش هێنـاومانن‌و ماناشـمان كردوون :

﴿اغـْزُوا وَلاَ تَغـُلُّوا وَلاَ تَغْدِرُوا وَلاَ تُمَثـِّلُوا﴾[2].

واتـە : جـەنگ بكەن‌و دزیی لە دەستكەوت (غنیمة) مەكەن‌و ، پەیمـان مەشـكێنن‌و ، جەستەی كوژراوان مەشـێوێنـن .

﴿أَعَفُّ النَّاسِ قِتْلَةً أَهْلُ الإِيمَانِ﴾[3].

واتە : بـڕواداران لە هەموو كەس دەستپاكـترو ڕەوشـت جوانتـرن ، لە كوشـتنـدا .

## پێنج : وەفاداریی پەیمان‌و خۆپاراستن لە پەیمان شكێنیی :

وەفـاداریی‌و پەیمـان بردنەسـەر ، یەكێكـە لـە ڕەوشـت‌و ئاكـارە داكـۆكیی لەسـەركراوەكان لـە ئیسـلامدا بەگشـتییو ، لـە كـاتی جەنگـدا بەتایبـەت ، وە بـە پێچەوانەوە ، پەیمان شكێنیی (غـدْر) بە یـەكێك لـە سـیفەت‌و كـردەوە هەرە خراپـەكان دانـراوەو ، بـە سـیفەتی ئەهلـی كـوفرو نیفـاق دانـراوە ، وەك خـوا ﷻ دەفـەرموێ :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ

---

١) مەبەست زنجیرەی:{با لادان‌و تاوانی پەڕگیران بەرامبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی‌و گومان}ە.

٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ ، برقم : (١٧٣١)

٣) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد ، بـرقم : (٣٧٢٨) ، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط : حَسّنهُ أَبُـو دَاوُد ، بـرقم : (٢٦٦٦) ، وَابْنُ مَاجَـهْ ، برقم : (٢٦٨٢).

﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾﴾ آل عمـــران ، واتــە : بەڕاســتیی ئەوانــەی نرخێکــی کــەم بــە پەیمــانی خــواو ســوێندەکانیان دەکــڕن ، ئائەوانــە هــیچ بەشــێکیان لــە ڕۆژی دوایــی (لــە بەهەشــت)دا نیـــەو ، خـــوا لــە ڕۆژی قیـــامەتدا نایانــدوێنـــێو ، تەماشـــایان ناکـــاتو ، پاکیــان ناکــاتەوە ، وە ســزایەکی بەئێشــیان هەیــە .

پێغەمبەری خواش ﷺ لەبارەی گەورەیی تاوانی پەیمـان شـکێنییەوە فەرموویـەتی : ﴿ذِمَّـةُ الْمُسْـلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ ...﴾[1].

واتە : پەیمـانی مسولْمانان یەکـێکە خوارترینـیـان دەبـێ بیپـارێـزێ ...) .

ئنجا شـایانی باسـە کە تەنانەت لـە بەرانبـەر پەیمـان شـکێنیی‌و خیانـەتی دوژمنیشــدا دروسـت نیـە پەیمـان بشـکێنرێ ، هـەر بۆیـەش خـوای دادگـەر فەرموویـەتی : ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾ الأنفــال .

واتـە : وە ئەگـەر مەترسیی خیانەت (پەیمـان شکێنیی)ت لە کۆمەڵـێك هـەبوو ، ئـەوە بە ئاشـکرا پەیمانەکـەیان بدەوە ، بـا هـەردووك لاتـان وەك یـەك ئاگاداربن (لـە نەمـانی ئەو پەیمـانە) بێگومان خـوا پەیمان شـکێنانی خۆشـناوێن .

پێغەمبـەری خـواش ﷺ لـەوبارەوە کـە دروسـت نیـە لـە بەرانبـەر پـەیمان شـکێنیی دوژمندا ، پەیمان شکێنیی بکرێ ، فەرموویـەتی : ﴿أَدِّ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ ، وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ﴾[2].

واتـە : هەرکەسێك ئەمـانەتی پێ سپاردی ، سپاردەکەی بـدەوە ، وە ناپاکـیی‌و پـەیمان شـکێنیی بەرانبەر بە کەسـێك مەکە ، کە خیـانەتت پێ دەکات .

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي ، برقم : (١٨٧٠) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٧).

٢) أَخْرَجَــهُ أَبُــو دَاوُدَ ، بــرقم : (٣٥٣٥) ، وَالتِّرمِـذِي ، بــرقم : (١٢٦٤)، وَالــدَّارِمِيُّ ، بــرقم : (٢٥٩٧)، وَالحَاكِمُ (٢\٤٦) ، وَصَحَّحَهُ عَلَى شَرْط مُسْلِم ، ووافقه الذهبـي ، وصحّحه الألباني فـي صحيح أبي داود : ٣٠١٩.

**شەش : خۆ پاراستن لە خراپەکاریی و تێکدان ، وەك بڕینی درەختو ڕووخاندنی خانوو :**

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو ڕەوشتو ئاکارە پەسندانەی ، کە ئیسلام شوێنکەوتووانی خۆی لە حاڵەتی جەنگیشدا پێوە پابەند دەکات .

خوای بەرزو مەزن لەبارەی کەسانێکی خراپەکارو ئاشووب گێڕەوە ، وەك ڕەخنە لێگرتنو سەرزەنشتکردن ، فەرموویەتی : ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾البقرة .

واتە : وە هەر کات پشتی هەڵکرد (ڕووی وەرگێڕا) هەوڵی خراپەکاریی دەدا لە زەویدا ، وە تێدەکۆشا کە کشتوکاڵو وەچە بفەوتێنێ ، وە خوا حەز لە خراپەکاریی ناکات .

ئنجا ئەگەر یەکێکیش فەرموودەی خوا : ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٥﴾ ﴾الحشر .

واتە : وە هەر دارخورمایەك کە بڕیتان {لە جەنگی هۆزی (بني النضير)ی جوولەکەدا} یان بەپێوە لەسەر ڕەگو بنکەکانی هێشتتانەوە ، ئەوە بە مۆڵەتی خوا بوو ، وە بۆ ئەوەبوو کە لەڕێ دەرچووان زەبوون بکات .

بە بەڵگە بهێنێتەوە ، دەڵێین :

زانایان گوتوویانە : ئەو ڕەفتارەی پێغەمبەری خوا ﷺو مسوڵمانان لەو جەنگەدا هەڵاوێردراو (مستثنى) بووە لەو بنچینەیە، وە ئێستاش هەرکاتێك بەرژەوەندیی جەنگ ئەو جۆرە ڕەفتارە بخوازێو ، یەکی لەسەری بکەوێ ، دروستە بکرێ ، ئەمە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە(١) .

---

١) بڕوانە : المغني ، لابن قدامة : ج ١٣، ص ١٤٣، ١٤٤ .

## حەوت : دەستپاکیی لە بەرانبەر دەستکەوتی جەنگدا :

یەکی دیکە لە ڕەوشتو ئاکارە بەرزو پەسندەکانی بواری جەنگو جیهاد ، بریتیە لە دەستپاکیی (النزاهة)و خۆ دوورگرتن لە دەستکاریی دەسکەوتی جەنگ (الغنیمة) کە ئەویش، واتە : دەستکارییکردنی دەستکەوتی جەنگ، دوو حاڵەتی هەن :

یەکەم : دەستکارییکردنیو بردنی بە ئاشکرا ، کە ڕفێنراو (نُهبَة)ی پێدەگوترێو ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی : ﴿إنَّ النُّهْبَةَ لَيْسَتْ بِأَحَلَّ مِنَ الْمَيْتَةِ)[1] .

واتە : بێگومان ڕفێنراو (لە غەنیمەت) لە مردار حەلاڵتر نیە .

دووەم : دزینی بە پەنهانیی ، کە (غُلول)ی پێدەگوترێو ، خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی : ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ ﴾ آل عمران .

واتە : وە هیچ پێغەمبەرێك ناكرێ دزیی لە غەنیمەت بكات ، وە هەر كەس ناپاكیی (لە دەستكەوتی جەنگ) بكات ، ڕۆژی قیامەتێ ئەوەی دزیویەتی (لە دەستكەوت) دەیهێنێ ، پاشان هەركەسە بە گوێرەی ئەوە كردوویەتی سزاو پاداشت دەدرێتەوە ، وە ستەمیان لێناكرێ .

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن ، بۆ نموونە :

﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، قَالَ : صَلَّى بِنَا رَسولُ اللهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ إِلَى جنب بَعِيرٍ مِنَ المقَاسِمِ ، ثُمَّ تَنَاوَلَ شيئاً مِنَ الْبَعِيرِ فأخذ منه قَرَدَةً (يعني وَبْرَةً) فَجَعَلَهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ ، ثم قال : يَا أَيُّهَا النَّاسُ ! إِنَّ هَذَا غَنَائِمُكُمْ فَأَدُّوا الْخَيْطَ وَالْمِخْيَطَ ، فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ ، فَمَا دُونَ ذَلِكَ ، فَإِنَّ الْغُلُولَ عَارٌ عَلَى أَهْلِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشَنَارٌ وَنَارٌ)[2] .

---

١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد ، برقم : (٢٧٠٥) ، وَصَحَّحَهُ الألبَاني ، فِي صحيح أبي داود : (٢٣٥٤) .
٢) أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (٢٨٥٠) ، وَصَحَّحَهُ الألباني ، في (صحيح ابن ماجه) : (٢٣٠٠).

واتە : عوبادەی کوڕی صامت خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : لە جەنگی حونەیندا پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەنیشت حوشترێکی غەنیمەتەوە نوێژی پێکردین ، ئنجا تۆزە تووکێکی لە وشترەکە دەرکێشاو ، خستیە نێوان دوو پەنجەیەوەو ، فەرمووی : ئەی خەڵکینە ! ئەمە لە دەستکەوتەکانتانە ! دەزوو و دەرزی (یان بەن‌و سووژن) وە زیاترو کەمتر لەوەش ، تەسلیم بکەن ، چونکە ناپاکیی لە دەستکەوت لە ڕۆژی قیامەتدا ، نەنگیی‌و عەیب‌و (مایەی چوونە) ئاگرە .

**بابەتی دووەم :**

# باسێک لەبارەی جەنگی بەدرەوە لەبەر رۆشنایی کتێبەکەی (إبن هشام)دا

شایانی باسە ئێمە کاتی خۆی لە کتێبی : (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ)دا ، لە بیستو یەك خاڵدا باسی جەنگی بەدرمان کردوە[1]، بەڵام ئێستا ئێمە لە پەنجا (٥٠) خاڵدا ، بە خێراییو بە چڕیو پڕیی ، باسی جەنگی بەدر دەکەین ، لەبەر رۆشنایی کتێبەکەی ئیبنو هیشام دا ، کە دیارە بۆ ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەمین سەرچاوەیە ، وە گرنگترین سەرچاوەیە ، وە زانایان زۆر پشتیان پێ بەستوە ، بۆ کۆی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ .

(إبن هشام) لەژێر ناوونیشانی : (غَزْوَةُ بَدرٍ الْكُبْرَى)[2] دا باسی جەنگی بەدری کردوە ، کە منیش ڕاستەوخۆ دەقە عەرەبییەکەی دێنمو تەرجەمەی دەکەم ، وە جاروبار بە پێی پێویستیی قسەی خۆم نێواخن دەکەم ، بە مەبەستی زیاتر تیشك خستنەسەرو ڕوونکردنەوە :

١ / سەرەتا دەڵێین : وشەی (بدر) ناوە بۆ بیرێك کە لەو ناوچەیەیە ، کە شەڕەکەی لێ ڕوویداوە ، وە بەدریش ناوی پیاوێك بووە ، کە ئەو بیرەی لێداوە ، دوایی بووەتە کانیو سەرچاوەیەك لەو شوێنە .

---

١) لە لاپەڕە (٤٦٨ تا ٤٨١) لە چاپی سێیەم .

٢) السيرة النبويّة لابن هشام ، ج ٢ ، ص (٣٢٧ ـ ٣٦٢) .

(ابن هشام) دەڵێ : ( لما سمعَ رَسولُ الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بأبي سفيان مُقبِلاً من الشام نَدَبَ المسلمين إليهم ، وقال : ﴿هذه عير قريش فيها أموالهم ، فانْفِرُوا اليها لعلَّ الله يُنْفِلْكُموها) فَانْتَدَبَ الناسُ ، فَخَفّ بَعْضُهُمْ وَثَقُلَ بَعْضُهُمْ ، وَذَلِكَ أَنّهُمْ لَمْ يَظُنّوا أنّ رَسولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ يَلْقَى حَرْبًا﴾.

واتە : کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بیستی ئەبو سوفیان لە شامەوە دەگەڕێتەوە بە کاروانەوە ، مسوڵمانانی بانگ کرد ، وە فەرمانی پێکردن و فەرمووی : ئەوە کاروانی قورەیشە ، ماڵ و سامانەکانیانی تێدایە ، بۆی بچن ڕێی پێبگرن ، بەڵکو خوا ﷻ بیکاتە مایەی دەستکەوتتان ، هەندێکیان چوون ، وە هەندێکیشیان نەچوون ، چونکە پێیان وانەبوو ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی جەنگ و شەڕ دەبێ ، وە پێیان وابوو ، بۆ کاروان گرتنێ ، ئەوەندەی چوون بەسە .

پاشان (ابن هشام) دەڵێ : (وَكَانَ أَبُو سُفْيَانَ حِينَ دَنا مِنْ الْحِجازِ يَتَحَسّسُ الأَخْبَارَ وَيسْأَلُ مَنْ لَقِيَ مِنْ الرّكْبَانِ تَخَوّفًا عَلَى أَمْرِ الناسِ ، حَتّى أَصَابَ خَبَرًا مِنْ بَعْضِ الرّكْبَانِ أَنّ مُحَمّدًا قَدْ اسْتَنْفَرَ أَصْحابَهُ لَكَ وَلِعِيرِك فَحَذِرَ عِنْدَ ذَلِكَ . فَاسْتَأْجَرَ ضَمْضَمَ بْنَ عَمْرٍو الْغِفَارِيّ فَبَعَثَهُ إلَى مكة ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَأْتِيَ قُرَيْشًا فَيَسْتَنْفِرَهُمْ إلَى أَمْوَالِهِمْ وَيُخْبِرَهُمْ : أَنّ مُحَمَّداً قَدْ عَرِضَ لَها فِي أَصْحابِهِ ، فَخَرَجَ ضَمْضَمُ بْنُ عَمْرٍو سريعاً إلى مكة) .

واتە : ئەبو سوفیان کاتێك لە شام گەڕایەوەو نیزیکی مەککە کەوتەوە گوێی هەڵدەخست بۆ دەنگ و باسان ، وە هەر کەسێك پێی گەیشتبایە لە ڕێبواران ، لێی دەپرسین لە ترسی ئەوەی کە ڕێ بە کاروانەکەی بگیرێ ، هەتا هەواڵی پێگەیشت لە هەندێ لە ڕێبوارانەوە کە : موحەممەد هاوەڵەکانی خۆی بۆ تۆو بۆ کاروانەکەت دەنگداوە ! لەو کاتەدا ئەبو سوفیان لە ترسی ئەوە (ضَمْضَمَ بْنَ عَمْرٍو الْغِفَارِيّ) بە کرێ گرت ، وە ناردی بۆ مەککە ، وە فەرمانی پێکرد کە بچێ قورەیشییەکان هەڵسێنێ ، بۆ ئەوەی بێن کاروانەکەی خۆیان دەرباز بکەن ، وە پێیان بڵێ : کە موحەممەد ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی هاتۆتە پێش کاروانەکەو ، دەیەوێ ڕێیان پێ بگرێ و ڕووتیان بکاتەوەو ، ماڵ و سامانەکەیان لێ بستێنن ، (ضَمْضَمَ بْنَ عَمْرٍو)یش بە خێرایی چوو بۆ مەککە.

٢ / (لَما أجمعت قُريشٌ المسير ، ذكرت الّذي كان بينها و بين بني بكر، فكاد ذلك يُثنيهم ، فتبدَّى لهم إبليس في صورة سراقة بن مالك بن جُعْشم المدلَجي ، وكان من أشراف بني كنانة ، فقال لهم : إني لكم جارٌ من أن تأتيكم كنانة من خلفكم بشيءٍ تكرهونه ، فخرجوا سِراعاً) .

واتە: کاتێك کە قورەیش بڕیاریاندا کە بڕۆن بۆ ئەوەی کاروانەکەی خۆیان دەرباز بکەن ، بیریان کەوتەوە کە لە نێوان ئەوان‌و هۆزی بەنی بەکردا دوژمنایەتیی‌و کوشتارو خوێن هەبووە ، ئەوانیش لەسەر ڕێیان بوون ، بۆیە ئەوە خەریك بوو پەشیمانیان بکاتەوە لە ڕۆیشتن بۆ ئەو شوێنە ، بەڵام ئیبلیس لە شێوەی سوڕاقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشومی مەدلەجییدا ، کە یەکێك بوو لە ناودارانی هۆزی بەنی کینانە ، هاتە پێشیان وە پێی گوتن : من پشتیوان‌و هاوکارتانم ، وە هۆزی کینانە لە پشتەوە هیچ شتێکتان لەگەڵدا ناکەن ، کە پێتان ناخۆشبێ ، بۆیە ئەمە وای لێکردن ، کە بە خێرایی بەرەو ئەو شوێنە بچن ، کە پێیان وابوو کاروانەکەیانی پێدا دێ ، بۆ ئەوەی کاروانەکەیان دەرباز بکەن .

٣ / ﴿وَ خرج رسول الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ يوم الإثنين لثمان ليالٍ خلون من شهر رمضان في أصحابه ، واستعمل عمرو بن أم مكتوم ، و يقال : اسمه : عبدالله بن أم مكتوم أخا بني عامر بن لؤي ، على الصلاة بالناس ، ثم ردَّ أبا لبابة من الروحاء واسعمله على المدينة﴾ .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دووشەم ، هەشت ڕۆژ تێپەڕی بوون لە مانگی ڕەمەزان ، (واتە : مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچیی) لەگەڵ هاوەڵانی دەرچوون ، وە عەمری ئیبنی ئوممی مەکتووم ، وە گوتراوە ناوەکەی عەبدوڵڵای ئیبنی ئوممی مەکتوومە ، کە لە هۆزی (بن عَامر بْنِ لُؤَي)یە ، ئەوی دانا کە پێشنوێژیی بکات ، بۆ مسوڵمانان ، دوای ویش لە ڕەوحاء (کە ناوی شوێنێکە) ئەبو لوبابەی گێڕایەوەو کردی بە سەرپەرشتیکردنی مەدینە ، لە جێی خۆی تاکو دەگەڕێتەوە .

٤ / ﴿وَدَفَعَ اللّوَاءَ إلَى مُصْعَبِ بْنِ عُمَيْرِ بْنِ هاشِمِ بْنِ عَبْدِ مَنافِ بْنِ عَبْدِ الدّارِ ، قَالَ ابْنُ هِشامٍ : وَكَانَ أَبْيَضَ﴾ .

واتــە : وە پێغـەمبــەری خــوا ﷺ ئـاڵای سـەرەکـیی سوپایەکـەی دایـە دەسـت موصـعەبی کـوڕی عومـەیری کـوڕی هاشـیمی کـوڕی عەبـدول مەنـافی کـوڕی عەبدوددار ، وە ئیبنو هیشـام دەڵـێ : ئاڵایەکـە سپی بوو ، (وَكَـانَ أَمَـامَ رَسُـولِ اللّٰهِ ﷺ رَايَتَـانِ سَـودَاوَانِ : إِحداهُمـا مـع عَلِـيِّ بْـنِ أَبِـي طَالِـبٍ ، يُقَـالُ لَهـا : الْعُقَـابُ ، وَالأُخْرَى مَعَ بَعْضِ الأَنْصَارِ) .

واتـە : وە لە پێش پێغەمبەری خوا ﷺ جگـە لـەو ئاڵا سەرەکییـە کـە سـپی بووە ، دوو ئاڵای ڕەشیش هەبوون ، یەکێکیان بەدەست عـەلی کـوڕی ئـەبی طاڵیـب بـوو ، کـە پێـی دەگوتـرا : (الْعُقَـابُ) ، ئـەوی دیکەشـیان بـە دەسـت یەکـێك لـە پشتیوانەکانەوە بوو .

٥ / ﴿وَكَـانَتْ إِبِلُ أَصْحَابِ رَسُـولِ اللّٰهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ سَبْعِينَ بَعِيراً ، فَاعْتَقَبُوهـا ، فَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ وَعَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ، وَمَرْثَدُ بْنُ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيّ ، يَعْتَقِبُونَ بَعِيرًا ، وَكَـانَ حَمْـزَةُ بْنُ عَبْـدِ الْمُطَّلِبِ ، وَزَيْـدُ بْـنُ حَارِثَـةَ ، وَأَبُـو كَبْشَـةَ ، وَأَنَسَـةُ مَوْلَيَـا رَسُـولِ اللّٰهِ ﷺ يَعْتَقِبُونَ بَعِيراً ، وَكَـانَ أَبُو بَكْرٍ ، وَعُمَرُ ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ، يَعْتَقِبُـونَ بَعِيراً ، وَجَعَـلَ عَلَـى السَّاقَةِ قَيْسَ بْنَ أَبِـي صَعْصَـعَةَ أَخَـا بَنِـي مَـازِنِ بْـنِ النَّجارِ ، وَكَـانَتْ رَايَةُ الأَنْصَارِ مَعَ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ﴾ .

واتـە : وە هاوەڵانی پێغـەمبـەر ﷺ ئەو ڕۆژە حەفتا حوشتـریان پـێ بوو ، (وە لە شوێنی دیکە گوتراوە ، کـە ئەسپێك ، یان دوو ئەسـپیان پـێ بووە) وە ئـەو حەفتـا حوشتـرە چەند کەسێك بە نۆرە دەچوونە سەر پشتیان ، دەڵـێ : پێغـەمبـەری خـوا ﷺ ، وە عەلی کوڕی ئەبی طاڵیب ، وە مەرسەدی کوڕی ئەبی مەرسـەدی غەنـەوی سواری حوشتـرێ ، دەبوون ، وە حەمزەی کوڕی عەبدول موتتەڵیبو ، زەیدی کوڕی حاریسـەو ، ئـەبو کەبشـەو ئەنەسـە ، کـە هەردووکیـان کۆیلـەی ئـازادکراوی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون ، هەر چواریان بەیەکەوە نۆرەیان لە حوشتـرێك دەکـرد ، وە ئـەبو بـەکرو عومـەرو عەبـدوڕڕەحمانی کـوڕی عـەوف ، نۆرەیـان لـە حوشتـرێك دەکرد (خـوا لە هەموویان ڕازی بـێ) ، وە پێغـەمبـەر ﷺ قەیسی کوڕی صەعصـەعە بەنی مازنی بەنی نەججاڕی کردە بەرپرسی کۆتـایی سوپا (چونکە هەموو سـوپایەك

چـوار فەرمانـدەی هـەبوون ، هـی پێشـەوەو هـی دواوەو، هـی لای ڕاسـتو هـی لای چەپ) ، وە ئالای پشـتیوانەکان بە دەستی سەعدی کوڕی موعـازەوە بوو.

٦ / ﴿فَسَلَكَ طَرِيقَهُ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ ، لَقُوا رَجُلاً مِنَ الأَعْرَابِ ، فَسَأَلُوهُ عَنْ النَّاسِ؟ فَلَمْ يَجِدُوا عِنْدَهُ خَبَرَاً ، فَقَالَ لَهُ النَّاسُ : سَلِّمْ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ : أَوَفِيكُمْ رَسُولُ اللهِ ؟ قَالُوا : نَعَمْ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ ، ثُمّ قَالَ : إِنْ كُنْتَ رَسُولَ اللّهِ ! فَأَخْبِرْنِي عَمّا فِي بَطْنِ نَاقَتِي هَذِهِ ؟ قَالَ لَهُ سَلَمَةُ بْنُ سَلامَةَ بْنِ وَقَشٍ : لا تَسْأَلْ رَسُولَ اللّهِ ﷺ وَأَقْبِلْ عَلَيّ فَأَنَا أُخْبِرُكَ عَنْ ذَلِكَ : نَزَوْتَ عَلَيْهَا ، فَفِي بَطْنِهَا مِنْكَ سَخْلَةٌ ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : مَهْ ، أَفْحَشْتَ عَلَى الرّجُلِ ؟! ثُمّ أَعْرَضَ عَنْ سَلَمَةَ﴾ .

واتـە : پێغـەمبـەری خـوا ﷺ لە مەدینـەوە بەرەو مەککـە بـە ڕێکـەوت ، لـە ڕێگـا تووشـی پیاوێکـی خێڵەکی بـوون ، پرسـیاریان لێکـرد دەربـارەی هەواڵـی خـەڵك هـیچ هـەواڵێکی لـەلا نـەبوو (واتـە : لێیـان پرسـی : ئایـا کـاروان بـەرەو کـوێ چـووە ؟ ئایـا قوڕەیشـییەکان هـەڵوێستیان چییـە ؟).

ئنجـا هـاوەڵان پێیـان گـوت : سـەلام لـە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بکـە ، ئـەویش گـوتی : بۆچی پێغـەمبـەری خواتـان لـە نێـودا هەیـە ؟ (دیارە بـە سەرسـووڕمانو نکـوولّیـی لێکردنـەوە وای گـوتوە) ئـەوانیش گوتیـان : بەڵـێ ، هەیـە ، سـەلامی لـێ بکە ، ئەویش ڕووی لە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ کـردو گوتی : ئەگەر تـۆ پێغەمبـەری خـوای ، هەواڵـم پێبـدە ، ئـەم حوشتـرە مێیـەی مـن چـی لـە سکـدایە ؟ (دیـارە حوشتـرەکەی ئـاوس بـووە) یەکێك لە هاوەڵان بە نـاوی سـەلەمەی کـوڕی سـەلامەی کوڕی وەقەش گوتی : پرسیار لە پێغەمبـەری خـوا مەکـە ، ڕوو لـە مـن بکـە ، مـن هەواڵت پێـدەدەم : تـۆ خـۆت سـواری حوشتـرەکـەت بـووی (لەگـەڵی جـووت بـووی) ئنجـا ئـەوەی کـە لـە سـکی دایـە ، نوتفەیەکـە لـە تـۆ ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی : ﴿مَهْ ، أَفْحَشْتَ عَلَى الرّجُلِ ؟! ثُمّ أَعْرَضَ عَنْ سَلَمَةَ﴾ ، واتـە : بێدەنگ بە ، قسەی نـاشیرینت بەو کابرایـە گـوت ، دوایـی پشتی لـە سـەلـەمە کـرد ، واتـە : ڕەخنەی لێگرتو لێی تووڕە بوو .

٧ / ﴿وأَتَاهُ الْخَبَرُ عَنْ قُرَيْشٍ بِمَسِيرِهِمْ لِيَمْنَعُوا عِيرَهُمْ ، فَاسْتَشَارَ النَاسَ ، وَأَخْبَرَهُمْ خَبَرَ قُرَيْشٍ ، فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ، فَقَالَ وَأَحْسَنُ ، ثُمّ قَامَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ، فَقَالَ وَأَحْسَنُ ، ثُمّ قَامَ الْمِقْدَادُ بْنُ عَمْرٍو فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللهِ ! امْضِ لِمَا أَرَاكَ اللهُ فَنَحْنُ مَعَكَ ، وَاللهِ لا نَقُولُ لَكَ ، كَمَا قَالَتْ بَنُو إِسرائِيلَ لِمُوسَى : ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ المائدة ، وَلَكِنْ اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبّكَ فَقَاتِلا إِنا مَعَكُمَا مُقَاتِلُونَ ، فَوَالّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقّ لَوْ سِرتَ بِنا إِلَى بِرْكِ الْغِمَادِ لَجالَدْنا مَعَكَ مِنْ دُونِهِ حَتّى تَبْلُغَهُ ، فَقَالَ لَهُ رَسولُ اللّهِ ﷺ : خَيْرَاً ، وَدَعَا لَهُ بِهِ﴾ .

واتە : وە پاشان هەواڵ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات ، کە قورەیش بە رێکەوتوون ، بۆ ئەوەی پارێزگاریی لە کاروانەکەیان بکەن ، پێغەمبەری خواش ﷺ راوێژی بە خەڵك کرد ، وە هەواڵی پێدان : کە سوپای قورەیش هاتوە ، ئەبو بەکری صیددیق خوا لێی رازی بێ ، هەڵساو قسەی باشی کرد ، دوایی عومەری کوری خەتتاب هەڵساو قسەی باشی کرد ، دوایی میقدادی کوری عەمرٍ هەڵساو گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! ئەوەی کە خوا پێشانت دەداو پێت چاکە برۆ ، ئێمەش لە خزمەتت داین ، بە خوا ئێمە ئەوە بە جەنابت ناڵێین ، وەك بەنو ئیسرائیل بە مووسایان گوت : ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ المائدة ، واتە : برۆ لەگەڵ پەروەردگارت دا دژی دوژمن بجەنگە ، ئێمەش لێرە دانیشتووین .

بەڵکو ئێمە دەڵێین : تۆو پەروەرگارت بچن بجەنگن ، ئێمەش لە خزمەتتدا جەنگ دەکەین ، سوێند بەوەی کە تۆی بە هەق ناردوە ، ئەگەر هەتا (بِرْكِ الْغِمَادِ) (وا دیارە شوێنێکی دوور بووە لە مەدینەوە) بڕۆی ، ئێمەش بە شمشێرەکانمانەوە رێت بۆ دەکەینەوە تا دەگەیە ئەوێ ، پێغەمبەری خواش ﷺ ، قسەی باشی بۆ کردن ، وە بەهۆی ئەوەوە دوعای خێری بۆ کردن .

٨ / ﴿ثُمّ قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ : أَشيرُوا علَيّ أَيّها الناس ، وَإنّمَا يُريدُ الأَنْصَارَ ، وَذَلِكَ أَنَهُمْ عَدَدُ الناسِ وَأَنّهُمْ حِينَ بَايَعُوهُ بِالْعَقَبَةِ قَالُوا : يَا رَسولَ اللهِ ! إنا بُرَآءٌ مِنْ ذِمَامِك حَتّى تَصِلَ إلَى دِيَارِنا ، فَإِذَا وَصَلْتَ إلَيْنا ، فَأَنْتَ فِي ذِمّتِنا ، نَمْنَعُكَ مِمّا نَمْنَعُ مِنْهُ أَبْنَاءَنا وَنِسَاءَنا ، فَكانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَتَخَوّفُ أَلاّ تَكُونَ الأَنْصَارُ تَرَى عَلَيْها نَصْرَهُ إلاَّ مِمّنْ دَهَمَهُ بِالْمَدِينَةِ ، مِنْ عَدُوّهِ ، وَأَنْ لَيْسَ عَلَيْهِمْ أَنْ يَسِيرَ بِهِمْ إلَى عَدُوّ مِنْ بِلادِهِمْ ، فَلَمّا قَالَ ذَلِكَ رَسولُ اللهِ ﷺ قَالَ لَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ : وَاللهِ لَكَانّك تُرِيدُنا يَا رَسولَ اللّهِ ؟ قَالَ : أَجَلْ ، قَالَ : فَقَدْ آمَنّا بِك وَصَدّقْنَاك ، وَشَهِدْنا أَنّ مَا جِئْتَ بِهِ هُوَ الْحَقّ ، وَأَعْطَيْنَاك عَلَى ذَلِكَ عُهُودَنا وَمَوَاثِيقَنا ، عَلَى السَّمْعِ وَالطّاعَةِ ، فَامْضِ يَا رَسولَ اللهِ لِمَا أَرَدْتَ ، فَنَحْنُ مَعَك ، فَوَالّذِي بَعَثَك بِالْحَقّ لَوْ اسْتَعْرَضْتَ بِنا هَذَا الْبَحْرَ ، فَخُضْتَهُ لَخُضْنَاهُ مَعَك ، مَا تَخَلّفَ مِنا رَجُلٌ وَاحِدٌ ، وَمَا نَكْرَهُ أَنْ تَلْقَى بِنا عَدُوّنا غَداً ، إنا لَصُبُرٌ فِي الْحَرْبِ ، صُدُقٌ فِي اللّقَاءِ ، لَعَلّ اللّهَ يُرِيك مِنا مَا تَقَرُّ بِهِ عَيْنُك ، فَسِرْ بِنا عَلَى بَرَكَةِ اللّهِ ، فَسُرّ رَسولُ اللهِ ﷺ بِقَوْلِ سَعْدٍ وَنَشّطَهُ ذَلِكَ ، ثُمّ قَالَ سِيرُوا وَأَبْشِرُوا ، فَإِنّ اللهَ تَعَالَى قَدْ وَعَدَنِي إحْدَى الطّائِفَتَيْنِ ، وَاَللّهِ لَكَانّي الآنَ أَنْظُرُ إلَى مَصَارِعِ الْقَوْمِ﴾ .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی خەڵکینە ! ڕاوێژتان پێدەکەم ، چی بکەین ؟ وە مەبەستیشی لە خەڵکەکە پشتیوانەکان بوو ، چونکە ئەوان زۆربە بوون {کۆچکەرەکان نیزیکەی هەشتا کەسێك بوون ، ئەوانی دی لەو سێ سەدو چواردە ، یان سێ سەدو نۆزدە کەسە ، هەموویان لە پشتیوانان بوون خوا لە هەموویان ڕازی بێ}، ئەویش لەبەر ئەوەی کاتێك لە لای عەقەبە (واتە : ئەوانەی کە پەیمانی دووەمی عەقەبەیان لەگەڵ بەستبوو) گوتبوویان : ئێمە ناچینە ژێر باری بەرپرسیاریەتی ئەو پەیمانەوە ، تاکو نەیەی بۆ شارەکەمان (واتە : مەدینە) ، کە هاتی ئەو پەیمانەمان لە ئەستۆ دایە ، وە هەر شتێك کە کوڕەکانمان و ئافرەتەکانی خۆمانی لێ دەپارێزین ، تۆشی لێ دەپارێزین ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ مەترسیی ئەوەی هەبوو ، کە پشتیوانەکان خۆیان بە پابەند نەزانن بە پەیمانەکەیەوە ، کە لە دەرەوەی شاری مەدینە بەرگریی لێ بکەن ، چونکە کاتی خۆی پێیان گوتبوو ، تەنیا کاتێك بەرگرییت لێ دەکەین ، ئەگەر دوژمنێك بەسەر مەدینەدا بدات .

ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چەند جارێك ئەو فەرمایشتەی دووبارە کردەوە ، سەعدی کوڕی موعاز (کە سەرۆکی هۆزی ئەوس بوو) گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! وادیارە مەبەستت پێی ئێمەیە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، سەعد خوا لێی ڕازی بێ گوتی : ئێمە بڕوامان بە تۆ هێناوە ، وە تۆمان بە ڕاست زانیوە ، وە شایەدییمان داوە لەسەر ئەوە کە ئەوەی تۆ هێناوتە ، هەقە ، وە لەسەر ئەوە پەیمانمان لەگەڵ بەستووی کە گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەرییت بۆ بکەین ، ئێستاش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! بڕۆ بەرەو ئەو شوێنەی کە دەتەوێ ، وە ئێمە لە خزمەتت داین ، سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە هەق ناردوە ، ئەگەر فەرمانمان پێ بکەی بچینە نێو ئەم دەریایە (ئاماژەی کرد بۆ دەریای سوور) بچیە نێوی ، ئێمەش لەگەڵ تۆ دەچینە نێوی ، یەك کەس لە ئێمە دوا ناکەوێ ، وە پێشمان ناخۆش نیە بە گژ دوژمنماندا بکەی ، ئێمە لە جەنگدا خۆڕاگرین ، وە ڕاستگۆین ، وە ڕەنگە پەروەردگارت لەوبارەوە شتێکت پێشان بدا کە مایەی دڵخۆشییت بێ ، بڕۆ پێشمان بکەوە لەسەر بەرەکەتی خوا ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە قسەی سەعد زۆر دڵخۆش بوو ، وە فەرمووی : بڕۆن بەرەو پێش ، چونکە خوای بەرز بەڵێنی پێدوام کە یەکێك لە دوو کۆمەڵەکانمان بکاتە دەستکەوت ، سوێند بە خوا ئێستا وەك ئەوەی تەماشای ئەو شوێنانە بکەم ، کە دوژمنەکان لێی دەکوژرێن ، لە کاتێکدا کە ڕووبەڕوومان دەبنەوە .

لێرەدا پێم باشە هەڵوەستەیەك بکەین : ئەویش ئەوەیە کە سەعدی کوڕی موعاز کە سەرۆکی هۆزی ئەوس بووە ، هەتا ئەبو بەکرو عومەرو میقداد خوا لێیان ڕازی بێ قسەیان نەکردوە ، لە کاتێکدا کە ئەوان هەموو کۆچکەر بوون ، ئەو قسەی نەکردوە ، بەلام دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دووبارەی کردۆتەوە ، گوتوویەتی : مەبەستت پێی ئێمەیە ؟ ئنجا قسەی کردوە ، بۆچی ؟

ئەوانە خوا لێیان ڕازی قەدری یەکدییان زانیوە ، بۆ وێنە زانیویانە کە دوو وەزیرەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەبو بەکرو عومەر زیاتر شایستەی ئەوە بوون کە قسان بکەن ، لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژ دەکات ، بۆ ئەوەی ڕای خۆیان دەرببڕن بە ناوی هەموانەوە ، دوایی کە زانیویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی ئەوانە ، ئنجا قسەی کردوە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ

مسوڵمانان لە نێو خۆیاندا گەورەو بچووکییان هەبێ ، وە ڕێز لە یەکدی بگرن ، وە هەر کەسە شوێنی خۆی بزانێ ، وە لە کاتێکیش دا کە پێویست بکات ڕای خۆی دەرببڕێ ، دەریبڕێ ، بەڵام ئەگەر کەسی لەو لە پێشتر هەبێ ، با بۆ وی لێی بگەڕێ ، باشە ، هەڵبەتە ئەو حیکمەتەش هەموو کەس نایدرێتێ ، خوای بەخشەر لە حیکمەتو صەبرو سەلیقە بەشی باشمان پێ ببەخشێ .

٩ / ﴿ثُمّ ارْتَحَلَ رَسولُ اللهِ ﷺ فَركِبَ هُوَ وَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحابِهِ (هُوَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدّيقُ) حَتّى وَقَفَ عَلَى شيخٍ مِنَ الْعَرَبِ ، فَسَأَلَهُ عَنْ قُرَيْشٍ ، وَعَنْ مُحَمَّدٍ وَأَصْحَابِهِ وَمَا بَلَغَهُ عَنْهُمْ ؟ فَقَالَ الشيخُ : لاَ أُخْبِرُكُمَا ، حَتّى تُخْبِرَانِي مِمّنْ أَنْتُمَا ؟ فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ : إذَا أَخْبَرْتَنا أَخْبَرْناك ، قَالَ أَذَاكَ بِذَاكَ؟ قَالَ : نَعَمْ ، قَالَ الشيخُ : فَإِنّهُ بَلَغَنِي أَنّ مُحَمّداً وَأَصْحَابَهُ خَرَجُوا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا ، فَإِنْ كانَ صَدَقَ الّذِي أَخْبَرَنِي ، فَهُمْ الْيَوْمَ بِمكانِ كَذَا وَكَذَا ، لِلْمَكانِ الّذِي بِهِ رَسولُ اللهِ ﷺ وَبَلَغَنِي أَنّ قُرَيْشا خَرَجُوا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا ، فَإِنْ كانَ الّذِي أَخْبَرَنِي صَدَقَنِي ، فَهُمْ الْيَوْمَ بِمكانِ كَذَا وَكَذَا ، لِلْمَكانِ الَّذِي فِيهِ قُرَيْشٌ ، فَلَمّا فَرَغَ مِنْ خَبَرِهِ ، قَالَ مِمّنْ أَنْتُمَا ؟ فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ نَحْنُ مِنْ مَاءٍ ، ثُمّ انْصَرَفَ عَنْهُ قَالَ يَقُولُ : الشيخُ مَا مِنْ مَاءٍ ، أَمِنْ مَاءِ الْعِرَاقِ؟ قَالَ ابْنُ هِشامٍ : يُقَالُ ذَلِكَ الشيخُ سُفْيَانُ الضّمَرِيّ) .

واتە : ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ یەکێك لە هاوەڵانی کە ئەبو بەکری صیددیقە خوا لێی ڕازی بێ ، ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە پیاوێکی بە تەمەنی عەرەب (واتە : بیابان نشین بووە ، یان نەناسراو بوو) پرسیاری لێکرد دەربارەی قورەیش ، گوتی : چ هەواڵێك دەزانی دەربارەی ئەو سوپایەی قورەیش کە هاتوە ؟ وە دەربارەی موحەممەدو هاوەڵانی ؟ پیاوە بە تەمەنەکە گوتی : هەواڵتان پێنادەم ، هەتا ئێوە هەواڵم پێنەدەن ، کێن ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەر کاتێك تۆ ئەو هەواڵەی لەلاتە ، بە ئێمەتدا ، ئێمەش پێت دەڵێین ئێمە کێین ؟ گوتی : ئایا ئەوە لە بەرانبەر ئەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، کابرا بەتەمەنەکە گوتی : پێمگەیشتوە کە موحەممەدو هاوەڵانی ، فلان ڕۆژەو فلان ڕۆژە لە مەدینە دەرچوون ، ئەگەر ئەوەی کە هەواڵەکەی پێداوم ڕاستی کردبێ ، ئەوان ئێستا لە

فلان شوێن و فلان شوێنن ، (لەو شوێنەی کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لێی بوون) وە ئەو هەواڵەشم پێگەیشتوە کە قورەیشییەکان ، فلان ڕۆژەو فلان ڕۆژە دەرچوو ون ، ئەگەر ئەو کەسەی هەواڵەکەی پێداوم ، ڕاستی کردبێ ، ئەوە ئەمڕۆ ئەوان لە فلان شوێنەن (ئەو شوێنەی کە ئەو کاتە قوریشی لێ بوو) کاتێك کابرا هەواڵەکەی خۆی پێدان ، گوتی : ئنجا ئایا ئێوە کێن ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : {نَحْنُ مِنْ مَاءٍ} ئێمە لە ئاوین ، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت ، وە کابرا لەبەر خۆیەوە گوتی : (مَا مِنْ مَاءٍ ، أَمِنْ مَاءِ الْعِرَاقِ؟) ، واتە: یانی چی لە ئاوین ، ئایا لە ئاوی عیراقن ؟ دیارە (مَاء) یانی : ئاو ، ئنجا ئایا ناوی هۆزێك بووە ، یان ناوی شوێنێك بووە ، یاخود مەبەست ئاوی ڕووبارو دیجلەو فورات بووە کە لە عیراق هەن ، بەڵام بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی ئەوە بووە ، کە ئێمە لە ئاو دروستکراوین.

کە دیارە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبای : من پێغەمبەری خوام و ئەوەش ئەبو بەکرەو هاتووین... ، ئەوە ئاشکرا دەبوون ، بۆیە شتێکی فەرمووە کە ڕاستیش بووەو زیانیشی نەبووە .

١٠ / ﴿ثُمّ رَجَعَ رَسولُ اللهِ ﷺ إلَى أَصْحَابِهِ ، فَلَمَّا أَمْسَى بَعَثَ عَلِيّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَالزّبَيْرِ بْنَ الْعَوّامِ ، وَسَعْدَ بْنَ أَبِي وَقّاصٍ ، فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ إلَى مَاءِ بَدْرٍ ، يَلْتَمِسُونَ الْخَبَرَ لَهُ عَلَيْهِ (كَمَا حَدّثَنِي يَزِيدُ بْنُ رُومَانَ ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزّبَيْرِ) فَأَصَابُوا رَاوِيَةً لِقُرَيْشٍ فِيهَا أَسْلَمُ ، غُلامُ بَنِي الْحَجاجِ ، وَعَرِيضٌ أَبُو يَسَارٍ ، غُلامُ بَنِي الْعَاصِ بْنِ سَعِيدٍ ، فَأَتَوْا بِهِمَا ، فَسَأَلُوهُمَا ، وَرَسولُ اللهِ ﷺ قَائِمٌ يُصَلّي ، فَقَالا : نَحْنُ سُقَاةُ قُرَيْشٍ ، بَعَثُونَا نَسْقِيهِمْ مِنْ الْمَاءِ ، فَكَرِهَ الْقَوْمُ خَبَرَهُمَا ، وَرَجَوْا أَنْ يَكُونَا لأَبِي سُفْيَانَ ، فَضَرَبُوهُمَا ، فَلَمّا أَذْلَقُوهُمَا قَالاَ : نَحْنُ لأَبِي سُفْيَانَ ، فَتَرَكُوهُمَا ، وَرَكَعَ رَسولُ اللهِ ﷺ وَسَجَدَ سَجْدَتَيْهِ ثُمّ سَلّمَ﴾ .

واتە : دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵانی ، وە کاتێك ئێوارەدا هات ، عەلی کوڕی ئەبی طالیبو زوبێری کوڕی عەوامو سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە لە هاوەڵانی ناردن ، بۆ سەر کانیو سەرچاوەی بەدر ، بۆ ئەوەی بزانێ هەواڵ چییە ؟ ئنجا یەزیدی کوڕی رومان لە

عورِوەی کوڕی زوبێرەوە دەگێڕێتەوە کە عەلیو زوبێرو سەعد خوا لە هەموویان ڕازی بێ ، ولاخێکی ئاوبەریان لەوێ بینی ، کە هی قورەیش بوو ، لەگەڵ دوو غولامان ، وە ولاخەکەو دوو غولامەکەیان هێنان ، وە پرسیاریان لێکردن ، وە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد ، گوتیان : ئێوە کێن ؟ گوتیان : ئێمە ئاوبەری قورەیشییەکانین ، ئاویان بۆ دەبەین ، ئەوانەی پرسیاریان دەکرد ، ئەو هەواڵەیان پێ ناخۆش بوو ، ئومێدیان وا بوو بڵێن : ئێمە ئاوبەری ئەبو سوفیانین ، تاکو کاروانەکەیان لێ نیزیك بێ ، بۆیە لێیان دان ، تاکو ئێشیان پێگەیاندن ، بۆ ئەوەی ڕاستیی بلێن ، هەتا گوتیان : ئێمە ئاوبەری ئەبو سوفیانین ، ئنجا وازیان لێ هێنان ، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ڕکووعو دوایی سەجدەی بردو پاشان سەلامی دایەوە ، دوایی فەرمووی : ﴿إِذَا صَدَقَاكُمْ ضَرَبْتُمُوهُمَا ، وَإِذَا كَذَبَاكُمْ تَرَكْتُمُوهُمَا ، صَدَقَا ، وَاللهِ إِنَّهُمَا لِقُرَيْشٍ ، أَخْبِرَانِي عَنْ قُرَيْشٍ؟ قَالا : هُمْ وَاللّهِ وَرَاءَ هَذَا الْكَثِيبِ الّذِي تُرَى بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَى (وَالْكَثِيبُ الْعَقَنْقَلُ) فَقَالَ لَهُمَا رَسولُ اللهِ ﷺ : كَمْ الْقَوْمُ ؟ قَالا : كَثِيرٌ ، قَالَ مَا عِدّتُهُمْ؟ قَالا : لا نَدْرِي ، قَالَ : كَمْ يَنْحَرُونَ كُلّ يَوْمٍ ؟ قَالا : يَوْمًا تِسْعًا ، وَيَوْمًا عَشْرًا ، فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ : الْقَوْمُ فِيمَا بَيْنَ التّسْعمائَةِ وَالأَلْفِ ، ثُمّ قَالَ لَهُمَا : فَمَنْ فِيهِمْ مِنْ أَشْرَافِ قُرَيْشٍ ؟ قَالا : عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَأَبُو الْبَخْتَرِيّ بْنُ هِشَامٍ ، وَحَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ ، وَنَوْفَلُ بْنُ خُوَيْلِدٍ ، وَالْحَارِثُ بْنُ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلٍ ، وَطُعَيْمَةُ بْنُ عَدِيّ بْنِ نَوْفَلٍ ، وَالنّضْرُ بْنُ الْحَارِثِ ، وَزَمَعَةُ بْنُ الأَسْوَدِ ، وَأَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ ، وَأُمَيّةُ بْنُ خَلَفٍ ، وَنُبَيْهٌ وَمُنَبّهٌ ابْنَا الْحَجّاجِ ، وَسُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو ، وَعَمْرُو بْنُ عَبْدِ وُدّ ، فَأَقْبَلَ رَسولُ اللهِ ﷺ عَلَى النّاسِ ، فَقَالَ : هَذِهِ مَكّةُ قَدْ أَلْقَتْ إِلَيْكُمْ أَفْلاذَ كَبِدِهَا﴾ .

واتە : کاتێك ڕاستیان دەکرد ، لێتان دەدان ، وە کاتێك درۆیان لەگەڵدا کردن ، وازتان لێ هێنان ، بە خوا ڕاست دەکەن ئەوانە ئاوبەری قورەیشییەکانن ، ئنجا ڕووی لەو دوو غولامە کردو فەرمووی : دەربارەی سوپای قورەیش هەواڵم پێبدەن ؟ گوتیان : لە پشت ئەم تەپۆلکەیەوەن ، کە دەبینرێ لە لای کەناری قەدپاڵی دوورتر لە مەدینە ، {(الْكَثِيبِ)یش: واتە : دۆڵێکی فراوان ، یان تەپۆڵکەیەکی لمی تێکەڵ} ، وە لێی پرسین : ژمارەیان چەندە ؟ گوتیان : زۆرن ،

گوتی : چەندن (بە ژمارە) گوتیان : نازانین ، فەرمووی : ڕۆژانە چەند حوشتر سەردەبڕن ؟ گوتیان : ڕۆژی وا هەیە نۆ ، ڕۆژی وا هەیە دە ، فەرمووی : کەواتە : ئەو کۆمەڵە دەوری نۆ سەد تاکو هەزار کەس دەبن ، دوایی بەو دوو غولامەی فەرموو : لە ناودارانی قوڕەیش کێ لە نێو ئەو سوپایەدا هەیە ؟ ئەوانیش ئەو ناوانەیان گوتن : (عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَشيبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَأَبُو الْبَخْتَرِيّ بْنُ هِشَامٍ ، وَحَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ ، وَنَوْفَلُ بْنُ خُوَيْلِدٍ ، وَالْحَارِثُ بْنُ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلٍ ، وَطُعَيْمَةُ بْنُ عَدِيّ بْنِ نَوْفَلٍ ، وَالنّضْرُ بْنِ الْحَارِثِ ، وَزَمَعَةُ بْنُ الأَسْوَدِ ، وَأَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ ، وَأُمَيّةُ بْنُ خَلَفٍ ، وَنُبَيْهُ وَمُنَبّهٌ ابْنَا الْحَجَاجِ ، وَسُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو ، وَعَمْرُو بْنُ عَبْدِ وُدّ) ، پێغەمبەر ﷺیش ڕووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی : ئەوە مەککەیە ! جگەر گۆشەکانی خۆی بۆ ئێوە فڕێداوەتە ئێرە ، واتە : هەرچی ناوداریانن ، لێرەن .

١١ / ﴿وَأَقْبَلَ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ حَتّى تَقَدّمَ الْعِيرَ حَذِرًا ، حَتّى وَرَدَ الْمَاءَ فَقَالَ : لِمَجْدِيّ بْنِ عَمْرٍو : هَلْ أَحْسَسْتَ أَحَدًا ، فَقَالَ مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أُنْكِرُهُ إلاّ أَنّي قَدْ رَأَيْتُ رَاكِبَيْنِ قَدْ أَنَاخَا إلَى هَذَا التّلّ ، ثُمَّ اسْتَقَيَا فِي شَنّ لَهُمَا ، ثُمّ انْطَلَقَا ، فَأَتَى أَبُو سُفْيَانَ مُنَاخَهُمَا ، فَأَخَذَ مِنْ أَبْعَارِ بَعِيرَيْهِمَا ، فَفَتّهُ ، فَإِذَا فِيهِ النّوَى ، فَقَالَ : هَذِهِ وَاللهِ عَلائِفُ يَثْرِبَ ، فَرَجَعَ إلَى أَصْحَابِهِ سَرِيعًا ، فَضَرَبَ وَجْهَ عِيرِهِ عَنْ الطّرِيقِ فَسَاحَلَ بِهَا ، وَتَرَكَ بَدْرًا بِيَسَارٍ وَانْطَلَقَ حَتّى أَسْرَعَ﴾ .

واتە : ئەبو سوفیانی کوڕی حەربیش ڕۆیشت تاکو چووە سەر ئاوی بەدر ، ئنجا بە مەجدیی کوڕی عەمری گوت : ئایا هەستت بە هیچ کردوە ؟ گوتی : کەسم نەبینیوە کە نامۆ بێ ، بەڵام دوو سوارم بینین لە لای ئەم گردە ، حوشترەکەی خۆیان یەخ دابوو ، دوایی کوندەکەی خۆیان پڕ ئاو کردو ڕۆیشتن ، ئەبو سوفیان چوو بۆ ئەو شوێنەی کە حوشترەکەیان لێ یەخ بوو ، وە لە شیاکەی حوشترەکەی هەڵگرتو بە دەستی پرواندی ، نێوکەی خورمای تێدا بینی ، گوتی : سوێند بە خوا ، ئەمە نێوکە خورمای مەدینەیە ، بۆیە بە خێرایی گەڕایەوە بۆ لای کاروانەکە ، وە کاروانەکەی لە ڕێ لادا ، وە بەرەو لای دەریای سووری برد ، وە بەدری لە لای دەستە چەپی خۆی بەجێ هێشت ، وە بە خێرایی ڕۆیشت .

١٢ / ﴿وَأَقْبَلَتْ قُرَيْشٌ ، فَلَمّا نَزَلُوا الْجُحْفَةَ ، رَأَى جُهَيْمُ بْنُ الصّلْتِ ابْنِ مَخْرَمَةَ بْنِ الْمُطّلِبِ بْنِ عَبْدِ مَنافٍ رُؤْيَا ، فَقَالَ : إِنّي رَأَيْتُ فِيمَا يَرَى النَائِمُ وَإِنّي لَبَيْنَ النائِمِ وَالْيَقِظَانِ ، إِذْ نَظَرْتُ إِلَى رَجُلٍ قَدْ أَقْبَلَ عَلَى فَرَسٍ ، حَتّى وَقَفَ وَمَعَهُ بَعِيرٌ لَهُ ، ثُمّ قَالَ : قُتِلَ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَشَيبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَأَبُو الْحَكَمِ بْنُ هِشَامٍ ، وَأُمَيّةُ بْنُ خَلَفٍ ، وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ ، فَعَدّدَ رِجالاً مِمّنْ قُتِلَ يَوْمَ بَدْرٍ ، مِنْ أَشْرَافِ قُرَيْشٍ ، ثُمَّ رَأَيْتُهُ ضَرَبَ فِي لَبّةِ بَعِيرِهِ ثُمّ أَرْسَلَهُ فِي الْعَسْكَرِ ، فَمَا بَقِيَ خِبَاءٌ مِنْ أَخْبِيَةِ الْعَسْكَرِ إِلاَّ أَصابَهُ نَضْحٌ مِنْ دَمِهِ ، قالَ : فَبَلَغْتَ أَبَا جَهْلٍ ، فَقَالَ : وَهَذَا أَيْضًا نَبِيّ آخَرُ مِنْ بَنِي الْمُطّلِبِ ، سَيَعْلَمُ غَدًا مَنْ الْمَقْتُولُ إِنْ نَحْنُ الْتَقَيْنا ؟﴾ .

واتە : وە قورەیش هاتن بە سەرکردایەتیی ئەبو جەهل (کە ناوی عەمری کوڕی هیشام بووە ، وە کونیەکەی ئەبولحەکەم بووە) ، وە لە جوحفە مەنزڵیان گرت ، لەوێ جوهەیمی کوڕی صەڵتی کوڕی مەخزوومی کوڕی موتتەڵیبی کوڕی عەبدولمەناف خەونێکی بینی ، گوتی : خەونم بینی ، وەك چۆن کەسی نووستوو خەون دەبینێ ، وە من لە نێوان خەوتوویی و بێداریی دا بووم ، بینیم پیاوێك بە سواری ئەسپێك هات ، تاکو وەستا ، وە حوشترێکی پێبوو ، دوایی ئەو کابرایە هاواری کردو گوتی : عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کوژرا ، شەیبەی کوڕی ڕەبیعە کوژرا ، ئەبولحەکەم کوڕی هیشام کوژرا ، ئومەییەی کوڕی خەلەف کوژرا ، فلان و فلان کوژران ، وە ژمارەیەك لە پیاوان کە لە جەنگی بەدردا کوژران ، هەڵیدان ، (هەر لەسەر گێڕانەوەی خەونەکەی بەردەوام دەبێ ، دەڵێ :) دوایی بینیم لە گەردنی حوشترەکەیدا بۆ ئەوەی سەری ببڕێ ، وە هیچ چادرێك لە چادرەکانی سوپا نەما ، مەگەر خوێنی ئەو حوشترەی لێ پرژا .

ئنجا کاتێك هەواڵی ئەو خەونە بە ئەبو جەهل گەیشت ، گوتی : ئەوەش پێغەمبەرێکی دیکەیە لە بەنی عەبدول موتتەڵیب لێمان پەیدا بووە ! بەیانی کە پێکگەیشتین ، دەزانێ کێ کوژراوە ؟! (دیارە دوایی زانرا کێ کوژرا ؟ وە خەونەکەی کابرا زۆر ڕاست هاتە دی).

١٣ / ﴿وَلَمّا رَأَى أَبُو سُفْيَانَ أَنّهُ قَدْ أَحْرَزَ عِيرَهُ ، أَرْسَلَ إِلَى قُرَيْشٍ : إِنّكُمْ إِنّمَا خَرَجْتُمْ لِتَمْنَعُوا عِيرَكُمْ وَرِجالَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ ، فَقَدْ نَجاها اللهُ فَارْجِعُوا ، فَقَالَ أَبُو جَهْلِ بْنُ هِشامٍ : وَاللهِ لا نَرْجِعُ حَتّى نَرِدَ بَدْرًا (وَكانَ بَدْرٌ مَوْسِمًا مِنْ مَوَاسِمِ

الْعَرَبِ ، يَجْتَمِعُ لَهُمْ بِهِ سوقٌ كُلّ عَامٍ) فَنُقِيمُ عَلَيْهِ ثَلاثًا ، فَنَنْحَرُ الْجُزُرَ ، ونُطْعِمُ الطَّعام، ونَسْقي الخَمّرَ ، وتَعْزِفَ علينا القيان ، وتَسْمَعَ بنا الْعَرَبُ وَبِمَسِيرِنا وَجَمْعِنا ، فَلاَ يَزَالُونَ يَهابُونَنا أَبَدًا بَعْدَها ، فَامْضُوا﴾ .

واته : کاتێك ئەبو سوفیان زانی کە کاروانەکەی دەرباز کردوە ، وەڵامی نارد بۆ قورەیشییەکان کە ئێوە بۆیە دەرچوونو هاتوون تاکو کاروانەکەتانو ماڵو سامانەکانتانو پیاوەکانتان بپارێزن ، ئەوە خوا ئەوانەی هەموو دەرباز کردوە ، بۆیە بگەڕێنەوە ، (واتە : ئەو ئامانجەی بۆی هاتبوون هاتۆتە دی) ئەبو جەهلی کوڕی هیشام گوتی : سوێند بە خوا ناگەڕێینەوە ، تاکو نەچینە بەدر {ئنجا (إبن هشام) دەڵێ :} بەدر یەکێك بوو لە شوێنەکانی کۆبوونەوەی عەرەب ، کە لەوێ وەك بازاڕێك هەموو ساڵێك کۆدەبوونەوە ، کە ئەو کاتەش نیزیك بوو بۆوە ، (ئەبو جەهل گوتی : ) دەچینە سەر بەدر سێ ڕۆژان لەوێ دەبین : حوشتران سەردەبڕینو ، خواردن دەخۆینو خواردن دەدەین بە خەڵك ، وە شەراب دەخۆینەوەو دەیدەین بە خەڵك ، وە ئافرەتە کەنیزەکەکان دەبێ ئامێری گۆرانی گوتن بژەنن ، وە عەرەبەکان ئەو دەرچوونو ئەو کۆبوونەوەی ئێمە ببیستن ، بۆ ئەوەی هەتا هەتایە لێمان بترسن ، بڕۆن .

دیارە (البَغَوي) لە تەفسیرەکەی خۆی وەك دوایی باسی دەکەین ، دەربارەی ئەوە کە دەڵێ : خواردن دەخۆینو شەراب دەخۆینەوە ، ئنجا دەبێ گۆرانیو مۆسیقامان بۆ لێ بدرێ ، دەڵێ : ڕاست بوو چوون ، بەڵام لە جیاتی ئەوەی شەراب بخۆنەوە ، پەرداخی مەرگیان خواردەوە ، وە لە جیاتی ئەوەی گۆرانیان بۆ بگوترێو مۆسیقایان بۆ لێ بدرێ ، خەڵکیان بۆ گریاو شینیان لەسەر کرا ! دیارە ئینسان کە زۆر لە خۆیی بایی بوو ، پێچەوانەی ئەوەی داوای دەکات ، بۆی دێتە دی !

١٤ / ﴿وَمَضَتْ قُرَيْشٌ حَتَّى نَزَلُوا بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَى مِنَ الْوَادِي ، خَلْفَ الْعَقَنْقَلِ وَبَطْنِ الْوَادِي ، وَهُوَ يَلَيْلُ ، و نزل المسلمون بَيْنَ بَدْرٍ وَبَيْنَ الْعَقَنْقَلِ ، الكثيب الذي خَلْفَه قُرَيْشٌ ، وَالْقُلُبُ بِبَدْرٍ فِي الْعُدْوَةِ الدّنْيَا مِنْ بَطْنِ يَلَيْلَ إِلَى الْمَدِينَةِ ، وَبَعَثَ اللّه السّمَاءَ وَكَانَ الْوَادِي دَهْسًا ، فَأَصَابَ رَسولَ اللّهِ ﷺ وَأَصْحَابَهُ مِنْهَا مَا

لَبّدَ لَهُمْ الأَرْضَ ، وَلَمْ يَمْنَعْهُمْ عَنْ السّيْرِ وَأَصَابَ قُرَيْشًا مِنْهَا ، مَا لَمْ يَقْدِرُوا عَلَى أَنْ يَرْتَحِلُوا مَعَهُ ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُبَادِرُهُمْ إِلَى السَّمَاءِ ، حَتّى إِذَا جَاءَ أَدْنَى مَاءٍ مِنْ بَدْرٍ ، نَزَلَ بِهِ﴾ .

واتە : وە قورەیشییەکان ڕۆیشتن تاکو لە (الْعُدْوَةِ الْقُصْوَى) ، واتە : لاپاڵی شیوێکی دوورتر لە مەدینەوە لە پشت عەقەنقەلەوە (کە ناوی تەپۆلکەیەکە لە لەم) دامەزران ، مسوڵمانانیش لە نێوان بەدرو عەقەنقەلدا ، (واتە : ئەو تەپۆلکەیەی کە قورەیشییەکان لە پشتیەوە بوون) وە ئەو ئاوانەی بەدریش لەلای لاپاڵی نیزیکر (الْعُدْوَةِ الدّنْيَا)ەوە بوون بەلای مەدینەدا ، {واتە : ئەو لا پاڵەی کە نیزیکترە ، دنیا (مُؤَنَّث)ی (أَدْنَى)یە} ، ئەوانیش لە وێ لە (بَطْنِ يَلَيْل) بارگەو بنەیان خست ، (واتە : بەرانبەر یەکدی) ، خوای پەروەردگاریش بارانی باراند ، ئەو شوێنەی کە مسوڵمانانی لێبوون ، شوێنێکی گوملاییو نەرم بوو ، هەتا وشك بوو ، مسوڵمانان پێیان لێ ڕۆدەچوو ، بەلام دوای ئەوەی باران باری ، پێیان لێی گیر دەبوو ، وە ڕێی ڕۆیشتنیشی لێ نەدەگرتن ، بەلام ئەو شوێنەی کە قورەیشییەکانی لێبوون ، توند بوو ، بەلام کە باران باری ، بوو بە قوڕو گوملاییو پێیانی تێ دەگیرا ، وە نەیاندەتوانی باش جووڵەی لێ بکەنو بێنە دەرو ، ڕێی لێ دەگرتن ، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستپێشخەریی کردو چووە لای ئاوەکەی بەدر ، هەتا گەیشتە نیزیکترین ئاوەوەو لەوێ بارگەو بنەی خست .

١٥ / ﴿أَنّ الْحُبَابَ بْنَ الْمُنْذِرِ بْنِ الْجَمُوحِ ، قَالَ : يَا رَسُولَ اللهِ ! أَرَأَيْتَ هَذَا الْمَنْزِلَ ، أَمَنْزِلٌ أَنْزَلَكَهُ اللهُ ، لَيْسَ لَنَا أَنْ نَتَقَدّمَهُ وَلا نَتَأَخّرَ عَنْهُ ، أَمْ هُوَ الرّأْيُ وَالْحَرْبُ وَالْمَكِيدَةُ ؟ قَالَ : بَلْ هُوَ الرّأْيُ وَالْحَرْبُ وَالْمَكِيدَةُ ؟ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللهِ ! فَإِنّ هَذَا لَيْسَ بِمَنْزِلٍ ، فَانْهَضْ بِالنّاسِ حَتّى نَاتِيَ أَدْنَى مَاءٍ مِنَ الْقَوْمِ ، فَنَنْزِلَهُ ، ثُمّ نُغَوّرُ مَا وَرَاءَهُ مِنَ الْقُلُبِ ، ثُمّ نَبْنِي عَلَيْهِ حَوْضًا فَنَمْلَؤُهُ مَاءً ، ثُمّ نُقَاتِلُ الْقَوْمَ فَنَشْرَبُ وَلا يَشْرَبُونَ ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ : لَقَدْ أَشَرْتَ بِالرّأْيِ ، فَنَهَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ النّاسِ ، فَسَارَ حَتّى إِذَا أَتَى أَدْنَى مَاءٍ مِنَ الْقَوْمِ ، نَزَلَ عَلَيْهِ ثُمّ أَمَرَ بِالْقُلُبِ فَغُوّرَتْ وَبَنَى حَوْضًا عَلَى الْقَلِيبِ الّذِي نَزَلَ عَلَيْهِ ، فَمُلِيءَ مَاءً ، ثُمّ قَذَفُوا فِيهِ الآنِيَةَ﴾ .

واتــە : گوتـوویــانە : یەكێــك لــە هــاوەڵان بــە نــاوی (الحُبَابَ بْنَ الْمُنْـذِرِ بْـنِ الْجَمُـوحِ) (شارەزای كـاروبـارو جەنگ بـووە) ، گـوتی : ئـەی پێغـەمبـەری خـوا ! ﷺ ئـەم مەنزڵگـایە كـە گرتووتـە ، ئایا ئەمـە مەنزڵگایەكــە خـوا تـۆی لـێرە دانـاوەو بۆمان نیـە ، نە لـێی پێش بكـەوین ، نـە لێی دوا بكـەوین ، یاخـود ئەمـە شـوێنێكـە بۆچوونی خۆتــەو جەنگـەو فێڵی جەنگـە ، فـەرمووی : بەڵكـو بۆچـوونی خۆمـەو ، جەنگەو فێڵ‌و تاكتیكی جەنگییە ، گوتی : ئەی پێغـەمبــەری خـوا ! ﷺ ئـەم شـوێنە بـاش نیــە ، خـەڵـك هەڵسـێنە بـا بچـین بـەرەو نیزیكتــرین ئــاو لـە سوپاكـەی دوژمنــەوە ، وە چاڵاییەكـانی دیكـە پـڕ بكـەینــەوە ، وە دوایـی گۆمــاوێكی گـەورە دروست دەكـەین‌و پـڕی دەكـەین لـە ئـاو ، وە ئێمـە كـە جەنـگ لـە دژی ئـەو كۆمەڵـە دەكـەین ، ئێمـە ئاومـان دەبـێ‌و ئـەوان ئاویـان نـابـێ ! پێغـەمبـەر ﷺ فـەرمووی : ڕایەكی جوانــت پێشـكـەش كرد ، بۆیە پێغـەمبـەر ﷺ هەڵسـا ، وە ئـەو خـەڵكـەش كـە لە خزمەتـی دا بوون ، لەگـەڵـی ڕۆیشــتن ، تاكـو گـەیشــتنە نیزیكــترین ئـاو لـە سوپاكــەی قوڕەیشــەوە ، نــەك دوورتــریــن ئــاو ، دوایــی فەرمــانی كــرد ئــەو چـاڵاییانـەی دیكـە هـەمووی پڕ كـرانـەوە ، وە لەسـەر ئـەو چاڵاییـانەی كـە بارگـەو بنــەی لــێ دامەزراندبوو ، حەوزێكی گـەورەی دروســت كـردو ، پـڕ كـرا لــە ئـاو ، وە دوایی قاپیـان تێهاوێشتن .

١٦ / ﴿قَالَ ابْنُ إِسْـحَاقَ : فَحَدّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْـرٍ أَنّـهُ حُـدّثَ أَنّ سَعْدَ بْنَ مُعَاذٍ قَـالَ : يَـا نَبِـيّ اللهِ ! أَلا نَبْنِـي لَـك عَرِيشـا تَكُونُ فِيـهِ ، وَنُعِدّ عِنْدَك رَكَـائِبَك ، ثُمّ نَلْقَـى عَدُوّنَـا ، فَإِنْ أَعَزّنَـا اللهُ وَأَظْهَرَنَـا عَلَـى عَدُوّنَـا ، كَـانَ ذَلِـكَ مَا أَحْبَبْنَـا ، وَإِنْ كَـانَتْ الأُخْرَى ، جَلَسْتَ عَلَى رَكَـائِبِك ، فَلَحِقْتَ بِمَنْ وَرَاءَنَـا ، فَقَدْ تَخَلّفَ عَنْك أَقْوَامٌ ، يَا نَبِيّ اللهِ ! مَا نَحْنُ بِأَشَدّ لَك حُبّا مِنْهُمْ ، وَلَوْ ظَنّوا أَنّك تَلْقَى حَرْبًا مَا تَخَلّفُوا عَنْك ، يَمْنَعُك اللّهُ بِهِمْ ، يُنَاصِحُونَكَ وَيُجَاهِدُونَ مَعَك ، فَأَثْنَى عَلَيْهِ رَسولُ اللهِ ﷺ خَيْرًا ، وَدَعَا لَهُ بِخَيْرِ ، ثُمّ بُنِيَ لِرَسولِ اللهِ ﷺ عَرِيشٌ فَكَانَ فِيهِ﴾ .

واتـە : ئیبنو ئیسحاق گوتوویـەتی : عەبـدوڵڵای كوڕی ئەبو بەكـر خـوا لـێی ڕازی بــێ گوتوویــەتی : لــە جـەنگــی بــەدردا ســەعدی كــوڕی موعــاز گــوتی : ئــەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ! ئایا كـەپرێكت بۆ دروست نەكـەین لـە ژێـری دابـی (یانــی :

لە کاتێکدا کە ئەوان سەرگەرمی جەنگن ، ئەویش لە شوێنێك بێ ، وەك چەقی قیادە) وە وڵاخیشت لەلا دابنێین ، دوایی ئێمە بگەینە دوژمنمان ، ئەگەر خوا ئێمەی سەر خست بەسەر دوژمنداو بەسەریاندا زاڵ بووین ، ئەوە ئەوەیە کە حەزمان کردوە ، وە ئەگەر پێچەوانەکەشی بوو (واتە : ئێمە تێشکاین) ئەوە تۆ بە سواری ئەو وڵاخە کە لە لات دەبەستریێتەوە ، دەچیەوە بۆ مەدینە ، چونکە لەوێش کۆمەڵێك ماون ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! ئێمە لەوان زیاتر تۆمان خۆشناوێ ، وە ئەگەر زانیبایان تووشی جەنگ دێی ، ئەوانیش دوا نەدەکەوتن ، بۆ ئەوەی خوا بەهۆی ئەوانەوە بەرگریی لە تۆ بکات ، وە دڵسۆزیی بۆ تۆ بنوێنن ، وە لە خزمەت تۆدا جەنگو جیهاد بکەن ، پێغەمبەری خواش ﷺ ستایشی کرد ، وە دوعای خێری بۆ کرد ، وە پاشان کەپرێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست کرا ، لەو کەپرەدا بووو ، {لەوێوە سەرپەرشتیی جەنگەکەی دەکرد} .

١٧ / ﴿وَقَدْ ارْتَحَلَتْ قُرَيْشٌ حِينَ أَصْبَحَتْ ، فَأَقْبَلَتْ ، فَلَمّا رَآها رَسولُ اللهِ ﷺ تَصَوّبَ مِنْ الْعَقَنْقَلِ (وَهُوَ الْكَثِيبُ الّذِي جاءُوا مِنْهُ إلَى الْوَادِي) قَالَ اللّهُمّ هَذِهِ قُرَيْشٌ قَدْ أَقْبَلَتْ بِخُيَلائِها وَفخْرِها ، تُحَادّك وَتُكَذّبُ رَسولَك ، اللّهُمّ ! فَنَصْرَك الّذِي وَعَدْتنِي ، اللّهُمّ أَحِنْهُمْ الْغَدَاةَ﴾ .

واتە : وە کاتێك کە سوپای قورەیش هات لە بەرەبەیاندا ، ڕوویان کردە ئەو شوێنە ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ کە بینینی لەو تەپۆلکەوە شۆڕ دەبنەوە کە پێی دەگوترا (عَقَنْقَل) ، فەرمووی : ﴿اللّهُمّ ! هَذِهِ قُرَيْشٌ قَدْ أَقْبَلَتْ بِخُيَلائِها وَفخْرِها ، تُحَادّك وَتُكَذّبُ رَسولَك ، اللّهُمّ ! فَنَصْرَك الّذِي وَعَدْتنِي ، اللّهُمّ ! أَحِنْهُمْ الْغَدَاةَ﴾ ، خوایە ! ئەمە قورەیشە ، بە فیزو کەشخەو خۆ بەزلگرییەوە هات ، دژایەتیی تۆ دەکات ، وە پێغەمبەرەکەی تۆ بە درۆ دەزانێ ، خوایە ! ئەو یارمەتییو سەرخستنەی کە بەڵێنت پێداوم ، بۆم بێنەدی ، خوایە ! ئەم بەیانیە (یان ئەمڕۆ) ئەوانە سەرشۆڕو زەبوون بکەو بیانشکێنە .

١٨ / ﴿وَقَدْ قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ (وَقَدْ) رَأَى عُتْبَةَ بْنُ رَبِيعَةَ فِي الْقَوْمِ عَلَى جَمَلٍ لَهُ أَحْمَرَ : إنْ يَكُنْ فِي أَحَدٍ مِنْ الْقَوْمِ خَيْرٌ ، فَعِنْدَ صَاحِبِ الْجَمَلِ الأَحْمَرِ ، إنْ يُطِيعُوهُ يَرْشُدُوا﴾ .

واتە : وە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی بینی لە نێو سوپایەکەدا ، سواری حوشترێکی سوور بوو بوو ، فەرمووی : ئەگەر لە نێو ئەو سوپایەدا کەسێك هەبێ خێرو چاکەیەکی لێ چاوەڕێ بکرێ ، خاوەنی حوشترە سوورەکەیە ، وە ئەگەر بە قسەی بکەن ڕێی ڕاست دەگرن ، {یانی : عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کە لە هەموویان بە تەمەنتر بووە ، ئامۆژگاریی کردوون کە ئەو جەنگە نەکەن ، وەك دوایی باسی دەکەین ، بەڵام دیارە ئەوان بەقسەیان نەکردوە ، بە تایبەتی ئەبو جەهل} .

١٩ / ﴿فَلَمّا نَزَلَ النـاسُ أَقْبَلَ نَفَرٌ مِنْ قُرَيْشٍ حَتّى وَرَدُوا حَوْضَ رَسولِ اللهِ ﷺ فِيهِمْ حَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ ، فَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ : دَعُوهُمْ ، فَمَا شَرِبَ مِنْهُ رَجُلٌ يَوْمَئِذٍ إلاّ قُتِلَ ، إلاّ مَا كَانَ مِنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ، فَإنّهُ لَمْ يُقْتَلْ ثُمّ أَسْلَمَ بَعْدَ ذَلِكَ فَحَسُنَ إسْلامُهُ ، فَكَانَ إذَا اجْتَهَدَ فِي يَمِينِهِ ، قَالَ : لا وَالّذِي نَجانِي مِنْ يَوْمِ بَدْرٍ﴾ .

واتە : ئنجا کاتێك کە خەڵك دابەزین ، (واتە : ڕووبەڕووی یەك بوونەوە) کۆمەڵێك لە قورەیش هاتن بۆ ئەوەی کە لەو گۆماوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە سوپایەکەی دروستیان کرد بوو ، وە پڕیان کرد بوو لە ئاو ، لێی بخۆنەوە ، (وەك جۆرێك لە تەحەددداو ، لە بێمنەتیی) کە لەنێو ئەواندا (حَكِيم بْنِ حِزَامٍ) هەبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لێیان گەڕێن ، با بێن ، ئنجا هاتن ، دوایی : هەر کام لەوانە لە ئاوی حەوزەکەیان خواردەوە ، لەو ڕۆژەدا کوژرا ، (نەك ئەو کاتە ، بەڵکو دوایی هەموو ئەوانەی کە لە ئاوەکە خواردیانەوە کوژراون) جگە لە (حَكِيم بْنِ حِزَامٍ) ئەو نەکوژرا ، بەڵکو دوایی مسوڵمان بوو ، وە باشیش مسوڵمان بوو ، ئنجا دوایی هەر کاتێك ویستبای سوێندێکی بەهێز بخوات ، بەو شێوەیە سوێندی دەخوارد ، دەیگوت : (لا وَالّذِي نَجانِي مِنْ يَوْمِ بَدْرٍ) نەخێر ، ئەو شتە وانیە ، سوێند بەو کەسەی کە لە ڕۆژی بەدردا منی دەرباز کرد ، (واتە : دەرباز بوونی لە ڕۆژی بەدردا ، شتێکی زۆر گەورە بووە ، دەستی خوای پەروەردگاری تێدا بینیوە) .

٢٠ / ﴿لَمّا اطْمَأَنّ الْقَوْمُ ، بَعَثُوا عُمَيْرَ بْنَ وَهْبٍ الْجُمَحِيّ فَقَالُوا : أحْزُرْ لَنا أَصْحَابَ مُحَمّدٍ ، قَالَ فَاسْتَجالَ بِفَرَسِهِ حَوْلَ الْعَسْكَرِ ، ثُمّ رَجَعَ إلَيْهِمْ فَقَالَ : ثَلاثُ مِئَةٍ

رَجُلٍ يَزِيدُونَ قَلِيلاً أَوْ يَنْقُصُونَ ، وَلَكِنْ أَمْهِلُونِي حَتّى أَنْظُرَ أَلِلْقَوْمِ كَمِينٌ أَوْ مَدَدٌ ؟ قَالَ فَضَرَبَ فِي الْوَادِي حَتّى أَبْعَدَ ، فَلَمْ يَرَ شَيئًا ، فَرَجَعَ إلَيْهِمْ فَقَالَ : مَا وَجَدْتُ شيئًا ، وَلَكِنّي قَدْ رَأَيْتُ يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ ! الْبَلَايَا تَحْمِلُ الْمَنَايَا ، نَوَاضِحُ يَثْرِبَ تَحْمِلُ الْمَوْتَ النَاقِعَ ، قَوْمٌ لَيْسَ مَعَهُمْ مَنَعَةٌ وَلا مَلْجأ إلاَّ سُيُوفُهُمْ ، وَاللهِ مَا أرَى أَنْ يُقْتَلَ رَجُلٌ مِنْهُمْ حَتّى يَقْتُلَ رَجُلاً مِنْكُمْ ، فَإِذَا أَصَابُوا مِنْكُمْ أَعْدَادَهُمْ ، فَمَا خَيْرُ الْعَيْشِ بَعْدَ ذَلِكَ ؟ فَرُوا رَأْيَكُمْ .

فَلَمّا سَمِعَ حَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ ذَلِكَ ، مَشَى فِي النَاسِ فَأَتَى عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ ، فَقَالَ يَا أَبَا الْوَلِيدِ ! إنّكَ كَبِيرُ قُرَيْشٍ وَسَيّدُهَا ، وَالْمُطَاعُ فِيهَا ، هَلْ لَكَ إلَى أَنْ لا تَزَالَ تُذْكَرُ فِيهَا بِخَيْرٍ إلَى آخِرِ الدّهْرِ ؟ قَالَ وَمَا ذَاكَ يَا حَكِيمُ ؟ قَالَ تَرْجِعُ بِالنَاسِ وَتَحْمِلُ أَمْرَ حَلِيفِكَ عَمْرِو بْنِ الْحَضْرَمِيّ ، قَالَ قَدْ فَعَلْتُ ، أَنْتَ عَلَيَّ بِذَلِكَ ، إنّمَا هُوَ حَلِيفِي ، فَعَلَيّ عَقْلُهُ وَمَا أُصِيبَ مِنْ مَالِهِ ، فَأْتِ ابْنَ الْحَنْظَلِيّةِ ، {وَالْحَنْظَلِيّةُ أُمّ أَبِي جَهْلٍ وَهِيَ أَسَمَاءُ بِنْتُ مخرمةَ أَحَدُ بَنِي نَهْشَلِ بْنِ دَارِمِ بْنِ مَالِكِ بْنِ حَنْظَلَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ زَيْدِ مَنَاةَ بْنِ تَمِيمٍ } فَإِنّي لا أَخْشَى أَنْ يَشْجُرَ أَمْرَ النَاسِ غَيْرُهُ ، يَعْنِي أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ ، ثُمّ قَامَ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ خَطِيبًا ، فَقَالَ : يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ ، إنّكُمْ وَاللّهِ مَا تَصْنَعُونَ ، بِأَنْ تَلْقَوْا مُحَمّدًا وَأَصْحَابَهُ شَيئًا ، وَاللهِ لَئِنْ أَصَبْتُمُوهُ ، لا يَزَالُ الرّجُلُ يَنْظُرُ فِي وَجْهِ رَجُلٍ يَكْرَهُ النّظَرَ إلَيْهِ ، قَتَلَ ابْنَ عَمّهِ أَوْ ابْنَ خَالِهِ أَوْ رَجُلاً مِنْ عَشِيرَتِهِ ، فَارْجِعُوا وَخَلّوا بَيْنَ مُحَمّدٍ وَبَيْنَ سَائِرِ الْعَرَبِ ، فَإِنْ أَصَابُوهُ ، فَذَاكَ الّذِي أَرَدْتُمْ وَإِنْ كَانَ غَيْرَ ذَلِكَ ، أَلْفَاكُمْ وَلَمْ تَعَرّضُوا مِنْهُ مَا تُرِيدُونَ ، قَالَ حَكِيمٌ : فَانْطَلَقْتُ حَتّى جِئْتُ أَبَا جَهْلٍ ، فَوَجَدْتُه قَدْ نَثَلَ دِرْعًا لَهُ مِنْ جِرَابِهَا ، فَهُوَ يُهَنّئُهَا يُهَيّئُهَا ، فَقُلْتُ لَهُ : يَا أَبَا الْحَكَمِ ! إنّ عُتْبَةَ أَرْسَلَنِي إلَيْكَ بِكَذَا وَكَذَا ، لِلّذِي قَالَ ، فَقَالَ : انْتَفَخَ وَاللهِ سَحْرُهُ ، حِينَ رَأَى مُحَمّدًا وَأَصْحَابَهُ ، كَلاّ وَاللهِ لا نَرْجِعُ حَتّى يَحْكُمَ اللهُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مُحَمّدٍ ، وَمَا بِعُتْبَةَ مَا قَالَ ، وَلَكِنّهُ قَدْ رَأَى أَنّ مُحَمّدًا وَأَصْحَابَهُ أَكَلَةُ جَزُورٍ ، وَفِيهِمْ ابْنُهُ ، فَقَدْ تَخَوّفَكُمْ عَلَيْهِ ، ثُمّ بَعَثَ إلَى عَامِرِ بْنِ الْحَضْرَمِيّ ، فَقَالَ هَذَا حَلِيفُكَ يُرِيدُ أَنْ يَرْجِعَ بِالنَاسِ ، وَقَدْ رَأَيْتَ ثَأْرَكَ بِعَيْنِكَ ، فَقُمْ فَانْشُدْ خُفْرَتَكَ وَمَقْتَلَ أَخِيكَ ، فَقَامَ عَامِرُ بْنُ الْحَضْرَمِيّ فَاكْتَشَفَ ، ثُمّ صَرَخَ وَاعَمْرَاه ، وَاعَمْرَاه ، فَحَمِيَتْ

الْحَرْبُ وَحَقِبَ النـاسُ وَاسْتَوْسَقُوا عَلَى مَا هُمْ عَلَيْهِ مِنْ الشَّرّ ، وَافْسِدَ عَلَى النـاسِ الـرَّأْيُ الَّذِي دَعَاهُـمْ إلَيْـهِ عُتْبَـةُ ، فلـما بلـغ عُتْـبَةَ ، قَوْلُ أَبِـي جَهْلٍ : (انْـتَفَخَ وَاَللّـهِ سَحْرُهُ ) قَالَ : سَيَعْلَمُ مُصَفِّرُ أَسْتِهِ ، مَنْ انْتَفَخَ سَحْرُهُ ، أَنـا أَمْ هُوَ ؟ ثُمّ الْتَمَسَ عُتْبَـةُ بَيْضَـةً لِيُدْخِلَهـا فِي رَأْسِهِ ، فَمَا وَجَدَ فِي الْجَيْشِ بَيْضَـةً تَسَعُهُ مِنْ عِظَمِ هـامَتِهِ ، فَلَمّا رَأَى ذَلِـكَ ، اعْتَجَـرَ عَلَى رَأْسِهِ بِبُـرْدٍ لَهُ) .

واتـە : کاتێك کـە سووپای قورەیش دامـەزران (عُمَيْـرَ بْنَ وَهْـبٍ الجُمَحِـيّ) یان نـارد گوتیـان : بچۆ بۆمـان مەزەنـدە بکـە ، ژمـارەی هـاوەڵانی موحەممـەد ﷺ چـەندە ؟ سـوپایەکـەی چـەندە ؟ ئـەویش بـە سـواری ئەسپەکـە بـە دەوری سـەربازگەکـەی پێغـەمبـەردا ﷺ بە دەوری سـوپایەکەیدا گـەڕا ، (دیـارە دوور بـە دوور) دوایـی کـە گەڕایەوە بۆ لایان گوتی : ژمارەیان سێسـەد (٣٠٠) پیاو شتێك کـەمتـر ، یـان شـتێك زیاترە ، بەڵام مۆڵـەتم بدەن با تـەماشا بکـەم ، بزانـم داخـۆ ئـەو کۆمـەڵـە بۆسـەیان هەیە ، یاخود کـەس هەیـە دوایـی ئیمدادیـان بکـاتو بەدەنگیـانەوە بێ ؟

ئنجا جارێکی دیکە بە دۆڵەکەدا ڕۆیی هەتا زۆر دوور ڕۆیشـتو هاتـەوە بۆ لایانو هیچی نەبینی ، گوتی : هیچ شـتێکم نەبینـی ، بـەڵام سـوێند بـە خـوا ، ئـەی کۆمـەڵی قـورەیش ! هەسـت دەکـەم کـە ئەوانـە مردنیـان لەگـەڵ خۆیـاندا هێنـاوە ، حوشـترەکـانی یەسـریب (واتـە : شـاری مەدینـە) مردنێکـی بـەردەوامیان پێیـە چونکـە ئـەوانـە سوپایەکـن هـیچ هێزێکـی دیکەیـان نیـەو ، جگـە لـە شمشیـرەکـانیان پەنـایەکی دیکـەیان نیـە ، وە مـن پێـم وایـە هـیچ کـام لـەوان نـاکوژرێ ، تاکو یەکـێك لە ئێـوە لـە پـێش خۆیدا نەکـوژێ ، وە ئەگـەر بێـتو بـە ئەندازەی خۆیان خـەڵك لە ئێوە بکوژن ، (کـە سێ سـەدو ئەوەنـدە کەسـەن ، سـێ سەدو ئەوەنـدە کەسـەتـان لـێ بکوژن) ، ئـەوە دوای ئـەوە ژیان خێـری تێـدا نیـە ، ئنجا خۆشتان تـەماشای وەزعەکە بکەنو بیری لـێبکەنـەوە .

کاتێك (حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ) ئەوەی بیسـت بە نێو خـەڵکـیدا گـەڕا ، هەتـا چـوو بۆ لای عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـە ، گوتی : ئـەی ئـەبو وەلیـد ! تـۆ ئێستا لـە قورەیش لـە هـەمووان بـە تـەمەنتـری ، وە گـەورەی قورەیشـی ، وە گـوێ بـۆ گیـراویشـی لـە نێـو قورەیشـدا ، من پێشـنیارێکت بۆ دەکـەم ، ئایـا ئامـادەی بیکـەی ، کـە هـەتا کۆتـایی زەمان خـەڵك بە چاکـە باسـت بکـەن ؟! ئـەویش گـوتی : پێشـنیارەکـەت چییە ئـەی

حەکیــم ؟ گـوتی : ئـەو خـەڵکـە بگێڕیــەوە ، وە (عَمْـرِو بْـن الْـحَضْـرَمِيّ)یـش {کـە پێشتـر سـریەیەکی مسوڵمانـان کوشـتبوویـان} عـایــدی تۆبـێ کـە هـاوپەیمانی تـۆ بووە ، تۆ خوێنـەکەی بدە .

عوتبـەش گوتـی : باشــە ئـەوە وام کـــرد ، بـەڵام تـۆ هاوکـارم بـە لـەوەدا ، کـە ئـەم سـوپایەی قـورەیش بگێڕینـەوە ، چونکـە (عَمْـرِو بْـن الْـحَضْـرَمِيّ) هـاوپەیمــانی مـن بووە ، خوێنـی لەسـەر من ، وە مــاڵو سـامانەکەشــی بـۆ دەبـژێــرم ، بـەڵام بچــۆ بـۆ لای (ابْـن الْـحَنْظَلِيَّـةِ) {(حَنْظَلِيّـة)ش نــاوی دایکـی (أبـو جهـل) بـوو} ، گـوتی : مـن تــەنیا مەترسـییم لـەو هەیـە کـە خـەڵکەکـە پێـك وەرکـاو ئـەو دوو ســـوپایە تێـك بـەردا ، {دیــارە ئەبو جەهل لە هەمووان سوورتر بووە لەســەر جەنـگەکـە} ، دوایـی عوتبەی کـوڕی ڕەبیعە هەڵسا وتـاری دا گـوتی : ئـەی کۆمـەڵی قورەیـش ! سـوێند بـە خـوا ، ئەوەی کـە ئێوە دەیکـەن ، کـە بگـەنە موحەممــەدو هاوەڵەکـانیو بەرەنگـاری ببنــەوە ، هـیـچ ســوودێکی بـۆ ئێـوە نیــە ، ئەگــەر زەفــەری پــێ بـەرن ، ئـەوە ئـەوە بەردەوام هەر کـامێك لە ئێـوە تـەماشـای ڕووی ئـەو پیــاوە دەکـات ، کـە یـان خزمـی کوشــتوە ، یـان کــوڕی مـامــی کوشــتوە ، یـان کـوڕی خـاڵی کوشــتوە ، چـاوی لــە بەرانبـەری دا هەڵنـایەت {لـە ڕووی خزمایەتییــەوە شـتـەکـەی لێـك دایــەوە} بۆیــە بگـەڕێنــەوەو لـە موحەممـەدو لـە عـەرەبــی دیکـە بگـەڕێن ، (واتــە : بـا ئێــوە وەك قورەیش کە خزمی خۆمانە ، لـێی بگـەڕێیـن ، با بزانیــن داخـۆ لە نێـوان ئـەوو باقـی تیـرەو هۆزەکانی عـەرەبدا چـی دەگـوزەرێ) ، ئەگـەر لەبەینیان برد ، ئەوە ئەوەیە کە ئێوە ویســتووتانە ، بـەڵام ئەگــەر پێچــەوانەی ئـەوە بـووو موحەممـەد سـەرکـەوت ، ئەوە بێگومان ئێوە لەوە پەشیمان نـابنـەوە ، کە شـەڕتان لەگەڵدا نـەکردوە .

(حَكِيـم بْنِ حِـزَام) دەڵـێ : منیش چووم بـۆ لای ئـەبو جەهـل کـە تـەماشـام کـرد ، زرێیـەکی لـە جەواڵـێك دەرهێنــابوو بــڵاوی کردبـۆوە ، ئامــادەی دەکــرد ، پێــم گـوت ئـەی (أبـا الحـکم) ! عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـە منـی نــاردوە بـۆ لای تـۆ ، ئـەو قسـانەی کـــردوە ، قسەکـــانم بــۆ گێـــڕایەوە ، ئــەبو جەهلــیش ، گـــوتی : ئــەوە سـیپەلاکــی هەڵئـاوســاوە لـە هـەوا (دیـارە ئـەوە تـەعبیــرێك بـووە عـەرەب بەکـاریان هێنــاوە بـۆ ترســـان ، واتـــە : ترســاوە کـــاتێك موحەممـەدو هاوەڵەکـانی بینیـوە) ، نـەخێر ، بـە خــوا نـاگـەڕێینــەوە ، هـەتا خـوا حوکـم لـە نێوان ئێمـەو موحەممـەد دا نەکـات ، وە

ئـەوەی کــە عـوتبــە گوتوویــەتی : هــەقی ئــەو قســەیەی نیــە ، بــەڵام لەبەرئــەوەی موحەممــەدو هاوەڵەکـانی بینیـوە تەماشـا دەکات ، بایــی ئــەوەن کــە حوشتــرێك بخـۆن ، واتــە : ســەد کەسێکـن ، وە کوڕەکـەی عوتبــەش لـە نێوانیـانـدایــە ، ئنجـا بۆیـە عوتبــە پێـی خۆشــە ، شەڕەکـە نەکـرێ ، لەبـەر کوڕەکـەی خــۆی ، (یـانی : دەزانــێ کــە موحەممــەدو هاوەڵەکـانی کــەمنو لەبـەین دەچــنو ، کوڕەکــەشی لــە نێوانیانــدا لەبــەین دەچــێ ، ئــەوە ســۆزی باباییەتیــی بـۆ کوڕەکــەی جــووڵاوە ، کــە شـەڕەکــە نەکــرێ ، ئەگەرنـــا لەبــەر ئــەوە نیـــە مەترســیی هەبــێ لــە سوپاکــەی موحەممـەد ، بەڵکو مەترسی هەیـە لـە کوڕەکەی خۆی کە لە نێـو هـاوەڵانـدایـە) .

ئنجا دوایی ئەبو جەهل ناردی بۆ لای (عَـامِرِ بْنَ الْحَضْـرَمِيّ) کـە بـرای (عَمْـرِو بْـنَ الْحَضْـرَمِيّ) بــووە ، پێــی گــوت : ئــەوە عوتبــەی کــوڕی ڕەبیعــە دەیــەوێ خەڵکەکە بگێـڕێتــەوە ، تـۆش بـۆ خـۆت ئێستا بـە چاوی خـۆت دەبینـی ، دەتوانــی تۆڵــەی خــۆت بکــەیەوە ، ئێســتا تــۆ هەڵســە داوا بکــە کــە پــەیمانت هەیــە لەگــەڵ قوڕەیشدا ، وە باسی کوژرانی برایەکــەت بکـە ، بـۆ ئــەوەی گــەرمیان دابێنـی لەســەر جـەنگ ، وە عوتبـەی کوڕی ڕەبیعـە نەتوانـێ بیانباتـەوەو ئەو شـەڕە نەکرێ .

(عَامِرِ بْنِ الْحَضْرَمِيّ) هەڵسا عەوڕەتی خۆی دەرخست (دیارە ئـەو کـات عــەرەب عادەتیـان وابـووە ، یان خۆیان ڕووت دەکـردەوە ، یان عــەوڕەتی خۆیـان دەرخستوە ، تاکـو بەرانبـەرەکەیـان بڵێـن : ئـەوە عەیبـەیەکـی گەورەیــە) ، دوایـی هـاواری کـرد گوتـی : ئەی عەمـری بـرام ڕۆ ! ئیدی شــەڕ گەرم بوو ، وە خـەڵك لێك گەرم بوون ، وە ئەوەی کە عوتبـە ویستی بیکات ، ئیشــەکەیان لـێ تێکدا .

ئنجـا کــە قسەکــەی ئــەبو جەهــل بــە عوتبــەی کــوڕی ڕەبیعــە گەیشتــەوە کــە گوتبووی : سیپەلاکی هەڵئـاوساوە ، (واتـە : ترسـاوە) گوتـی : ئەو کـەسەی کە پاشــی خۆی زەرد کـردوە ، (واتــە : لـە ترسـان ، لـە خــۆی ڕیوە) ، دوایـی دەزانـێ داخـۆ مـن ترسـاوم یـان ئەو !

ئنجا دوایی عوتبـە ویستی خوودەیەك لەسـەر سـەری خۆی دانـێ ، بـەڵام لـە نێـو ئەو هـەموو سـوپـایەدا ، خودەیەکی لـێ نەبوو بەسەری وی بکات ، سـەری زۆر گــەورە بوو ، بە ناچـاریی عەبـایەکی لەسـەری خۆی ئـالاند (دیارە سـەری زۆر گـەورە بووە) .

٢١ / ﴿وَقَدْ خَرَجَ الأَسودُ بْنُ عَبْدِ الأَسَدِ الْمَخْزُومِيّ، وَكَانَ رَجُلاً شَرِساً سَيِّئَ الْخُلُقِ فَقَالَ: أُعَاهِدُ اللّه لأَشْرَبَنَّ مِنْ حَوْضِهِمْ، أَوْ لأَهْدِمَنَّهُ، أَوْ لأَمُوتَنّ دُونَهُ، فَلَمّا خَرَجَ، خَرَجَ إِلَيْهِ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطّلِبِ، فَلَمّا الْتَقَيَا، ضَرَبَهُ حَمْزَةُ، فَأَطَنّ قَدَمَهُ بِنِصْفِ سَاقِهِ، وَهُوَ دُونَ الْحَوْضِ، فَوَقَعَ عَلَى ظَهْرِهِ تَشْخَبُ رِجْلُهُ دَمًا نَحْوَ أَصْحَابِهِ، ثُمّ حَبَا إِلَى الْحَوْضِ حَتّى اقْتَحَمَ فِيهِ يُرِيدُ ـ زَعَمَ ـ أَنْ يَبُرَّ يَمِينَهُ، وَأَتْبَعَهُ حَمْزَةُ فَضَرَبَهُ حَتّى قَتَلَهُ فِي الْحَوْضِ﴾ .

واتە : (الأَسودُ بْنُ عَبْدِ الأَسَدِ الْمَخْزُومِيّ) دەرچوو لە سوپا کە پیاوێکی زۆر درِو خووخدە خراپ بووە ، گوتی : پەیمان بە خوا دەدەم کە دەبێ لەو گۆلاوەی موحەممەدو هاوەڵانی بخۆمەوە ، یاخود گولاوەکە برووخێنم ، یان دەبێ بکوژرێم ، ئنجا کاتێك دەرچوو (حَمْزَة بْن عَبْد الْمُطّلِب)یش بۆی دەرچوو ، ئەو هات لە ئاوەکە بخواتەوە ، وەك تەحەددا کردنو وەك بێمنەتیی‌و بێباکیی ، حەمزەش بۆی دەرچووو ، بەرەو ڕووی یەك بوونەوە ، حەمزە (خوا لێی ڕازی بێ) یەك زەبری لێدا کە نیوەی لاقێکی پەڕاند ، پەڕاندنەکە دەنگێکی لێ هات ، پێش ئەوەی بگاتە حەوزەکە ، دوایی لەسەر پشت کەوت ، وە لاقە بڕاوەکەشی ڕووی لە هاوەڵەکانی بوو ، دوایی لەسەر چنگان بە گاگۆڵکەی ڕۆیشت ، هەتا خۆی خستە نێو حەوزەکە ، بۆ ئەوەی بە حیساب سوێندی لێ نەکەوێ ، حەمزەش بە دوای کەوت ، تاکو لە نێو حەوزەکەدا کوشتی ، (ئەوە یەکەم کەس کە لە کافرەکان کە کوژرا ، کە وەك تەحەددا چوو ئاو بخواتەوە) .

٢٢ / ﴿قَالَ ثُمّ خَرَجَ بَعْدَهُ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ، بَيْنَ أَخِيهِ شَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَابْنِهِ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ، حَتّى إِذَا فَصَلَ مِنْ الصّفّ دَعَا إِلَى الْمُبَارَزَةِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ فِتْيَةٌ مِنْ الْأَنْصَارِ ثَلَاثَةٌ، وَهُمْ عَوْفٌ وَمُعَوّذٌ ابْنَا الْحَارِثِ (وَأُمّهُمَا عَفْرَاءُ) وَرَجُلٌ آخَرُ، يُقَالُ: هُوَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ رَوَاحَةَ، فَقَالُوا: مَنْ أَنْتُمْ؟ فَقَالُوا: رَهْطٌ مِنْ الْأَنْصَارِ، قَالُوا: مَا لَنَا بِكُمْ مِنْ حَاجَةٍ، ثُمّ نَادَى مُنَادِيهِمْ يَا مُحَمّدُ! أَخْرِجْ إِلَيْنَا أَكْفَاءَنَا مِنْ قَوْمِنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ قُمْ يَا عُبَيْدَةُ بْنَ الْحَارِثِ، وَقُمْ يَا حَمْزَةُ، وَقُمْ يَا عَلِيّ، فَلَمّا قَامُوا وَدَنَوْا مِنْهُمْ قَالُوا: مَنْ أَنْتُمْ؟ قَالَ عُبَيْدَةُ: عُبَيْدَةُ، وَقَالَ حَمْزَةُ: حَمْزَةُ، وَقَالَ عَلِيّ: عَلِيّ، قَالُوا: نَعَمْ أَكْفَاءٌ كِرَامٌ، فَبَارَزَ عُبَيْدَةُ: . وَكَانَ أَسَنّ

الْقَوْمِ . عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ ، وَبَارَزَ حَمْزَةُ : شَيبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ ، وَبَارَزَ عَلِيّ : الْوَلِيدَ بْنَ عُتْبَةَ ، فَأَمّا حَمْزَةُ ، فَلَمْ يُمْهِلْ شَيبَةَ أَنْ قَتَلَهُ ، وَأَمّا عَلِيّ ، فَلَمْ يُمْهِلْ الْوَلِيدَ أَنْ قَتَلَهُ ، وَاخْتَلَفَ عُبَيْدَةُ وَعُتْبَةُ بَيْنَهُمَا ضَرْبَتَيْنِ ، كِلاهُمَا أَثْبَتَ صَاحِبَهُ وَكَرّ حَمْزَةُ وَعَلِيّ بِأَسْيَافِهِمَا عَلَى عُتْبَةَ فَذَفّفَا عَلَيْهِ ، وَاحْتَمَلا صَاحِبَهُمَا فَحَازَاهُ إلَى أَصْحَابِهِ﴾ .

واتە : دوای ئەو (یانی : دوای : أسود بن الأسد المخزومي) عوتبەی کوڕی ڕەبیعە {کە تەگبیرکەریان بوو ، خاوەنی حوشترە سوورەکە ، بەڵام بە قسەیان نەکرد لەبەر ئەوەی لە هەموویان بە تەمەنتر بوو} چووەدەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان شەیبەی کوڕی ڕەبیعە کە برای بوو ، وە وەلیدی کوڕی عوتبە کە کوڕی بوو (واتە : خۆیو برایەکەیو کوڕێکی هەرسێکیان دەرچوون) هەتا لە ڕیزی سوپای کافرەکان جیابوونەوە ، وە داوای کرد بۆ هاتنە مەیدان ، (واتە : تەن بە تەن ، یەك بە یەك) ، ئیدی سێ لە پشتیوانەکان بۆیان دەرچوون ، کە ئەوانیش عەوفو لەگەڵ موعەوویز کوڕانی حاریس کە دایکیشیان ناوی عەفرایە ، وە پیاوێکی دیکەش ، وە هەندێکیش گوتوویانە : ئەو پیاوەی سێیەم عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بووە .

عوتبە لەگەڵ وەلیدی کوڕیو شیبەی برای پێیان گوتن : ئێوە کێن ؟ گوتیان : ئێمە کۆمەڵێکین لە پشتیوانەکان ، گوتیان : ئێمە پێویستیمان بە ئێوە نیە ، شەڕ لەگەڵ ئێوە ناکەین ، دوایی یەکێکیان بانگی کرد : ئەی موحەممەد ! هاوکوفەکانی خۆمان ، لە خزمەکانی خۆمانمان ، بۆ بنێرە ، (خەڵکی مەدینەمان بۆ مەنێرە) ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : (قُمْ يَا عُبَيْدَةُ بْنَ الْحَارِثِ ، وَقُمْ يَا حَمْزَةُ ، وَقُمْ يَا عَلِيّ) ، واتە : ئەی عوبەیدەی کوڕی حارث هەڵسە ! ئەی حەمزە هەڵسە ! ئەی عەلی هەڵسە ! { کە هەرسێکیشیان دیارە خزمی نیزیکی پێغەمبەر ﷺ بوون} فەرمووی ئێوە بچن[1]، ئنجا کاتێك کە چوونو لێك نیزیك بوونەوە ، دووبارە {عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو

---

١) بەڵێ ئەمەیە ڕاستکردن لەگەڵ خواو خەڵكو بەرنامەکەت دا ، نەك خۆتو نیزیکانت بپارێزیو خەڵکی دیکە بخەیە بەر مەترسییەوە ! .

وەلیدی کوڕی عوتبە﴾ ، لێیان پرسین : ئێوە کێن ؟ عوبەیدە گوتی : من عوبەیدەم ، حەمزە گوتی : حەمزەم ، عەلی گوتی : عەلییم ، ئەوانیش گوتیان : تەواو ، ئێوە هاوکوفێکی بەڕێزن ، ئنجا عوتبە کە لە هەمووان بە تەمەنتر بوو عوبەیدە بۆی چووە مەیدان ، کە دیارە عوبەیدەش لە هەمووان بە تەمەنتر بووە ، حەمزەش بۆ شەیبەی کوڕی ڕەبیعە چووە مەیدان ، عەلییش بۆ وەلیدی کوڕی عوتبە ، ئنجا هەرچی حەمزە بوو ، مۆڵەتی شەیبەی نەداو یەکسەر کوشتی ، عەلییش مۆڵەتی وەلیدی نەداو یەکسەر کوشتی ، بەڵام عوبەیدەو عوتبە یەکی زەبرێکیان لە یەکدی دا ، هەریەکە هاوەڵەکەی خۆی خست ، دوایی حەمزەو عەلی بە شمشێرەکانیان چوونە سەر عوتبە ، عوتبەیان تەواو کرد ، وە هاوەڵەکەی خۆشیان کە عوبەیدە بوو ، بە بریندارىی هەڵگرتو بردیانەوە لای هاوەڵەکانیان .

٢٣ / ﴿ثُمّ تَزَاحَفَ الناسُ وَدَنا بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْض ، وَقَدْ أَمَرَ رَسولُ اللّهِ ﷺ أَصْحَابَهُ أَنْ لا يَحْمِلوا حَتّى يَأْمُرَهُمْ ، وَقَالَ : إنْ اكْتَنَفَكُمْ الْقَوْمُ فَانْضَحُوهُمْ عَنْكُمْ بِالنّبْلِ ، وَرَسولُ اللّهِ ﷺ فِي الْعَرِيشِ مَعَهُ أَبُو بَكْرٍ الصّدّيقُ﴾ .

واتە : دوای ئەوە ئنجا خەڵك بەرەو یەك كشان ، هەندێكیان لە هەندێكیان نیزیك بوونەوە ، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون : هەتا خۆم فەرمانتان پێ نەكەم ، هێرش مەبەن ، وە پێی فەرموون : ئەگەر ئەو خەڵكە ئابلۆوقەیان دان (لەبەر ئەوەی سێ هێندەی ئەوان زیاتر بوون) ئەوە ئێوە بە تیر لە خۆتانیان دووربخەنەوە ، (ئێوە دەست پێ مەكەن ، هەتا ئەوان دەست پێ دەكەن) ، وە پێغەمبەریش ﷺ لە نێو كەپرەكەیدا بوو ، وە ئەبو بەكری صیددیقیشی لەگەڵدا بوو ، خوا لێی ڕازی بێ ، (دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەكرد).

٢٤ / ﴿فَكَانَتْ وَقْعَةُ بَدْرٍ يَوْمَ الْجُمُعَةِ صَبِيحَةَ سَبْعَ عَشْرَةَ ، مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ﴾ .

واتە : ڕووداوی جەنگی بەدر ڕۆژی جومعە ، بوو بەرەبەیانی (١٧)ی مانگی ڕەمەزانی (ساڵی دووەمی) كۆچیی (واتە : ڕۆژێكی وەك ئەمڕۆ)[١].

---

١) كاتی دەرس گوتنەوەكەم (١٧ رمضان ١٤٣٦)ی كۆچیی بوو .

٢٥ / ﴿قال ابن اسحاق : وحدَّثني حبان بن واسع بن حبان عن أشياخ من قومه : أَنّ رَسولَ اللهِ ﷺ عَدّلَ صُفُوفَ أَصْحَابِهِ يَوْمَ بَدْرٍ ، وَفِي يَدِهِ قِدْحٌ يُعَدّلُ بِهِ الْقَوْمَ فَمَرّ بِسوادِ بْنِ غَزِيّةَ حَلِيفِ بَنِي عَدِيّ بْنِ النّجارِ (قَالَ ابْنُ هِشامٍ : يُقَالُ : سَوّاد مُثَقّلَةً وَسوادٌ فِي الأَنْصارِ غَيْرُ هَذَا ، مُخَفّفٌ) وَهُوَ مُسْتَنْتِلٌ مِنْ الصّفّ (قَالَ ابْنُ هِشامٍ : وَيُقَالُ مُسْتَنْصِلٌ مِنْ الصّفّ) فَطَعَنَ فِي بَطْنِهِ بِالْقِدْحِ ، وَقَالَ : اسْتَوِ يَا سوادُ ! فَقَالَ : يَا رَسولَ اللهِ أَوْجَعْتَنِي ، وَقَدْ بَعَثَكَ اللهُ بِالْحَقّ وَالْعَدْلِ ، قَالَ : فَأَقِدْنِي ، فَكَشَفَ رَسولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَطْنِهِ ، وَقَالَ : اسْتَقِدْ ، قَالَ : فَاعْتَنَقَهُ فَقَبّلَ بَطْنَهُ ، فَقَالَ : مَا حَمَلَكَ عَلَى هَذَا يَا سوّادُ ؟ قَالَ يَا رَسولَ اللهِ ! حَضَرَ مَا تَرَى ، فَأَرَدْتُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ الْعَهْدِ بِكَ ، أَنْ يَمُسّ جِلْدِي جِلْدَكَ ، فَدَعَا لَهُ رَسولُ اللهِ ﷺ بِخَيْرٍ ، وَقَالَهُ لَهُ خيراً﴾ .

واتە : ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ریزەکانی رێك خست ، (دیارە لێرەدا گێڕەرەوەکە هەر ئەوەندە دەڵێ ، بەڵام بێگومان پێغەمبەر ﷺ وێڕای رێکخستن ، ئامۆژگاریشی کردوون و تاریشی بۆ داون و ئاراستەی کردوون ، کە چۆن شەڕ بکەن ؟ چۆن خۆڕاگربن) وە دارێکی راست (قِدْح)ی پێبوو ، ئەو دارەی بە سینگی دا دەهێنان ، بۆ ئەوەی کەس پاش و پێش نەبێ ، ئنجا بە لای (سوّادِ بْنِ غَزِيّة)دا تێپەڕی کە هاوپەیمانی (بَنِي عَدِيّ بْنِ النّجارِ) بوو ، کە تۆزێك لە ریزی دەرچوو بوو ، پێغەمبەر ﷺ بەو دارەی کە پێی بوو لە ورگی وەژەنی ، بۆ ئەوەی بچێتەوە نێو ریزەکە ، وە فەرمووی : ئەی سەواد راست بە ، سەوادیش گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! ئازارت پێ گەیاندم ، خواش بۆ هەق و دادگەریی تۆی ناردوە ، لەبەر ئەوە دەبێ رێگای من بدەی ، منیش تۆڵەی خۆم بکەمەوە لە تۆ ! پێغەمبەر ﷺ لەو هەلومەرجە گەرمەدا سکی خۆی رووت کرد ، (دیارە سەوادیش لەو کاتەدا ورگی رووت بووە) فەرمووی : تۆڵەی خۆت بکەوە ، ئەویش پێغەمبەری خوای ﷺ لە باوەش گرت و سکی موبارەکی ماچ کرد ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : مەبەستت لەوە چی بوو ؟ گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ بۆ خۆت دەزانی ئێستا شەڕەو هاتۆتە پێش ، نازانم چۆن دەبم ، بۆیە ویستم دوا جیابوونەوەی من لە تۆ ئەوەبێ ، کە پێستم بە پێستت بکەوێ ، پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای خێری بۆ کردو ، قسەی خێری بۆ کرد .

٢٦ / ﴿ثُمّ عَدّلَ رَسولُ اللهِ ﷺ الصّفُوفَ وَرَجَعَ إلَى العريشِ فَدَخَلَهُ وَمَعَهُ فِيهِ أبُو بَكْرٍ الصّدّيقُ ، لَيْسَ مَعَهُ فِيهِ غَيْرُهُ ، وَرَسولُ اللهِ ﷺ يُناشِدُ رَبّهُ مَا وَعَدَهُ مِنْ النّصْرِ ، وَيَقُولُ فِيمَا يَقُولُ : اللّهُمّ إنْ تَهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةُ الْيَوْمَ ، لا تُعْبَدْ ، وَأَبُو بَكْرٍ يَقُولُ : يَا نَبِيّ اللهِ ! بَعْضَ مُنَاشَدَتِكَ رَبّكَ ، فَإِنّ اللهَ مُنْجِزٌ لَكَ مَا وَعَدَكَ ، وَقَدْ خَفَقَ رَسولُ اللهِ ﷺ خَفْقَةً وَهُوَ فِي الْعَرِيشِ ، ثُمّ انْتَبَهَ ، فَقَالَ : أَبْشِرْ يَا أَبَا بَكْرٍ ، أَتَاكَ نَصْرُ اللهِ ، هَذَا جِبْرِيلُ آخِذٌ بِعِنَانِ فَرَسٍ يَقُودُهُ ، عَلَى ثَنَايَاهُ النّقْعُ) .

واتە : ئنجا دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕیزەکانی ڕێك خستن ، گەڕایەوە بۆ کەپرەکەی خۆی‌و ، چووە نێو کەپرەکەی‌و ئەبو بەکری صددیقیشی لەگەڵدا بوو ، جگە لەو کەسی دیکەی لەگەڵ نەبوو ، وە پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە پاڕانەوە لە پەروەردگاری ، وە ئەو بەڵێنەی کە پەروەرگاری پێی دابوو ، داوای دەکرد کە بۆی بێنێتە دی ، وە لە دوعاکەیدا دەیفەرموو : (اللّهُمّ إنْ تَهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةُ الْيَوْمَ ، لا تُعْبَدْ) ئەی خوایە ! ئەگەر ئەمڕۆ ئەو کۆمەڵە بفەوتێن ، تۆ لەمەودوا ناپەرستریێ ، (مەبەستی ئەوە بووە کە ئەو کۆمەڵە ، ئەو خەڵکەن کە پێغەمبەر ﷺ لە چواردە پازدە ساڵی ڕابردوودا ، پەروەردەی کردوون ، ئەگەر ئێستا ئەوانە بەدەستی کافرەکانی قورەیش بە قیادەی ئەبو جەهل ، لەبەین بچن ، خۆ پێغەمبەر ﷺ پەنجا عومری نیە ، جارێکی دیکە تێهەڵچێتەوەو خەڵکێکی دیکە پەروەردە بکاتەوە) ئنجا ئەبو بەکریش خوا لێی ڕازی بێ دەیگوت : ئەی پێغەمبەری خوا ! چیدیکە لە پەروەردگارت مەپاڕێوەو داوای لێ مەکە ، چونکە بێگومان خوا ئەو بەڵێنەی پێی داوی ، بۆت دێنێتە دی ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا خەوچکەیەکی هاتێ وەنەوزێکی هاتێ ، دوایی لە نێو کەپرەکەدا بێدار بۆوەو فەرمووی : (أَبْشِرْ يَا أَبَا بَكْرٍ أَتَاكَ نَصْرُ اللهِ ، هَذَا جِبْرِيلُ آخِذٌ بِعِنَانِ فَرَسٍ ، يَقُودُهُ عَلَى ثَنَايَاهُ النّقْعُ) .

واتە : ئەی ئەبو بکر ! موژدەت لێ بێ یارمەتی خوات بۆ هات ، ئەوە جبریلە جڵەوی ئەسپێکی گرتوە ڕایدەکێشێ ، وە تۆزو خۆڵی بە سەرەوەیە ، (کە دیارە هاتوە بۆ بەشداریی ئەو جەنگە) .

ئنجا با بزانین یەکەمین شەهید لە مسوڵمانان کێ بوو ؟

٢٧ / ﴿وَقَدْ رُمِيَ مِهْجَعٌ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطّاب بِسَهْمٍ فَقُتِلَ ، فَكَانَ أَوّلَ قَتِيلٍ مِنْ الْمُسْلِمِينَ ، ثُمّ رُمِيَ حَارِثَةُ بْنُ سُراقَةَ ، أَحَدُ بَنِي عَدِيّ بْنِ النّجّارِ ، وَهُوَ يَشْرَبُ مِنْ الْحَوْضِ بِسَهْمٍ ، فَأَصَابَ نَحْرَهُ ، فَقُتِلَ﴾ .

واتــە : (مِهْجَع) کــە مــەولای عومــەری کــوڕی خــەتاب بــوو (واتــە : کۆیلــەی ئازادکراوی ئەو بوو) تیرێکی لێدرا کوژرا ، ئەو یەکەمین کوژراوی مسـولْمانان بـوو ، دوای ئەویش حاریسەی کوڕی سوڕاقە ، کە یەکێك بوو لە (بَنِي عَدِيّ بْنِ النّجّارِ) لە کاتێکدا کە ئـاوی لـە گـولاوەکـە دەخـواردەوە ، ئـەویش تیـرێکـیان لـە ملـی دا ، یـان لـە لای سینگـیاندا ئـەویش کـوژرا (ئـەو دووە ، یەکـەمین دوو شـەهیدی مسـولْمانان بوون).

٢٨ / ﴿ثُمّ خَرَجَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ إلَى النّاسِ فَحَرّضَهُمْ ، وَقَالَ : وَاَلّذِي نَفْسُ مُحَمّدٍ بِيَدِهِ لا يُقَاتِلُهُمْ الْيَوْمَ رَجُلٌ ، فَيُقْتَلُ صَابِرًا مُحْتَسِبًا ، مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ ، إلا أَدْخَلَهُ اللّهُ الْجَنّةَ ، فَقَالَ عُمَيْرُ بْنُ الْحُمَامِ ، أَخُو بَنِي سَلِمَةَ ، وَفِي يَدِهِ تَمَرَاتٍ يَأْكُلُهُنّ : بَخْ بَخْ أَفَمَا بَيْنِي وَبَيْنَ أَنْ أَدْخُلَ الْجَنّةَ ، إلا أَنْ يَقْتُلَنِي هَؤُلاءِ ، ثُمّ قَذَفَ التّمَرَاتِ مِنْ يَدِهِ وَأَخَذَ سَيْفَهُ فَقَاتَلَ الْقَوْمَ حَتّى قُتِلَ ، قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : وَحَدّثَنِي عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ : أَنّ عَوْفَ بْنَ الْحَارِثِ ، وَهُوَ ابْنُ عَفْرَاءَ ، قَالَ : يَا رَسُولَ اللّهِ ! مَا يُضْحِكُ الرّبّ مِنْ عَبْدِهِ ؟ قَالَ : غَمْسُهُ يَدَهُ فِي الْعَدُوّ حَاسِرًا ، فَنَزَعَ دِرْعًا كَانَتْ عَلَيْهِ فَقَذَفَهَا ، ثُمّ أَخَذَ سَيْفَهُ ، فَقَاتَلَ الْقَوْمَ ، حَتّى قُتِلَ) .

واتــە : دوای پێغـەمبـەر ﷺ چـووە لای خـەڵکەکـە ، وە هـانیدانو فـەرمووی : (وَاَلّذِي نَفْسُ مُحَمّدٍ بِيَدِهِ ، لا يُقَاتِلُهُمْ الْيَوْمَ رَجُلٌ فَيُقْتَلُ صَابِرًا مُحْتَسِبًا ، مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ ، إلا أَدْخَلَهُ اللّهُ الْجَنّةَ) ، سـوێند بـەو کەسـەی گیـانی موحەممـەدی بەدەستـە ، ئەمڕۆ هیچ پیاوێك لە دژی ئەوانە شـەڕناکا بە خـۆڕاگریی‌و بـە خـوا پـێ مەبەست بوونـەوەو ، بـەوەی کـە ڕوویـان تێبکـاتو پشتیان تـێ نەکـات ، مەگـەر خـوا دەیخاتـە بەهەشت ، ئنجا لەو کـاتـەدا یەکێك لە هاوەڵان بە نـاوی (عُمَيْرُ بْنُ الْحُمَامِ) چەند خورمایەکی بەدەستـەوە بوون ، دەیخواردن ، گوتـی : تیـاح تیـاح ، ئایا لـە نێوان من‌و چوونە بەهەشتدا ، هەر ئەوەیە کـە ئەوانە بمکوژن ؟ دوایی خورمایەکـانی فـڕێ دان‌و تـەواوی نەکردن ، وە شـمشێـرەکەی خـۆی بـە دەسـتیەوە گـرت ، وە ڕژایـە نێـو

سوپای دوژمنەوە لەگەڵیاندا جەنگا ، تاکو کوژرا ، (یانی : پێشانیدا کە لە مردن ناترسێ لە پێناوی خوادا بەڵکو عەودالّی ئەوەیە کە لە پێناوی خوادا گیان بازیی بکات) ئنجا (عَوْف بْن الْحَارِثِ) کە (ابْنُ عَفْرَاءَ) یان پێ گوتوە ، گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! چ شتێك وا دەکات پەروەردگار بە بەندەکەی پێ بکەنێ ، (واتە : لێی ڕازی بێ بە هۆی ڕەفتارەکەیەوە شادمان بێ ؟) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوە کە بە دەستی ڕووت (واتە : بەبێ زرێ) بڕژێتە نێو جەرگەی سوپای دوژمنەوە ، ئەویش زرێ یەك کە لەبەری بوو دایکەندو فڕێیدا ، وە شمشێرەکەی بە دەستەوە گرتو لەگەڵیاندا جەنگا ، تاکو کوژرا .

٢٩ / ﴿لَمّا الْتَقَى النـاسُ وَدَنـا بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ ، قَالَ أَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ : اللّهُمّ أَقْطَعَنا لِلرّحِمِ ، وَآتَانا بِمَا لا يُعْرَفُ ، فَأَحِنْهُ الْغَدَاةَ ، فَكانَ هُوَ الْمُسْتَفْتِحَ) .

واتە : ئنجا دوای ئەوەی خەڵکەکە پێك گەیشتن و ، هەندێکیان لە هەندێکیان نیزیك بوونەوەو ، تێکڕژان ، شەڕ گەرم بوو ، ئەبو جەهل گوتی : (اللّهُمّ أَقْطَعَنا لِلرّحِمِ ، وَآتَانا بِمَا لا يُعْرَفُ ، فَأَحِنْهُ الْغَدَاةَ ، فَكانَ هُوَ الْمُسْتَفْتِحَ)

(دیارە ئەبو جەهل زۆری لە خۆی ڕا بینیوە ، سبحان الله مرۆڤ جاری وایە لەسەر کوفرو بەتاڵە ، ئنجا خۆی بە هەق دەزانێ) ، ئەبو جەهل گوتی : ئەی خوایە ! کامەمان زیاتر پەیوەندیی خزمایەتیی پچڕاندوە ، وە کامەمان شتێکی هێناوە کە نازانرێ ، ئەم بەیانیە ، (یان ئەمڕۆ) ، لە بەینی بەرەو ، سەرشۆڕی بکە ، واتە : ئەبو جەهل داوای ئەوەی کرد کە خوای دادگەر دادوەرییان لە نێواندا بکات ، کامیان خراپە ئەو لەبەین بەرێ ، (بێگومان خوای پەروەردگاریش دادوەریی کرد ، وە ئەبو جەهل و سوپایەکەی تێك شکاندو سەرشۆڕو زەبوون بوون) .

٣٠ / ﴿ثُمّ إِنّ رَسولَ اللهِ ﷺ أَخَذَ حَفْنَةً مِنْ الْحَصْبَاءِ ، فَاسْتَقْبَلَ قُرَيْشًا بِها ، ثُمّ قَالَ : شَاهَتْ الْوُجُوهُ ، ثُمّ نَفَحَهُمْ بِها ، وَأَمَرَ أَصْحَابَهُ فَقَالَ : شُدُّوا ، فَكانَتْ الْهَزِيمَةُ ، فَقَتَلَ اللهُ تَعَالَى مَنْ قُتِلَ مِنْ صَنادِيدِ قُرَيْش ، وَأُسِرَ مَنْ أُسِرَ مِنْ أَشْرَافِهِمْ ، فَلَمّا وَضَعَ الْقَوْمُ أَيْدِيَهُمْ يَأْسِرونَ ورَسولُ اللهِ ﷺ فِي الْعَرِيشِ ، وَسَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ قَائِمٌ عَلَى بَابِ الْعَرِيشِ الّذِي فِيهِ رَسولُ اللهِ ﷺ مُتَوَشّحَ السّيْفِ فِي نَفَرٍ

مِنْ الأَنْصَارِ يَحْرُسُونَ رَسولَ اللهِ ﷺ يَخَافُونَ عَلَيْهِ كَرَّةَ الْعَدُوّ ، وَرَأَى رَسولُ اللهِ ﷺ فِيمَا ذُكِرَ لِي ، فِي وَجْهِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ الْكَرَاهِيَةَ لِمَا يَصْنَعُ النَّاسَ ، فَقَالَ لَهُ رَسولُ اللهِ ﷺ : وَاللهِ لَكَأنَّك يَا سَعْدُ ! تَكْرَهُ مَا يَصْنَعُ الْقَوْمَ ، قَالَ : أَجَلْ ، وَاللهِ يَا رَسولَ اللهِ ! كَانَتْ أَوّلَ وَقْعَةٍ أَوْقَعَهَا (اللهُ) بِأَهْلِ الشّرْكِ ، فَكَانَ الإِثْخَانُ فِي الْقَتْلِ بِأَهْلِ الشّرْكِ أَحَبّ إلَيّ مِنْ اسْتِبْقَاءِ الرّجَالِ﴾ .

واتە : ئنجا پێغەمبەر ﷺ چەنگە چەوێکی ، یان چەنگە زیخێکی بەدەستەوە گرت ، (هەندێکیش دەڵێن : چنگە خۆڵێك بووە) ، وە ڕووی پێ کردە قورەیش و بەرەو ئەوان هەڵیداو پرژاندیو دەفەرمووێ : (شَاهَتِ الْوُجُوهُ) ئەو ڕووانە ڕووی ناشیرنن و ڕووی دزێون ناقۆڵان ، (لەبەر ئەوەی هەڵگری شیرکن و بەرگریی لە شیرك دەکەن ، وە هاتوون ستەم لە مسوڵمانان دەکەن) ، وە چەنگە زیخەکەی پێدا کردن ، وە لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانیشی بە هاوەڵان کرد ، فەرمووی : هێرش بەرن ، ئیدی کە هێرشیان برد ، زۆری نەبرد سوپای قورەیش شکا ، وە ئەوەی کە کوژرا کوژرا لە زلەزلانی قورەیش ، ئەوەی کە گیرا گیرا لە ناودارانیان ، ئنجا کاتێك دیلی کافرەکان دەگیران و دەستیان دەبەسترا ، پێغەمبەریش ﷺ هەر لە نێو کەپرەکەی خۆی بوو ، سەعدی کوڕی موعازیش لەبەر دەرگای کەپرەکە ڕاوەستا بوو ، (کاتێك ئەوانیان بە دیل گرتو ، لەشکرەکەیان شکاو حەفتایان لێ کوژراو ، حەفتایان لێ بەدیل گیرا) ، شمشێرێکی ڕووتی بە دەستەوە بوو ، لەگەڵ کۆمەڵك لە پشتیوانان پاسەوانییان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد ، نەوەك دوژمن دووبارە هێرش بکەنەوە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی کرد سەعدی کوڕی موعاذ دەموچاوی تێکچوو ، بەوەی کە ئەو خەڵکەیان بە دیل دەگرت ، بۆیە فەرمووی : (واللهِ كَأَنَّكَ يَا سَعْدُ ! تَكْرَهُ مَا يَصْنَعُ الْقَوْمُ) ئەی سەعد ! بە خوا وام دێتە بەرچاو ، کە پێت ناخۆش بێ ئەوانە بە دیل دەگرن ؟ ئەویش گوتی : بەڵێ ، ئەی پێغەمبەری خوا ! بە خوا پێم ناخۆشە ، چونکە ئەمە یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوە بوو ، کە خوا ﷻ ئەو شکستەی بە مل ئەو موشریك و کافرانەدا هێنا ، وام پێ باشتر بوو کوشتاری زیاتریان لێ بکەین و لە پەل و پۆیان بخەین ، لە جیاتی ئەوەی بە دیلیان بگرین و ، بیانهێڵینەوەو پاشان ببن بە دیل و بە خۆڕایی یاخود بە قەرەبوو بەریان بدەین .

٣١ / ﴿عَن ابْنِ عَبّاسٍ : أَنّ النّبِيّ ﷺ قَالَ لِأَصْحَابِهِ يَوْمَئِذٍ : إنّي قَدْ عَرَفْت أَنّ رِجَالاً مِنْ بَنِي هاشِمٍ وَغَيْرِهِمْ قَدْ أُخْرِجُوا كَرْهاً ، لا حَاجَةَ لَهُمْ بِقِتَالِنا ، فَمَنْ لَقِيَ مِنْكُمْ أَحَدَاً مِنْ بَنِي هاشِمٍ فَلا يَقْتُلْهُ ، وَمَنْ لَقِيَ أَبَا الْبَخْتَرِيّ بْنَ هِشامِ بْنِ الْحَارِثِ ابْنِ أَسَدٍ ، فَلا يَقْتُلْهُ ، وَمَنْ لَقِيَ الْعَبّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطّلِبِ ، عَمّ رَسولِ اللهِ ﷺ فَلا يَقْتُلْهُ ، فَإِنّهُ إِنَّمَا أُخْرِجَ مُسْتَكْرَهاً ، قَالَ فَقَالَ أَبُو حُذَيْفَةَ : أَنَقْتُلُ آبَاءَنَا وَأَبْنَاءَنَا وَإِخْوَتَنَا وَعَشِيرَتَنَا وَنَتْرُكُ الْعَبّاسَ ، وَاللهِ لَئِنْ لَقِيتُهُ لأُلْحِمَنّهُ (السّيْفَ) قَالَ ابْنُ هِشامٍ : وَيُقَالُ لأُلْجِمَنّهُ (السّيْفَ) قَالَ فَبَلَغَتْ رَسولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطّابِ يَا أَبَا حَفْصٍ (قَالَ عُمَرُ وَاللهِ : إنّهُ لأَوّلُ يَوْمٍ كَنَانِي فِيهِ رَسولُ اللهِ ﷺ بِأَبِي حَفْصٍ) أَيُضْرَبُ وَجْهُ عَمّ رَسولِ اللهِ ﷺ بِالسّيْفِ ؟ فَقَالَ عُمَرُ : يَا رَسولَ اللهِ ! دَعْنِي فَلأَضْرِبْ عُنُقَهُ بِالسّيْفِ فَوَاللهِ لَقَدْ نَافَقَ ، فَكَانَ أَبُو حُذَيْفَةَ يَقُولُ : مَا أَنَا بِآمِنٍ مِنْ تِلْكَ الْكَلِمَةِ الّتِي قُلْتُ يَوْمَئِذٍ ، وَلا أَزَالُ مِنْهَا خَائِفاً ، إلاّ أَنْ تُكَفِّرَهَا عَنّي الشّهَادَةُ ، فَقُتِلَ يَوْمَ الْيَمَامَةِ شَهِيداً﴾ .

واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕۆژە بە هاوەڵەکانی فەرموو : من ئاگادارم کە کۆمەڵێك لە پیاوانی بەنی هاشم ، وە غەیری وانیش بە زۆر هێنراونو ، بە شەرمدا کەوتوون ، وە مەبەستیان نەبووە جەنگ لە دژی ئێمە بکەن ، بۆیە هەر کامێك لە ئێوە هەریەك لە بەنی هاشمی بینی ، با نەیکوژێ ، وە ئەگەر (أبو الْبَخْتَرِيّ)تان بینی ، ئەویش مەکوژن ، وە هەر کەسێك (عَبّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطّلِبِ)ی مامی پێغەمبەری خوای ﷺ بینی ، با نەیکوژێ ، چونکە بە زۆر هێنراوە ، دەڵێ (أَبُو حُذَيْفَةَ) {کە کوڕی (عُتبة بن ربيعة)یە کە یەکێك بوو لە سەرانی دیاری قوڕەیشو لە جەنگی بەدردا کوژرا} ، گوتی : ئایا بابو باپیرانو کوڕانو برایانو هۆزی خۆمان بکوژینو لە عەبباسیش بگەڕێین ؟ وەڵڵاهی ئەگەر ببینم شمشێرەکەمی لە مل دەکەم ، ئنجا ئەمە بە پێغەمبەری خوا گەیشتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەری کوڕی خەتتابی فەرموو : ئەی (أَبَا حَفْصٍ) ! {(عمر) دەڵێ : تەنیا ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﷺ منی بە (کنية) بانگ کردوە ، کە ڕێزی زیاتری تێدایە} ئایا دەگونجێ بە شمشێر لە دەمو چاوی مامی پێغەمبەری خوا بدرێ ؟! ، عومەریش گوتی : ئەی پێغەمبەری

خوا ﷺ! لێم گەڕێ با بە شمشیر لە ملی بدەم ، دیارە مونافیقە ، دوایی (أَبُو حُذَيْفَةَ) دەیگوت : من بە هۆی ئەو وشەیەوە کە گوتم لە خۆم دڵنیا نیم ، وە هەر دەترسێم مەگەر بە شەهید بوون باجی ئەم وشەیە بدەمو بۆم بسڕێتەوە ، ئیدی ئەوە بوو لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو .

(دیارە مرۆڤ هەر مرۆڤە ، ڕەنگە سۆزی خزمایەتیی جووڵا بێ ، وایزانیوە پێغەمبەریش ﷺ لەبەر خزمایەتیی ئەو قسەیە دەکات ! کە بە حەقیقەت پێغەمبەری خوا ﷺ وەك خزمایەتیی قسەی نەکردووە ، وەك هەق زانیویەتی کە عەبباس هەر لە کاتی پەیمانی یەکەمو دووەمی عەقەبەوە پشتیوانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ، وە زانیویەشیەتی کە بە زۆر هێنراون) .

٣٢ / ﴿وَإِنّمَا نَهَى رَسولُ اللهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ أَبِي الْبَخْتَرِيّ لأَنّهُ كَانَ أَكَفّ الْقَوْمِ عَنْ رَسولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ بِمَكّةَ ، وَكَانَ لا يُؤْذِيهِ وَلا يَبْلُغُهُ عَنْهُ شَيْءٌ يَكْرَهُهُ ، وَكَانَ مِمّنْ قَامَ فِي نَقْضِ الصّحِيفَةِ الّتِي كَتَبَتْ قُرَيْشٌ عَلَى بَنِي هَاشِمٍ وَبَنِي الْمُطّلِبِ ، فَلَقِيَهُ الْمُجَذّرُ بْنُ ذِيَادٍ الْبَلَوِيّ ، حَلِيفُ الْأَنْصَارِ ، ثُمّ مِنْ بَنِي سَالِمِ بْنِ عَوْفٍ ، فَقَالَ الْمُجَذّرُ لأَبِي الْبَخْتَرِيّ : إنّ رَسولَ اللهِ ﷺ قَدْ نَهَانَا عَنْ قَتْلِك ، وَمَعَ أَبِي الْبَخْتَرِيّ زَمِيلٌ لَهُ قَدْ خَرَجَ مَعَهُ مِنْ مَكّةَ ، وَهُوَ جُنَادَةُ بْنُ مُلَيْحَةَ بِنْتِ زُهَيْرِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ أَسَدٍ ، وَجُنَادَةُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي لَيْثٍ ، وَاسْمُ أَبِي الْبَخْتَرِيّ : الْعَاصِ ، قَالَ وَزَمِيلِي؟ فَقَالَ لَهُ الْمُجَذّرُ : لا وَاللهِ مَا نَحْنُ بِتَارِكِي زَمِيلِك ، مَا أَمَرَنَا رَسولُ اللهِ ﷺ إلاّ بِك وَحْدَك ، فَقَالَ : لا وَاللهِ إذَنْ لأَمُوتَن أنَا وَهُوَ جَمِيعاً ، لا تَتَحَدّثُ عَنّي نِسَاءُ مَكّةَ ، أَنّي تَرَكْت زَمِيلِي حِرْصًا عَلَى الْحَيَاةِ فَقَالَ أبو الْبَخْتَرِيّ حِينَ نَازَلَهُ الْمُجَذّرُ وأبى إلا القِتال ، يرتجز : (لن يسلم إبن حرّةٍ حتى يموت أو يرى سَبِيلَهُ) فاقتتلا ، فقتله الْمُجَذّرُ بن زياد﴾ .

واتە : بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد کە (أَبُو الْبَخْتَرِيّ) بکوژرێ ، چونکە لە مەککە لە هەموو کەس زیاتر دەستی لە پێغەمبەر ﷺ دەپاراست ، وە ئازاری نەدەدا ، وە هیچ شتێکی پێ نەدەگەیشت لە (أَبُو الْبَخْتَرِيّ)یەوە کە پێی ناخۆش بێ ، وە ئەو (أَبُو الْبَخْتَرِيّ)ە ، یەکێك بوو لەوانەی کە ئەو پەیماننامە

(صحيفة)يەی دڕاند کە قورەيش لە دژی (بني هاشم و بني مطّلب) نوسيبوويان کە دابڕان (قطيعة)يان لەگەڵدا کردبوونو ، قسەيان لەگەڵدا نەکەن .

ئنجا (مُجَذّرُ بْنُ زِيَادٍ الْبَلَوِيّ) کە هاوپەيمانی ئەنصاڕ بوو لە (بَنِي سَالِمِ بْنِ عَوْفٍ) ، گەيشتە (أَبُو الْبَخْتَرِيّ) وە پێی گوت : پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووين کە تۆ نەکوژين ، بەڵام (أَبُو الْبَخْتَرِيّ) ڕەفيقێکی لەگەڵدا بوو لە مەککەوە لەگەڵی هاتبوو ، کە (جُنَادَةُ بْنُ مُلَيْحَةَ بِنْتِ زُهَيْرِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ أَسَدٍ) بوو ، وە (جُنَادَةَ) پیاوێك بوو لە (بَنِي لَيْث) ديارە (أَبُو الْبَخْتَرِيّ)يش ناوی (عاص) بوو ، (أَبُو الْبَخْتَرِيّ) گوتی : ئەدی ڕەفيقەکەم ؟ (مجذر) گوتی : نەخێر ، ئێمە هاوەڵەکەت لەگەڵ ئيزن نادەين ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنيا بە نسبەت تۆوە فەرمانی پێ کردووين ، (أَبُو الْبَخْتَرِيّ)يش گوتی : نە بە خوا دەبێ منو هاوەڵەکەم پێکەوە بمرين ، بۆ ئەوەی ئافرەتانی مەککە قسەم لەسەر نەکەن ، بڵێن : ڕەفيقەکەی خۆی لەبەر تۆزە ژيانێك تەسليم کرد ، ئنجا (أَبُو الْبَخْتَرِيّ) کاتێك کە چووە مەيدان بۆ ئەوەی شەڕ بکات ، لەگەڵ (مجذر) ، ئەو شيعرەی خوێندەوە کە دەڵێ : {کەسێك کوڕی ئافرەتێکی ئازاد بێ ڕەفيقی خۆی تەسليم ناکات ، هەتاکو يان دەمرێ ، ياخود ڕێی خۆی دەبينێ ڕزگاريان دەبێ} ئيدی شەڕيان کردو (مجذّر ابن زياد) کوشتی ، وە لە کۆڵی کردەوە ، (هەر چەند پێغەمبەر ﷺ وای فەرموو ، بەڵام ديارە بۆ خۆی خەتای خۆی بوو) ، دوايی (مجذر) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی : سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ناردوە ، زۆرم لەگەڵ هەوڵدا کە تەسليم ببێو بە ديلی بگرم ، بەڵام ڕازی نەبوو ، شەڕی لەگەڵدا کردمو ، ئيدی شەڕمان پێکەوە کردو کوژرا .

٣٣ / ﴿<u>مَقْتَلُ أُمَيّةَ بْنِ خَلَفٍ</u> : قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : حَدّثَنِي يَحْيَى بْنُ عَبّادِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ بْنِ الزّبَيْرِ ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : وَحَدّثَنِيهِ أَيْضًا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ وَغَيْرُهُمَا ، عَنْ عَبْدِ الرّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ كَانَ أُمَيّةُ بْنُ خَلَفٍ لِي صَدِيقًا بِمَكّةَ وَكَانَ اسْمِي عَبْدَ عَمْرٍو ، فَتَسَمّيْتُ ، حِينَ أَسْلَمْتُ : عَبْدَ الرّحْمَنِ ، وَنَحْنُ بِمَكّةَ ، فَكَانَ يَلْقَانِي إذْ نَحْنُ بِمَكّةَ فَيَقُولُ : يَا عَبْدَ عَمْرٍو ، أَرَغِبْتَ عَنْ اسْمٍ سَمّاكَهُ أَبَوَاك ؟ فَأَقُولُ : نَعَمْ ، فَيَقُولُ : فَإِنّي لا أَعْرِفُ الرّحْمَنَ ، فَاجْعَلْ بَيْنِي وَبَيْنَكَ شَيْئًا أَدْعُوك

بِهِ ، أَمّا أَنْتَ فَلا تُجِيبُنِي بِاسْمِكَ الأَوّلِ ، وَأَمّا أَنا فَلا أَدْعُوكَ بِمَا لا أَعْرِفُ ، قَالَ : فَكانَ إذَا دَعَانِي : يَا عَبْدَ عَمْرٍو ، لَمْ أُجِبْهُ ، قَالَ فَقُلْتُ لَهُ يَا أَبَا عَلِيّ اجْعَلْ مَا شِئْتَ ، قَالَ فَأَنْتَ عَبْدُ الإِلَهِ ، قَالَ : فقُلْتُ : نَعَمْ ، قَالَ : فَكُنْتُ إذَا مَرَرْتُ بِهِ قَالَ : يَا عَبْدَ الإِلَهِ ، فَأُجِيبُهُ فَأَتَحَدّثُ مَعَهُ .

حَتّى إذَا كَانَ يَوْمَ بَدْرٍ مَرَرْتُ بِهِ وَهُوَ وَاقِفٌ مَعَ ابْنِهِ عَلِيّ بْنُ أُمَيّةَ آخُذٌ بِيَدِهِ ، وَمَعِي أَدْرَاعٌ قَدْ اسْتَلَبْتُهَا ، فَأَنَا أَحْمِلُهَا، فَلَمّا رَآنِي قَالَ لِي : يَا عَبْدَ عَمْرٍو ! فَلَمْ أُجِبْهُ ، فَقَالَ يَا عَبْدَ الإِلَهِ ! فقُلْتُ : نَعَمْ قَالَ : هَلْ لَكَ فِيّ ، فَأَنَا خَيْرٌ لَكَ مِنْ هَذِهِ الأَدْرَاعِ الّتِي مَعَكَ ؟ قَالَ قُلْتُ : نَعَمْ ها اللّهِ إذًا ، قَالَ : فَطَرَحْتُ الأَدْرَاعَ مِنْ يَدِي ، وَأَخَذْتُ بِيَدِهِ وَيَدِ ابْنِهِ ، وَهُوَ يَقُولُ : مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ قَطّ ، أَمَا لَكُمْ حَاجَةٌ فِي اللّبَنِ ؟ (قَالَ) : ثُمّ خَرَجْتُ أَمْشِي بِهِمَا ، قَالَ ابْنُ هِشَامٍ : يُرِيدُ بِاللّبَنِ أَنّ مَنْ أَسَرَنِي افْتَدَيْتُ مِنْهُ بِإِبِلٍ كَثِيرَةِ اللّبَنِ .

قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : حَدّثَنِي عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ أَبِي عَوْنٍ عَنْ سَعْدِ بْنِ إبْرَاهِيمَ عَنْ أَبِيهِ عَبْدِ الرّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ، قَالَ ، قَالَ لِي أُمَيّةُ بْنُ خَلَفٍ ، وَأَنَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ ابْنِهِ آخِذٌ بِأَيْدِيهِمَا : يَا عَبْدَ الإِلَهِ مَنْ الرّجُلُ مِنْكُمْ الْمُعْلِّمُ بِرِيشَةِ نَعَامَةٍ فِي صَدْرِهِ ؟ قَالَ قُلْتُ : ذَاكَ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطّلِبِ ، قَالَ ذَاكَ الّذِي فَعَلَ بِنَا الأَفَاعِيلَ ، قَالَ عَبْدُ الرّحْمَنِ : فَوَاللّهِ إنّي لأَقُودُهُمَا ، إذْ رَآهُ بِلالٌ مَعِي - وَكَانَ هُوَ الّذِي يُعَذّبُ بِلالاً بِمَكّةَ عَلَى تَرْكِ الإِسْلامِ ، فَيُخْرِجُهُ إلَى رَمْضَاءِ مَكّةَ إذَا حَمِيَتْ ، فَيُضْجِعُهُ عَلَى ظَهْرِهِ ، ثُمّ يَأْمُرُ بِالصّخْرَةِ الْعَظِيمَةِ فَتُوضَعُ عَلَى صَدْرِهِ ، ثُمّ يَقُولُ : لا تَزَالُ هَكَذَا أَوْ تُفَارِقَ دِينَ مُحَمّدٍ ، فَيَقُولُ بِلالٌ : أَحَدٌ أَحَدٌ .

قَالَ فَلَمّا رَآهُ ، قَالَ : رَأْسُ الْكُفْرِ أُمَيّةُ بْنُ خَلَفٍ ، لا نَجَوْتُ إنْ نَجا ، قَالَ قُلْتُ : أَيْ بِلالٌ أَبِأَسِيرَيّ ؟ قَالَ : لا نَجَوْت إنْ نَجا ، قَالَ قُلْت : أَتَسْمَعُ يَا ابْنَ السوداءِ ؟ قَالَ : لا نَجَوْت إنْ نَجا ، قَالَ : ثُمّ صَرَخَ بِأَعْلَى صَوْتِهِ : يَا أَنْصَارَ اللّهِ ! رَأْسُ الْكُفْرِ أُمَيّةُ بْنُ خَلَفٍ ، لا نَجَوْتُ إنْ نَجا ، قَالَ : فَأَحَاطُوا بِنَا حَتّى جَعَلُونَا فِي مِثْلِ الْمَسْكَةِ وَأَنَا أَذُبّ عَنْهُ ، قَالَ فَأَخْلَفَ رَجُلٌ السّيْفَ ، فَضَرَبَ رِجْلَ ابْنِهِ فَوَقَعَ ، وَصَاحَ أُمَيّةُ صَيْحَةً مَا سَمِعْتُ مِثْلَهَا قَطّ ، قَالَ فَقُلْتُ : أُنْجُ بِنَفْسِكَ ، وَلا نَجَاءَ بِكَ ، فَوَاللّهِ مَا أُغْنِي

عَنْك شيئًا ، قَالَ فَهَيَّروهُمَا بِأَسْيَافِهِمْ ، حَتّى فَرَغُوا مِنْهُمَا ، قَالَ فَكَانَ عَبْدُ الرّحْمَنِ يَقُولُ يَرْحَمُ اللّهُ بِلالاً ، ذَهَبَتْ أَدْرَاعِي ، وَفَجَعَنِي بِأَسِيرَيّ﴾.

کوژرانی ئومەییەی کوڕی خەلەف : {ئومەییە کوڕی ئەو کابرایە بوو ، کە بیلالی حەبەشیی ئەشکەنجە دەداو ، بەردێکی گەورەی لەسەر سینگی دادەناو ، بیلالیش دەیگوت (أَحَدٌ أَحَدٌ) دەویویست هەڵیگێڕێتەوە}.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ : یەحیای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو بەکرو غەیری ئەویش لە عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوفەوە گوتوویانە ، دەگێڕنەوە : کە گوتوویەتی : ئومەییەی کوڕی خەلەف برادەرم بوو لە مەککە ، دەڵێ : ئەو کاتە من ناوم (عَبْد عَمْرٍو) بوو ، یانی : بەندەی عەمر ، کاتێك مسوڵمان بووم ، ناوم لە خۆم نا عەبدورڕەحمان ، وە ئێمە لە مەککە بووین ، هەر کاتێك ئومەییەی کوڕی خەلەف دەگەیشتە من ، دەیگوت : ئەی (عَبْد عَمْرٍوا) ئایا ئەو ناوە کە دایكو بابت لێیان ناوی ، لێی پەشیمان بوویەوە ؟ دەڵێ : منیش گوتم : بەڵێ ، دەڵێ ، گوتی : بەڵام من (رحمن) ناناسم تۆ نیشانەیەك ، شتێکم بۆ لە نێوان خۆمو خۆت دا دابنێ ، تاکو من تۆی پێ بانگ بکەم ، تۆ بە ناوی یەکەمت ، وەڵام مەدەوە ، بەڵام منیش بە ناوی دووەمت بانگت ناکەم ، ناوێك کە من نایناسم ، دەڵێ : بۆیە ئەو کاتە هەروا بانگی دەکردم ، دەیگوت (يا عَبْدُ عَمْرٍو) منیش وەڵامم نەدەدایەوە ، دەڵێ : گوتم : ئەی ئەبو عەلی ! باشە چ ناوێکم بۆ دادەنێی ؟ گوتی : (يَا عَبْدَ الإِلَهِ) یانی : بەندەی پەرستراو دەڵێ : منیش گوتم : زۆر باشە ، دەڵێ کاتێك کە بەلایدا ڕەت دەبووم دەیگوت (يَا عَبْدَ الإِلَهِ) بەوە وەڵامم دەدایەوە ، ئیدی قسەم لەگەڵدا دەکرد .

هەتاکو لە ڕۆژی بەدردا بەلایدا تێپەڕیم لەگەڵ عەلی کوڕی ئومەییە پێکەوە بوون ، دەستی یەکدیان گرتبوو ، منیش چەند زرێیەکم پێ بوون ، بە غەنیمەتم گرتبوون ، کاتێك کە منی بینی ، گوتی : (يا عَبْد عَمْرٍوا) منیش وەڵامم نەدایەوە ، دوایی گوتی : (يا عَبْدَ الإِلَهِ !) منیش گوتم : بەڵێ ، گوتی : ئیشت بە من نیە ، (واتە : من کە بە دیل بگری) ، من باشترم بۆ تۆ لەو زرێیانەی پێتن (یانی : قەرەبووی من زۆر لە قیمەتی زرێیەکان زیاترە) ، دەڵێ

گوتم : باشە ، زرێیەکانم فڕێ دا ، وە دەستی خۆی‌و کوڕەکەیم گرت ، ئنجا لەو کاتەدا ئومەییەی کوڕی خەلەف (کە دیارە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندو ناودار بووە) ، دەیگوت : وەڵاهی هەرگیز شتی وام نەبینیوە ، ئەوە پێویستیتان بە شیر نیە ، واتە : پێویستیتان بە حوشتران نیە لە بەرانبەر قەرەبووی مندا وەریبگرن ؟ دەڵێ : دوایی ڕۆیشتم‌و لەگەڵ خۆم دا هەردووکیانم برد ، (ئنجا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دەڵێ : ) لە کاتێکدا کە من لە نێوان خۆی‌و کوڕەکەیدا بووم ، بە دەستمەوە بوون بە دیلیی ، گوتی : **(يا عَبْدَ الإِلَهِ)** ئەو پیاوەی کە پەڕی نەعامەیەکی لە سینگی خۆیدا بوو کێ بوو ، ئەوەی خۆی نیشانەدار کردبوو ؟ دەڵێ گوتم : ئەوە حەمزەی کوڕی **(عبدالمطلب)** بوو ، گوتی : ئەوە بوو ئەوەی بەسەرهێناین ، (واتە : زۆری لێ کوشتن) ، ئنجا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دەڵێ : لە کاتێك دا دەمبردن ، بیلال ئەوی بینی ، دیارە ئومەییەی کوڕی خەلەف ئەو کەسە بوو کە لە مەککە بیلالی ئازار دەدا ، بۆ ئەوەی واز لە ئیسلام بێنێ ، لەو گەرمای مەککە ، کاتێك دنیا زۆر گەرم دەبێ ، دەیهێنایە دەرو لەسەر پشت پاڵی دەخست ، وە گاشە بەردێکی گەورەی لەسەر سینگی دادەنا ، وە دەیگوت : یان دەبێ ئاوابی ، یان دەبێ واز لە ئایینی موحەممەد بێنی ، یاخود دەمری ، بیلالیش هەر دەیگوت : خوا تاکە تاك **(أحد أحد)** .

گوتی : ئەوە سەری کوفر ئومەییەی کوڕی خەلەفە ! ئەگەر ئەو دەرباز بێ من دەرباز نەبم ، دەڵێ گوتم : ئەی بیلال ! ئەوە دیلی منە ، گوتی : من دەرباز نەبم ، ئەگەر ئەو دەرباز بێ ، دەڵێ : منیش لێی تووڕە بووم ، گوتم : **(أَتَسْمَعُ يَا ابْنَ السوداءِ)** ئەی کوڕی ئافرەتە ڕەشەکە ! گوێت لێ نیە ؟ دیسان بیلال دووبارەی کردەوە ، گوتی : ئەگەر دەرباز ببێ من دەرباز نەبم ، دوایی بە دەنگی بەرز هاواری کرد ، گوتی : ئەی پشتیوانانی خوا ! سەری کوفر ، ئومەییەی کوڕی خەلەفە ، ئەگەر ئەو دەربازی بێ ، من دەرباز نەبم ، دەڵێ : دەوریان داین ، هەتا وایان لێکردین ، وەك بمانخەنە نێو بیرێك ، وە منیش بەرگرییم لێ دەکرد ، یەکێك لەوان لە پشت ڕا شمشێرەکەی لێ وەرگرتو لە لاقی عەلی کوڕەکەی ئومەیەی کوڕی خەلەفی دا ، ئیدی ئەو کەوت ، ئومەییەش هاوارێکی کرد ، دەڵێ : قەد دەنگی وام نەبیستوە .

ئنجا پێم گوت : ئومەییە ! خۆت دەرباز بکە ، من تازە چیدیکە بەرگریم بۆ لە تۆ ناکرێ ، دەڵێ : بە شمشێرەکانیان کەوتنە سەریان هەتاکو لێیان بوونەوە ، ئنجا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دوایی دەیگوت : خوا ڕەحم بە بیلال بکات ، زرێیەکانیشم چوون ، وە دیلەکانیشی کوشتم .

٣٤ / ﴿شُهُودُ الْمَلائِكَةِ وَقْعَةَ بَدْرٍ : قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ : حَدّثَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ ، عَنْ بَعْضِ بَنِي سَاعِدَةَ عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ مَالِكِ بْنِ رَبِيعَةَ ، وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا ، قَالَ بَعْدَ أَنْ ذَهَبَ بَصَرُهُ : لَوْ كُنْتُ الْيَوْمَ بِبَدْرٍ وَمَعِي بَصَرِي ، لأَرَيْتُكُمْ الشّعْبَ الّذِي خَرَجَتْ مِنْهُ الْمَلائِكَةُ لا أَشُكّ فِيهِ وَلا أَتَمَارَى﴾ .

ئامادەبوونی فریشتەکان لە جەنگی بەدردا : (ابْنُ إِسْحَاقَ) دەڵێ : عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر گێڕاویەتەوە لە هەندێك لە (بَنِي سَاعِدَةَ)ەوە لە (أَبِي أُسَيْدٍ مَالِكِ بْنِ رَبِيعَةَ) کە لە جەنگی بەدردا بەشدار بووە ، دوایی چاوی نەماون و کوێر بووە ، گوتوویەتی : (لَوْ كُنْتُ الْيَوْمَ بِبَدْرٍ ، وَمَعِي بَصَرِي لأَرَيْتُكُمْ الشّعْبَ الّذِي خَرَجَتْ مِنْهُ الْمَلائِكَةُ لا أَشُكّ فِيهِ وَلا أَتَمَارَى).

واتە : ئەگەر من ئێستا چاوم هەبایە ، ئێستا لە بەدر بام ، ئەو شوێنەم پێشان دەدان ، کە فریشتەکان لێیەوە دەهاتن ، وە لەوبارەوە هیچ گومانم نیە .

{هەڵبەتە کە فریشتەکان ـ وەك دوایی باسی دەکەین ـ بەشدارییان کردوە ، بەشداریی مەعنەویی نەك بەشداریی کردەیی ، واتە : کەسیان نەکوشتوە ، بەڵکو بەشداریی یەکەیان ئەوەبووە کە ترسیان خستۆتە نێو دڵی دوژمن ، وە ئیماندارانیشیان دڵخۆش کردوە} .

٣٥ / ﴿فَلَمّا فَرَغَ رَسولُ اللهِ ﷺ مِنْ عَدُوّهِ ، أَمَرَ بِأَبِي جَهْلٍ أَنْ يُلْتَمَسَ فِي الْقَتْلَى ، وَكَانَ أَوّلَ مَنْ لَقِيَ أَبَا جَهْلٍ ، كَمَا حَدّثَنِي ثَوْرُ بْنُ يَزِيدَ ، عَنْ عِكْرِمَةَ ، عَنْ ابْنِ عَبّاسٍ ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ أَيْضًا قَدْ حَدّثَنِي ذَلِكَ قَالا : قَالَ مُعَاذُ ابْنُ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ ، أَخُو بَنِي سَلَمَةَ سَمِعْتُ الْقَوْمَ وَأَبُو جَهْلٍ فِي مِثْلِ الْحَرَجَةِ ، وَهُمْ يَقُولُونَ أَبُو الْحَكَمِ لا يُخْلَصُ إلَيْهِ ، قَالَ : فَلَمّا سَمِعْتُهَا جَعَلْتُهُ مِنْ شَأْنِي ، فَصَمَدْتُ نَحْوَهُ ، فَلَمّا أَمْكَنَنِي حَمَلْتُ عَلَيْهِ فَضَرَبْتُه ضَرْبَةً أَطَنّتْ قَدَمَهُ بِنِصْفِ سَاقِهِ ، فَوَاللهِ مَا

شَبَّهْتها حِينَ طَاحَتْ إلاَّ بِالنَّوَاةِ تُطِيحُ مِنْ تَحْتِ مِرْضَخَة النَّوَى ، حِينَ يُضْرَبُ بِهَا ، قَالَ : وَضَرَبَنِي ابْنُهُ عِكْرِمَةُ عَلَى عَاتِقِي ، فَطَرَح يَدِي ، فَتَعَلَّقَتْ بِجلْدَةٍ مِنْ جَنْبِي ، وَأَجْهَضَنِي الْقِتَالُ عَنْهُ ، فَلَقَدْ قَاتَلْتُ عَامّةَ يَوْمِي ، وَإِنّي لأَسْحَبُهَا خَلْفِي ، فَلَمّا آذَتْنِي ، وَضَعْتُ عَلَيْهَا قَدَمِي ، ثُمّ تَمَطّيْتُ بِهَا عَلَيْهَا حَتّى طَرَحْتُهَا ، قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : ثُمّ عَاشَ بَعْدَ ذَلِك حَتّى كَانَ زَمَانُ عُثْمَانَ ، ثُمّ مَرّ بِأَبِي جَهْلٍ وَهُوَ عَقِيرٌ ، مُعَوّذُ بْنُ عَفْرَاءَ ، فَضَرَبَهُ حَتّى أَثْبَتَهُ ، فَتَرَكَهُ وَبِهِ رَمَقٌ ، وَقَاتَلَ مُعَوّذٌ حَتّى قُتِلَ ، فَمَرّ عَبْدُ اللّهِ بْنُ مَسْعُودٍ بِأَبِي جَهْلٍ ، حِينَ أَمَرَ رَسولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُلْتَمَسَ فِي الْقَتْلَى ، وَقَدْ قَالَ لَهُمْ رَسولُ اللّهِ ﷺ (فِيمَا بَلَغَنِي) أُنْظُرُوا ، إنْ خَفِيَ عَلَيْكُمْ فِي الْقَتْلَى ، إلَى أَثَرِ جُرْحٍ فِي رُكْبَتِهِ فَإِنّي ازْدَحَمْتُ يَوْمًا أَنا وَهُوَ عَلَى مَأْدُبَةٍ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ جُدْعَانَ ، وَنَحْنُ غُلامَانِ وَكُنْتُ أَشَفّ مِنْهُ بِيَسِيرٍ ، فَدَفَعْتُهُ فَوَقَعَ عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَجُحِشَ فِي إحْدَاهُمَا جَحْشاً ، لَمْ يَزَلْ أَثَرُهُ بِهِ ، قَالَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ مَسْعُودٍ : فَوَجَدْته بِآخِرِ رَمَقٍ ، فَعَرَفْتُهُ ، فَوَضَعْتُ رِجْلِي عَلَى عُنُقِهِ ، قَالَ : وَقَدْ كَانَ ضَبَثَ بِي مَرّةً بِمَكة ، فَآذَانِي وَلَكَزَنِي ، ثُمّ قُلْت لَهُ : هَلْ أَخْزَاك اللّهُ يَا عَدُوّ اللّهِ ؟ قَالَ وَبِمَاذَا أَخْزَانِي ، أَأَعْمَدُ مِنْ رَجُلٍ قَتَلْتُمُوهُ ، أَخْبِرْنِي لِمَنْ الدّائِرَةُ الْيَوْمَ ؟ قَالَ قُلْت : لِلّهِ وَلِرَسولِهِ ، قَالَ لِي : لَقَدْ ارْتَقَيْتَ مُرْتَقًى صَعْبًا يَا رُوَيْعِي الْغَنَمِ ، قَالَ : ثُمّ احْتَزَزْت رَأْسَهُ ، ثُمّ جِئْتُ بِهِ رَسولَ اللّهِ ﷺ فَقُلْت : يَا رَسولَ اللّهِ هَذَا رَأْسُ عَدُوّ اللّهِ أَبِي جَهْلٍ ، قَالَ : فَقَالَ رَسولُ اللّهِ ﷺ : آللّهِ الّذِي لا إلَهَ غَيْرُهُ ، قَالَ : وَكَانَتْ يَمِينَ رَسولِ اللّهِ ﷺ قَالَ : قُلْت : نَعَمْ وَاَللّهِ الّذِي لا إلَهَ غَيْرُهُ ، ثُمّ أَلْقَيْتُ رَأْسَهُ بَيْنَ يَدَيْ رَسولِ اللّهِ ﷺ فَحَمِدَ اللّهَ﴾.

واتە : دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە دوژمن بووەوە ، فەرمانی کرد : بگەڕێن ئەبو جەهل بدۆزنەوە لە نێو کوژراواندا ، (دەیانزانی کە کوژراوە) ، یەکەمین کەسیش کە گەیشتە ئەبو جەهل وەك (ثور بن زيد) لە عیکرمەوە ئەویش لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە ، وە لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبو بەکری صیددیقەوە دیسان گێڕاویانەتەوە ، گوتوویانە : یەکەمین کەس کە گەیشتە ئەبو جەهل لە جەنگدا (مُعَاذُ ابْنُ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ ، أَخُو بَنِي سَلَمَةَ) دەڵێ : بیستم کە ئەبو جەهل وەك لە جەنگەڵێك دابێ ، ئاوا دەوریان دابوو ، پارێزگارییان لێ دەکرد ، وە دەیانگوت : بێگومان کەس زەفەر بە ئەبو لحەکەم ناباتا ، منیش بەرەو رووی

چووم ، وە کاتێك کە دەرفەتم لێ بینی ، زەبرێکم لێدا ، لاقیم لە خوار ئەژنۆیەوە پەڕاند ، دەنگێکیشی لێ هات لەگەڵ پەڕینی ، دەڵێ : کاتێك کە پەڕی ، هەروەك ئەو دەنکە خورمایەی هاتە بەرچاوم کە دەیخەنە بن (مِرْضَخة) بۆ ئەوەی وردی بکەن ، (دیارە ئامێرێك هەبووە بە ناوی (مِرْضَخة) دەنکە خورمایان پێ ورد کردوە ، بۆ ئەوەی بیکەن بە ئالف یانی : دەنکە خورما کە دەردەچێ لەبن ئەو شتەی کە لێی دەدەن ، لاقی کە پەڕی ، ئاوام هاتە بەرچاو) ، ئنجا دەڵێ : عیکرەمەی کوڕی ئەبو جەهلیش زەبرێکی لێدام ، لە قۆڵی دام ، قۆڵی پەڕاندم ، بەلام بە پێستەکەیەوە مابوو ، هەر شەڕم پێوە کرد ، هەتا شەڕەکە کۆتایی هات ، هەر لە دوای خۆمدا ڕام دەکێشا ، کاتێك کە زۆر تینی بۆ هێنام ، لاقم لەسەر داناو فڕێمدا لە کۆڵ خۆم کردەوە ، {چ ئازایەتییو چ خۆڕاگرییو غیرەتێکە !} .

(ابْنُ إسْحَاقَ) دەڵێ : ئەو هاوەڵە خوا لێی ڕازی بێ (مُعَاذُ ابْنُ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ) تاکو سەردەمی ڕۆژگاری عوسمانیش هەر ژیاو ئەو کاتە مرد ، (ابْنُ إسْحَاقَ) دەڵێ : دوایی (معَوِّذ بن عَفراء) بە لای ئەبو جەهلدا تێپەڕی ، بە برینداریی کەوتبوو ، لەوێ لێی دا ، تاکو تەواو لە پەلو پۆی خست ، بەلام جارێ هەر ژیانی تێدا مابوو ، وە (معوذ)یش شەڕی کرد هەتا کوژرا ، (دیارە کافرەکانیش ئەویان کوشتوە) ئنجا عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود بە لای ئەبو جەهلدا تێپەڕی بە برینداریی ، کە لە گیانەلادا بوو ، پێش ئەوەی گیانی دەرچێ ، کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بگەڕێن لە نێو کوژراوەکاندا بۆ ئەبو جەهل ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون : بگەڕێن لە نێو کوژراواندا ئەگەر لێتان پەنهان بوو ، نەتان دۆزیەوە ، تەماشای ئەژنۆی کوژراوەکان بکەن ، کاتی خۆی منو ئەو لەسەر سفرەیەکی عەبدوڵلای کوڕی جیدعان گچکە بووین ، بەلام من لەوی با خۆشتر بووم ، پاڵەپەستەمان دەکرد ، پاڵێکم پێوەنا ، کەوت ، شوێنی بەسەر ئەژنۆیەوە مابوو ، تەماشای سەر ئەژنۆیەکەی بکەن ، شوێنەکەی پێوە دەبینن ، عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەڵێ : لە گیانەلادا بینیم ، منیش پێم لەسەر ملی دانا ، چونکە کاتی خۆی منی لە مەککە گرتبوو زۆر منی ئەزیەت دابوو ، زۆری لێ دابووم ، پێم گوت : ئەی دوژمنی خوا ! خوا سەرشۆڕی کردی ، ئەویش گوتی : جا بە چ سەرشۆڕ بووم

دەزانن چ پیاوێکتان کوشتوە ؟ {یانی : من کوژراوم و سەرشۆڕ نەبووم } ئەریێ پێم بڵێ : دەنگو باسی شەڕ چییە ؟! گوتم : وەڵڵا سەرەنجامی شەڕ بە قازانجی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ، پێی گوتم : بە ڕاستی چوویە شوێنێکی زۆر بڵند ، شوانۆکەی مەڕان ، {یانی : تۆ ئێستا کە چوویە سەر ملی من ، چوویە سەر شوێنێکی زۆر بڵند} ، دەڵێ : دوایی سەرەکەم لێکردەوەو بۆ پێغەمبەری خوام ﷺ هێناو گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! ئەوە سەری دوژمنی خوا (أبو جهل)ە ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : تۆ ئەو خوایەی بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی دی نیە ، ئەوە سەری ئەوە ؟ دەڵێ : سوێندی پێغەمبەری خوا وابوو ، گوتم : بەڵێ سوێند بەو خوایەی کە جگە لەو هیچ پەرستراوی دی نین ، دوایی سەرەکەم فڕێدایە پێش پێغەمبەر ، ئەویش ستایشی خوای کرد ، {کە ئەو دوژمنەی لە کۆڵ بووەوە ، کە سەرکردەی سووپایەکەش بوو ، وە ئەگەر ئەویش نەبووایە ، ڕەنگە ئەو شەڕە بە مسوڵمانان هەر نەفرۆشرابایە} .

٣٦ / ﴿أَنّ عُمَرَ ابْنَ الْخَطّابِ قَالَ لِسَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ وَمَرّ بِهِ : إنّي أَرَاك كَأَنّ فِي نَفْسِك شيئًا ، أَرَاك تَظُنّ أَنّي قَتَلْتُ أَبَاك ، إنّي لَوْ قَتَلْته لَمْ أَعْتَذِرْ إلَيْك مِنْ قَتْلِهِ ، وَلَكِنّي قَتَلْتُ خَالِي الْعَاصِ بْنَ هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ ، فَأَمّا أَبُوك فَإِنّي مَرَرْتُ "بِهِ" وَهُوَ يَبْحَثُ بَحْثَ الثّوْرِ بِرَوْقِهِ فَحُدْتُ عَنْهُ ، وَقَصَدَ لَهُ ابْنُ عَمّهِ عَلِيّ ، فَقَتَلَه﴾ .

واتە : عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ لە کاتێکدا بە لای سەعیدی کوڕی عاصدا تێپەڕی گوتی : وا هەست دەکەم شتێکت لە دڵدایە ، ئایا پێت وایە من لە جەنگی بەدردا بابتم کوشتوە ؟! ئەگەر کوشتبام عوزرم بۆ نەدەهێنایەوە بۆ کوشتنی ، من خاڵی خۆم (الْعَاصِ بْنَ هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ)م کوشت ، بەڵام بابت بەلایدا تێپەڕیم ، وەك چۆن گاجووت قۆچ لە زەوی دەژەنێ بۆ شەڕێ ، ئاوا لە کەسێك دەگەڕا ، شەڕی لەگەڵدا بکات ، من خۆم لێی لادا ، وە ئامۆزایەکەی عەلی (واتە : عەلی کوڕی ئەبی تالیب خوا لێی ڕازی بێ) بۆی چوو کوشتی .

٣٧ / ﴿وَقَاتَلَ عُكَاشَةُ بْنُ مُحْصَنِ بْنِ حُرْثَانَ الأَسَدِيّ ، حَلِيفُ بَنِي عَبْدِ شَمْسِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ يَوْمَ بَدْرٍ بِسَيْفِهِ حَتّى انْقَطَعَ فِي يَدِهِ ، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَعْطَاهُ جِذْلاً مِنْ حَطَبٍ فَقَالَ : قَاتِلْ بِهَذَا يَا عُكَاشَةُ! فَلَمّا أَخَذَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ

هَزَّهُ فَعَادَ سَيْفًا فِي يَدِهِ ، طَوِيلَ الْقَامَةِ ، شَدِيدَ الْمَتْنِ ، أَبْيَضَ الْحَدِيدَةِ ، فَقَاتَلَ بِهِ حَتّى فَتَحَ اللّٰهُ تَعَالَى عَلَى الْمُسْلِمِينَ ، وَكَانَ ذَلِكَ السَّيْفُ يُسَمّى : الْعَوْنَ ، ثُمّ لَمْ يَزَلْ عِنْدَهُ يَشْهَدُ بِهِ الْمَشَاهِدَ مَعَ رَسولِ اللّٰهِ ﷺ حَتّى قُتِلَ فِي الرِّدّةِ ، وَهُوَ عِنْدَهُ ، قَتَلَهُ طُلَيْحَةُ بْنُ خُوَيْلِدٍ الأَسَدِيّ ، قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : وَعُكاشَةُ بْنُ مُحْصَنٍ الّذِي قَالَ لِرَسولِ اللّٰهِ ﷺ حِينَ قَالَ رَسولُ اللّٰهِ ﷺ : يَدْخُلُ الْجَنّةَ سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ أُمّتِي عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ ، قَالَ يَا رَسولَ اللّٰهِ ! أُدْعُ اللّٰهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ قَالَ إنّكَ مِنْهُمْ ، أَوْ اللّهُمّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ ، فَقَالَ : يَا رَسولَ اللّٰهِ! أُدْعُ اللّٰهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ ، فَقَالَ : سَبَقَكَ بِهَا عُكاشَةُ وَبَرَدَتِ الدّعْوَةُ) .

واتە : (عُكاشَةُ بْنُ مُحْصَنِ بْنِ حُرْثَانَ الأَسَدِيّ) هاوپەیمانی (بَنِي عَبْدِ شَمْسِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ) لە جەنگی بەدردا شەڕی کرد ، هەتا شمشێرەکە لە دەستیدا شکا ، ئنجا هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دارێکی پێدا فەرمووی : (قَاتِلْ بِهَذَا يَا عُكاشَةُ!) بەمە جەنگ بکە ، ئەی عوکاشە ! دەڵێ کاتێك لە پێغەمبەری خوای وەرگرت ، ڕای وەشاند بوو بە شمشێرێك لە دەستیدا ، شمشێرێکی درێژ بەهێزو سپی برندە ، ئیدی ئەو ڕۆژە هەر شەڕی پێکرد تاکو خوای بەرز مسوڵمانانی سەرخست ، وە ئەو شمشێرە هەر لە دەستیدا مایەوە ، پێی دەگوترا : (الْعَوْن) دوایی هەر لەلای مایەوە ، تاکو لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا کوژرا ، (طُلَيْحَةُ بْنُ خُوَيْلِدٍ الأَسَدِيّ) عوکاشەی کوشت ، ئنجا عوکاشەی کوڕی موحصەن ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك فەرمووی : حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتی من لەسەر شێوەی مانگ لە شەوی (١٥)ی دا (ئەوەندە جوانن) دەچنە بەهەشت ، (لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ : بەبێ حیساب دەچنە بەهەشتەوە) عوکاشە گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! دوعا بکە ، من یەکێك بم لەوانە ، فەرمووی تۆ لەوانی ، یان فەرمووی : ئەی خوایە ! لەوانی بگێڕە ، دوایی پیاوێك لە پشتیوانان هەڵسا گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! دوعا بکە منیش لەوان بم ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : عوکاشە پێش تۆ کەوتووە دوعایەکەش گیرابووەو تەواو بوو .

٣٨ / ﴿عَنْ عَائِشَة ، قَالَتْ : لَمّا أَمَرَ رَسولُ اللهِ ﷺ بِالْقَتْلى أنْ يُطْرَحُوا فِي الْقَلِيبِ ، طُرِحُوا فِيهِ ، إلاّ مَا كَانَ مِنْ أُمَيّةَ بْنِ خَلَفٍ ، فَإنّهُ انْتَفَخَ فِي دِرْعِهِ فَمَلأَهَا ، فَذَهَبُوا لِيُحَرّكُوهُ فَتَزَايَلَ لَحْمُهُ ، فَأَقَرّوهُ وَأَلْقَوْا عَلَيْهِ مَا غَيّبَهُ مِنَ التّرَابِ ، فَلَمّا أَلْقَاهُمْ فِي الْقَلِيبِ ، وَقَفَ عَلَيْهِمْ رَسولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ : يَا أَهْلَ الْقَلِيبِ ! هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَكُمْ رَبّكُمْ حَقّاً ؟ فَإنّي قَدْ وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي رَبّي حَقّاً ، قَالَتْ : فَقَالَ لَهُ أَصْحَابُهُ يَا رَسولَ اللهِ ! أَتُكَلّمُ قَوْمًا مَوْتَى؟ فَقَالَ لَهُمْ : لَقَدْ عَلِمُوا أنّ مَا وَعَدَهُمْ رَبّهُمْ حَقّاً ، قَالَتْ عَائِشَة : وَالنَاسُ يَقُولُونَ : لَقَدْ سَمِعُوا مَا قُلْتَ لَهُمْ ، وَإنّمَا قَالَ لَهُمْ رَسولُ اللهِ ﷺ (لَقَدْ عَلِمُوا) .

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ، قَالَ : سَمِعَ أَصْحَابُ رَسولِ اللّهِ ﷺ رَسولَ اللّهِ ﷺ مِنْ جَوْفِ اللّيْلِ وَهُوَ يَقُولُ : يَا أَهْلَ الْقَلِيبِ ! يَا عُتْبَةُ بْنَ رَبِيعَةَ ! وَيَا شَيبَةُ بْنَ رَبِيعَةَ ! وَيَا أُمَيّةُ بْنَ خَلَفٍ ! وَيَا أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ ! فَعَدّدَ مَنْ كَانَ مِنْهُمْ فِي الْقَلِيبِ : هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبّكُمْ حَقّاً ، فَإنّي قَدْ وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي رَبّي حَقّاً ؟ فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ : يَا رَسولَ اللهِ ! أَتُنَادِي قَوْمًا قَدْ جُيّفُوا ؟ قَالَ : مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ ، مِنْهُمْ ، وَلَكِنّهُمْ لا يَسْتَطِيعُونَ أنْ يُجِيبُونِي) .

واتە : عائیشە خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە کوژراوەکان فڕێ بدرێنە (قَلِيب)ەوە ، {(قَلِيب) : بریتییە لە بیرێك چاك نەکرابێ ، یاخود چاڵاییەك} جگە لە ئومەییەی کوڕی خەلەف ، چونکە ئەو زرێیەکەی کە لەبەری دابوو تێیدا ئاوسا بوو ، چوون بیجووڵێنن ، بۆ ئەوەی بیبەن بۆ نێو ئەو چاڵە ، بەڵام گۆشتەکەی لێ بووەوە لەوێ هێشتیانەوە ، وە خۆڵو بەردیان بەسەردا کرد ، بۆ ئەوەی بشارردرێتەوە .

ئنجا کاتێك لە (قَلِيب) هاویشتران پێغەمبەر ﷺ لەسەریان ڕاوەستاو فەرمووی : ئەی ئەوانەی لەم چاڵەدان ! ئایا ئەوەی پەروەردگارتان بەڵێنی پێدابوون ، هەڕەشەی پێ لێکردبوون ، هاتە دی؟ من ئەوەی پەروەردگارم بەڵێنی پێدابووم ، موژدەی پێدابووم ، هاتە دی .

ئنجا دایکمان عائیشە دەڵێ : هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ) ، گوتیان : ئەی پێغەمبەر ﷺ چۆن قسە لەگەڵ کەسانێکی مردوودا دەکەی ؟! ئەویش

فەرمووی : ئەوەی کە پەروەردگاریان بەڵێنی پێدابوون بۆیان دەرکەوتووە کە هەق بوو ، عائیشە دەڵێ : خەڵکیش دەڵێن : گوایە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ئەوەی کە پێم گوتن ، بیستیان ، دەڵێ : پێغەمبەر نەیفەرمووە : بیستیان ، بەڵکو فەرمووی : زانییانو ئێستا بۆیان دەرکەوتوە .

{شایانی باسیشە مەبەستی دایکی بڕواداران عائیشە ئەوەیە کە گوتوویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە : دەبیستن ، بەڵکو فەرموویەتی : دەزانن چونکە (بیستن) هەر بە جەستە دەبێ ، بەڵام (زانین) بە ڕووحیش دەبێ} .

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ : هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێیان لە پێغەمبەری خوا بوو ، لە شەودا دەیفەرموو : ئەی ئەوانەی نێو چاڵەکەن ! ئەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو ! ، ئەی شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو ! ، ئەی ئومەییەی کوڕی خەلەفو! ، ئەی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام ! ئایا ئەوەی پەروەردگارتان بەڵێنی پێدابوون ، بۆتان دەرکەوت ڕاستە ؟ من ئەوەی پەروەردگارم بەڵێنی پێدابووم بۆم دەرکەوت ، مسوڵمانانیش گوتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! ئایا قسە لەگەڵ چەند لاشەیەکدا دەکەی ، کە بۆگەن بوون ؟ ئەویش فەرمووی : ئێوە لەوان باشتر قسەی من نابیستن ، بەڵام ناتوانن وەڵامم بدەنەوە .

هەڵبەتە ئەو دوو ڕیوایەتە هەن ، کە بێگومان ئەوانەش کە گوتوویانە : (بیستوویانە) مەبەستیان ئەوە نەبووە ، بەو گوێچکانەی کە بەو جەنازانەوەن و بۆگەن بوون ، بیستوویانە ، بەڵکو مەبەستیان ئەوەبووە کە ڕووحەکانیان ئاگادارن ، بەڵام ئاگاداربوونی ڕووحەکانیان بە بیستن تەعبیری لێکراوە .

٣٩ / ﴿وَلَمّا أَمَرَ رَسولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُلْقَوْا فِي الْقَلِيبِ ، أُخِذَ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، فَسُحِبَ إِلَى الْقَلِيبِ ، فَنَظَرَ رَسولُ اللهِ ﷺ "فِيمَا بَلَغَنِي" فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ بْنِ عُتْبَةَ ، فَإِذَا هُوَ كَئِيبٌ قَدْ تَغَيَّرَ لَوْنُهُ ، فَقَالَ : يَا أَبَا حُذَيْفَةَ ! لَعَلَّكَ قَدْ دَخَلَكَ مِنْ شَأْنِ أَبِيكَ شَيْءٌ؟ أَوْ كَمَا قَالَ ﷺ فَقَالَ : لا ، وَاللهِ يَا رَسولَ اللهِ! مَا شَكَكْتُ فِي أَبِي وَلاَ فِي مَصْرَعِهِ ، ولكنَّنِي كُنْتُ أَعْرِفُ مِنْ أَبِي رَأْيًا وَحِلْمًا وَفَضْلاً ، فَكُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَهْدِيَهُ ذَلِكَ إِلَى الإِسْلامِ ، فَلَمّا رَأَيْتُ مَا أَصَابَهُ ، وَذَكَرْتُ مَا مَاتَ عَلَيْهِ مِنْ الْكُفْرِ بَعْدَ الّذِي كُنْتُ أَرْجُو لَهُ ، أَحْزَنَنِي ذَلِكَ ، فَدَعَا لَهُ رَسولُ اللهِ ﷺ بِخَيْرٍ ، وَقَالَ لَهُ خَيْرًا) .

واتە : دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد فرێ بدرێنە (قَلِيب)ەوە ، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ڕاکێشرا بەرەو چاڵەکە (ابن إسحاق) دەڵێ : وەك پێم گەیشتوە پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای دەموچاوی ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کرد ، بینی ڕەنگی تێکچووە ! {بابی ڕادەکێشرێ کە یەکێکە لە سەرانی کوفر ، بۆ خۆشی مسوڵمانە} پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەی ئەبو حوزیفە ! ئایا دەربارەی بابت شتێکت هاتە دڵ ، یان پێغەمبەر ﷺ قسەیەکی ئاوای کرد ؟ ئەویش گوتی : سوێند بە خوا هیچ گومانم لە بابم نیە ، وە هیچ گومانیشم لە فەوتانەکەی نیە (کە لەسەر ناهەقە) ، بەڵام لە بابمەوە عەقڵ و هێدیی و مەندیی و چاکەیەکم دەبینی ، ئومێدم وابوو کە ئەو سیفەتە چاکانەی ، بیخەنە نێو ئیسلامەوە ، ئنجا کاتێك کە ئەوەم بینی تووشی بووەو ، بینیم کە لەسەر کوفر مردوە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە من ئومێدم وابوو ، خوا هیدایەتی بدات بۆ ئیسلام ، ئەوە دڵتەنگی کردم ، ئەگەرنا هیچی دیکەم نیە ، پێغەمبەریش ﷺ قسەی خێری بۆ کردو دوعای خێری بۆ کرد .

٤٠ / ﴿ثُمّ إنّ رَسولَ اللهِ ﷺ أَمرَ بِمَا فِي الْعَسْكَرِ مِمّا جَمَعَ الناسُ ، فَجُمِعَ فَاخْتَلَفَ الْمُسْلِمُونَ فِيهِ ، فَقَالَ مَنْ جَمَعَهُ : هُوَ لَنَا ، وَقَالَ الّذِينَ كَانُوا يُقَاتِلُونَ الْعَدُوّ وَيَطْلُبُونَهُ : وَاللهِ لَوْلَا نَحْنُ مَا أَصَبْتُمُوهُ ، لَنَحْنُ شَغَلْنَا عَنْكُمْ الْقَوْمَ حَتّى أَصَبْتُمْ مَا أَصَبْتُمْ ، وَقَالَ الّذِينَ كَانُوا يَحْرُسُونَ رَسولَ اللهِ ﷺ مَخَافَةَ أن يُخالِفَ إليهِ العدوُّ : واللهِ ما أنتم بأحقَّ بهِ مِنّا ، واللهِ لقد رأينا أن نقتلَ العدوَّ إذْ مَنَحنا اللهُ تعالى أكْتافَهُ ، ولقد رأينا أنْ نأخذَ المَتاعَ حين لَمْ يكن دونَهُ مَنْ يَمْنَعُهُ ، ولكِنّا خِفْنا عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ كَرّةَ الْعَدُوّ ، فَقُمْنا دُونَهُ ، فَمَا أَنْتُمْ بِأَحَقّ بِهِ مِنا .

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيّ (وَاسْمُهُ صُدَيّ بْنُ عَجْلانَ فِيمَا قَالَ ابْنُ هِشامٍ) قَالَ سَأَلْت عُبَادَةَ بْنَ الصّامِتِ عَنْ الأَنْفَالِ ؟ فَقَالَ : فِينا أَصْحَابُ بَدْرٍ نَزَلَتْ حِينَ اخْتَلَفْنَا فِي النّفَلِ ، وَسَاءَتْ فِيهِ أَخْلاقُنا ، فَنَزَعَهُ اللهُ مِنْ أَيْدِينا ، فَجَعَلَهُ إلَى رَسولِهِ ، فَقَسَمَهُ رَسولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ عَنْ بَوَاءٍ يَقُولُ عَلَى السواءِ﴾ .

واتە : دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد لە نێو سوپایەکەدا : هەرچی دەستکەوتە کۆبکرێتەوە ، ئیدی هەمووی کۆکرایەوە ، بەڵام مسوڵمانان دەربارەی

ئەو دەستکەوتی جەنگە ، ڕاجیایی‌و کێشەو مشت‌ومڕیان تێدابوو ، ئەوانەی کۆیان کردبۆوە دەیانگوت : دەبێ هی ئێمەبێ ، وە ئەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ دوژمن کردبوو دەیانگوت : ئێمە زیاتر بەشمان پێوەیە ، وە ئەگەر ئێمە نەبووینایە ، ئەو ئەو دەستکەوتە نەدەگیرا ، وە ئێمە بە هۆی ئەوەوە کە بە دوای دوژمن کەوتین‌و شەڕمان لەگەڵدا دەکردن ، نەمانتوانی ئەو دەستکەوتە کۆ بکەینەوە ، ئەوانەش کە پاسەوانییان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردبوو ، نەوەك دوژمن بێتەوە سەری ، ئەوانیش دەیانگوت : ئێوە لە ئێمە زیاتر بەشتان پێوە نیە ، ئێمەش کە تەماشامان کرد خوا کردی کە دوژمن پشتی لە ئێمە کرد ، دەمانتوانی کە ئێمەش ئەو کەل‌و پەلە کۆ بکەینەوە ، چونکە دەستکەوتەکەمان دەبینی ، بەڵام لە پێغەمبەری خوا ﷺ ترساین کە دوژمن بگەڕێتەوە سەری ، بۆیە ئێمە پاسەوانییمان لێ دەکرد ، بۆیە لە ئێمەتان زیاتر بەش پێوە نیە .

ئنجا ئەبو ئومامەی باهیلیی کە ناوی (صُدَيّ بْنُ عَجْلانَ)ە ، وەك ئیبنو هیشام دەڵێ : دەڵێ : لە سەعدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامیتم پرسی : دەربارەی ئەنفال ، دەربارەی دەستکەوتی جەنگ ؟ گوتی : ئەو ئایەتانە لە سووڕەتی ئەنفال دەربارەی ئێمە هاوەڵانی جەنگی بەدر ، هاتنە خوار ، کاتێك کە ئێمە دەربارەی دابەشکردنی دەستکەوتەکە ڕاجیاییمان بوو ، وە ڕەوشتمان تێیدا خراپ بوو ، خوای پەروەردگاریش لە دەستی ئێمەی دەرهێناو ، خستیە دەستی پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ ، وە پێغەمبەری خوا بە یەکسانیی بەسەر مسوڵمانانی دا دابەشکرد .

٤١ / ﴿أَقْبَلَ رَسولُ اللهِ ﷺ قَافِلاً إِلَى الْمَدِينَةِ ، وَمَعَهُ الأُسَارَى مِنْ الْمُشْرِكِينَ ، وَفِيهِمْ عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيطٍ ، وَالنّضْرُ بْنُ الْحَارِثِ ، وَاحْتَمَلَ رَسولُ اللهِ ﷺ مَعَهُ النّفَلُ الّذِي أُصِيبَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ ، وَجَعَلَ عَلَى النّفَلِ عَبْدَ اللهِ بْنَ كَعْبِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفِ بْنِ مَبْذُولِ بْنِ عَمْرِو بْنِ غَنْمِ بْنِ مَازِنِ بْنِ النّجارِ﴾ .

واتە : دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەو دیلانەوە کە گرتبوونی لە هاوبەش دانەرەکان ، بەرەو مەدینە گەڕایەوە ، کە لە نێو دیلەکاندا (دوو لە سەرانی کوفر هەبوون) ، (عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيطٍ) و (النضْرُ بْنُ الْحَارِثِ) (کە هەر کامیان لەوانە بوون زۆر ئەزیەت‌و ئازاری مسوڵمانانیان دەدا لە مەککە) ، وە پێغەمبەری خوا

ﷺ ئەو دەستکەوتەی لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان گیرا بوو ، ئەوەشی پێ بوو ، (ئەگەر چەك بووە ، ئەگەر زادو زەخیرە بووە ، ئەگەر پارە بووە ، ئەگەر وڵاخ بووە ، هەرچی بووە) وە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی عەمری کوڕی عەوفی کوڕی مەبذوول کوڕی عەمری کوڕی غونمی کوڕی مازنی بەنی نەججاڕی کردە بەرپرسی ئەو دەستکەوتو ماڵو سامانە ، کە لە کافرەکان لە جەنگی بەدردا گیرابوو.

﴿ثُمّ أَقْبَلَ رَسولُ اللّهِ ﷺ حَتّى إذَا خَرَجَ مِنْ مَضِيقِ الصّفْرَاءِ ، نَزَلَ عَلَى كَثِيبٍ بَيْنَ الْمَضِيقِ وَبَيْنَ النازِيَةِ "يُقَالُ لَهُ سَيْرٌ" إلَى سرحَةٍ بِهِ ، فَقَسَمَ هُنالِكَ النّفَلَ الّذِي أَفَاءَ اللّهُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ عَلَى السواءِ ، ثُمّ ارْتَحَلَ رَسولُ اللّهِ ﷺ حَتّى إذَا كانَ بالرّوْحَاءِ ، لَقِيَهُ الْمُسْلِمُونَ يُهَنّئُونَهُ بِمَا فَتَحَ اللّهُ عَلَيْهِ ، وَمَنْ مَعَهُ مِنْ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ لَهُمْ سَلَمَةُ بْنُ سَلَامَةَ (كَمَا حَدّثَنِي عَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ ، وَيَزِيدُ بْنُ رُومَانَ) : مَا الّذِي تُهَنّئُونَنا بِهِ ؟ فوَاللّهِ إنْ لَقِينا الاّ عجائِزَ صُلْعاً كالبُدُنِ المُعَلَّقَةِ فَنَحرْناها ، فتَبَسَّم رسول الله ﷺ ثُمّ قَالَ : أَيْ ابْنَ أَخِي ! أُولَئِكَ الْمَلَأُ ، قَالَ ابْنُ هِشامٍ : الْمَلأُ الأَشْرَافُ وَالرّؤَسَاءُ﴾ .

واتە : دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆیو سوپایەکەیەوە هات ، هەتا گەیشتە شوێنێك بە ناوی (مَضِيقِ الصّفْرَاءِ) تەنگەی صەفراء ، وە لەوێ لەسەر گردێك بارگەو بنەیان خست لە نێوان (مَضِيقِ) و (نازِيَةِ) دا کە ئەو شوێنە پێی دەگوترا : (سَيْر) ، لەوێ لە لای درەختێکی گەورە بارگەو بنەیان خست ، وە ئەو دەستکەوتەی کە گیرا بوو ، خوای باڵادەست بە مسوڵمانانی بەخشیبوو لە کافرەکانەوە ، بەسەر مسوڵمانانـدا دابەشی کرد ، بە یەکسانیی .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دوای دابەشکردنی دەستکەوتەکە دووبارە بەرێکەوتەوە بەرەو مەدینە ، تاکو گەیشتە (الرّوْحَاء) کە شوێنێکە لە نیزیك مەدینەوە ، لەوێ مسوڵمانانی شاری مەدینە پێیگەیشتن، وە هاتن پیرۆزباییان لە خۆیو لە مسوڵمانان کرد ، کە خوا ﷻ ئەو سەرکەوتنە مەزنەی بە قسمەت کردبوون .

ئنجـا یەكـێك لـە هـاوەڵان بـە نـاوی (سَـلَمَةُ ابـن سَلامة) وەك عاصـیمی كـوڕی عومـەری كـوڕی قەتـادە ، وە یەزیـدی كـوڕی ڕوومـان گێڕاویانەتـەوە ، گـوتی : پیـرۆزبایی چیمان لـێ دەكـەن ؟ سـوێند بـە خـوا ئێمـە گەیشـتینە هەنـدێك پیـرە پیاوی سـەر ڕووتاوە ، وەك چۆن چەنـد حوشـترێك دەبەسـترێنـەوەو ، ئامادە دەكرێ بۆ سـەربڕین ، ئێمـەش كوشـتنمانن {واتـە : گەیشتینە كـەسانێك كـە دەستـە پاچـە بوونو ، پێویست نـاكات ، زۆر پیـرۆزباییمان لـێ بكـەن} .

پێغـەمبـەری خـواش ﷺ زەردەخـەنەیەكی كـردو فـەرمووی : (أَيْ ابْـنَ أَخِـي ! أُولَئِـكَ الْمَلأُ) ئەی برازام ، ئا ئەوانـە (مَلأن)ن ! .

{(مَلأ) واتـە : دەسـترۆیشـتووانو كەسانێك كە چاوو دڵی خـەڵـك پـڕ دەكەن لە سامو هـەیبـەت} (ابْن هشـام) گوتوویەتـی : (مَلأ) یانـی : نـاودارانو سـەرۆكەكان .

٤٢ / ﴿حَتّى إذَا كَانَ رَسولُ اللّهِ ﷺ بِالصّفْرَاءِ قُتِلَ النّضْرُ بْنُ الْحَارِثِ ، قَتَلَهُ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ، كَمَا أَخْبَرَنِي بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَهْلِ مكة ، قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : ثُمّ خَرَجَ حَتّى إذَا كَانَ بِعِرْقِ الظّبْيَةِ ، قُتِلَ عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ ، فَقَالَ عُقْبَةُ حِينَ أَمَرَ رَسولُ اللّهِ ﷺ بِقَتْلِهِ ، فَمَنْ لِلصّبْيَةِ يَا مُحَمّدُ؟ قَالَ النارُ. فَقَتَلَهُ عَاصِمُ بْنُ ثَابِتِ بْنِ أَبِي الأَقْلَحِ الأَنْصَارِيّ ، أَخُو بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ ، وَيُقَالُ : قَتَلَهُ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ﴾ .

واتـە : هەتـا كـاتێك كـە پێغـەمبـەر ﷺ لـە (صفراء) بـوو لـەو شـوێنە نـەزری كوڕی حارسی كوشـت ، ئەوەی كـە كوشـتی ، عەلـی كوڕی ئەبو طاڵیب بوو خـوا لـێی ڕازی بـێ ، ئیبنـو ئیسـحاق دەڵـێ : وەك هەنـدێك لەوانـەی كـە شـارەزان لـە ئەهلـی مەككە هەواڵیان پێـداوم ، ئنجا ڕۆیشـت هەتـا گەیشـتنە (عـرق الظبیـة) وە لـەوێ فەرمانی كرد (عُقْبَـةُ بْنُ أَبِي مُعَيْـطٍ) بكـوژرێ ، ئنجـا (عُقْبَـةُ بْنُ أَبِي مُعَيْـطٍ)یـش كـاتێك پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی كـرد بكـوژرێ ، گـوتی : ئـەی موحەممـەد ! ئـەدی كـێ بـۆ منـداڵان بمێنـێتـەوەو سـەرپەرشـتییان بكـات ؟ پێغـەمبـەر ﷺ فـەرمووی : ئاگـر (النـار) .

(عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ)یش (عَاصِمُ بْنُ ثَابِتِ بْنِ أَبِي الأَقْلَحِ الأَنْصَارِيّ) کە لە هۆزی (بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ) بوو ، ئەو کوشتی ، هەندێکیش گوتوویانە : ئەویش عەلی کوڕی ئەبو طالیب کوشتی ، خوا لێیان ڕازی بێ (دیارە ئەو دووانە وەك گوتم : بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنیان ، چونکە دوو بوون لە سەرانی قوڕەیش لە کافرەکان ، کە خەڵکێکی زۆر بە قسەی کردوون ، وە ئەزیەتو ئازارێکی زۆری مسوڵمانانیان داوە لە مەککە) .

٤٣ / (قُدِمَ بِالأُسَارَى حِينَ قُدِمَ بِهِمْ وَسَودَةُ بِنْتُ زَمَعَةَ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ عِنْدَ آلِ عَفْرَاءَ ، فِي مَنَاحَتِهِمْ عَلَى عَوْفٍ وَمُعَوِّذٍ ابْنَيْ عَفْرَاءَ ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُضْرَبَ عَلَيْهِنّ الْحِجَابُ ، قَالَ : تَقُولُ سَودَةُ : وَاللّهِ إنّي لَعِنْدَهُمْ إذْ أُتِينا ، فَقِيلَ هَؤُلاءِ الأُسَارَى ، قَدْ أُتِيَ بِهِمْ ، قَالَتْ : فَرَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي ، وَرَسولُ اللهِ ﷺ فِيهِ ، وَإِذَا أَبُو يَزِيدَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فِي نَاحِيَةِ الْحُجْرَةِ مَجْمُوعَةً يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ بِحَبْلٍ ، قَالَتْ : فَلا وَاللّهِ مَا مَلَكْتُ نَفْسِي حِينَ رَأَيْت أَبَا يَزِيدَ كَذَلِكَ ، أَنْ قُلْت : أَيْ أَبَا يَزِيدَ أَعْطَيْتُمْ بِأَيْدِيكُمْ ، أَلا مُتّمْ كِرَامًا ؛ فَوَاللّهِ مَا أَنْبَهَنِي إلاّ قَوْلُ رَسولِ اللهِ ﷺ مِنْ الْبَيْتِ ، يَا سَودَةُ ، أَعَلَى اللهِ وَرَسُولِهِ تُحَرِّضِينَ ؟ قَالَتْ قُلْت : يَا رَسولَ اللهِ ! وَالّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقّ ، مَا مَلَكْتُ نَفْسِي حِينَ رَأَيْتُ أَبَا يَزِيدَ مَجْمُوعَةً يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ ، أَنْ قُلْتُ مَا قُلْتُ﴾ .

واتە : کاتێك دیلەکانیان هێنایەوە بۆ مەدینە ، سەودەی کچی زەمعە کە هاوسەری پێغەمبەرە ﷺ ، خوا لێی ڕازی بێ ، لە لای (آلِ عَفْرَاءَ) بوو کە دیلەکانیان لەوێ دانا ، عەوفو موعەوویز هەردووکیان کوڕی ئافرەتێك بوون پێی دەگوترا (عَفراء) شەهید بوو بوون ، خزمو کەسیان کۆ بوو بونەوە ، شینیان بۆ دەگێڕان ، بۆیان دەگریان ، دیارە بەر لەوەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ لەسەریان پێویست بکرێ ، لە پشت پەردەوە بن ، ئنجا سەودە خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : من لە لایان بووم ، کاتێك کە دیلەکانیان هێنان ، دەڵێ : منیش چووم بۆ ماڵێ ، پێغەمبەری خواش ﷺ لەوێ بوو (أَبُو يَزِيدَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو) {کە دیارە یەکێك بووە لە زلە زلانی قوڕەیش ، وە دوایی دەبێتە نوێنەری قوڕەیشییەکان لە صوڵحی حودەیبییەدا} دەڵێ : کە بینیم دەستی بەسترا بوون لە ملی ، هیچ

خۆم بۆ ڕانەگیرا ، {یانی حاڵەتێکی هەڵچوونم بۆ دروست بوو} گوتم : ئەی ئەبو یەزید ! ئاوا بە دەستی خۆتان ، خۆتان تەسلیم کرد؟ ئەدی بەڕێزەوە مردبانە ، باشتر نەبوو ؟ {واتە دەبوو بەرگرییتان کردبایە ، دیارە ئەوەی وەك خزمایەتیی ، یان وەك ڕیش سپییەك لە قوڕەیشییەکان ، پێگوتوە} .

ئنجا سەودە خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : (فَوَاللَّهِ مَا أَنْبَهَنِي إلاّ قَوْلُ رَسولِ اللّهِ ﷺ مِنْ الْبَيْتِ : يَا سودَةُ ! أَعَلَى اللّهِ وَرَسولِهِ تُحَرّضِينَ؟) ئەی سەودە ! ئایا تۆ خەڵك لە دژی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هاندەدەی ؟ : (قُلْت : يَا رَسولَ اللّهِ ! وَالّذِي بَعَثَك بِالْحَقّ مَا مَلَكْتُ نَفْسِي حِينَ رَأَيْتُ أَبَا يَزِيدَ مَجْمُوعَةً يَدَاهُ إلَى عُنُقِهِ أَنْ قُلْت مَا قُلْت) .

منیش گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا ! سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ناردوە ، کاتێك ئەبو یەزیدم بینی ، ئاوا دەستی لە ملی بەسترا بوون ، خۆم ڕانەگرت ، ئەوەم گوت کە گوتم .

دیارە ئەمە دەبێ ئاوا تەفسیر بکرێ : کە ئینسان هەر چۆن بێ ئینسانە ، هەڵە دەکاتو ، با هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ یش بێ ! ئەگەرنا بە تەئکید سەودە خوا لێی ڕازی بێ کە هاوسەری پێغەمبەرە ﷺ زۆر مسوڵمان بووە ، بەڵام لەو کاتەدا هەستی خزمایەتیی جووڵاوە ، کە ئەوانەی وا بە زەبوونیی بینیون ، ئنجا لەو کاتەدا هەر بیری لەو لایەنەیان کردۆتەوە ، کە نەدەبووایە تەسلیم بووبان ، بەڵام لەو کاتەدا ئەوەی لە بیر نەبووە کە ئەگەر تەسلیم نەبووبان ، دەبوو شەڕیان لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ کردبایە ، لەسەر ناهەق ، هەڵبەتە شەڕیشیان کرد ، بەڵام کە تەسلیم بوون ، هیچ چاریان نەبووو ، دەستە پاچە بوون لە بەرانبەر سوپای ئیسلامدا .

مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر ئێمەش هەڵەیەك ، کەمو کورییەکمان لە کەسێك بینی ، دەبێ وەك پێغەمبەری خوا ﷺ سینگ فراوانانە مامەڵەی لەگەڵ دا بکەین ، مادام هەڵەو کەم و کورییەکە هی ئەوە بێ کە چاوپۆشیی لێ بکرێ ، دیارە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی سەودەی کردوە ، بەڵام هەر ئەوەندە کە ئاگاداری کردۆتەوە : ئایا خەڵك لە دژی خوا و پێغەمبەری خوا هاندەدەی ؟!

ئەویش دیارە بە هەڵەکەی خۆی زانیوەو ، ئەوەتا دوایش کە گێڕاویەتەوە : گوتوویەتی وەڵاهی بە دەست خۆم نەبوو ، دیارە حاڵەتێکی هەڵچوونی دەروونیی بۆ دروست بووە .

٤٤ / ﴿قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ : حَدّثني نبيه بن وهب أخو بني عبدالدار ، أَنّ رَسولَ اللهِ ﷺ حِينَ أَقْبَلَ بِالأُسَارَى ، فَرّقَهُمْ بَيْنَ أَصْحَابِهِ وَقَالَ : اسْتَوْصُوا بِالأُسَارَى خَيْرًا ، قَالَ : وَكَانَ أَبُو عَزِيزِ بْنُ عُمَيْرِ بْنِ هَاشِمٍ ، أَخُو مُصْعَبِ بْنِ عُمَيْرٍ لِأَبِيهِ وَأُمّهِ فِي الأُسَارَى ، قَالَ : فَقَالَ أَبُو عَزِيزٍ : مَرّ بِي أَخِي مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَرَجُلٌ مِنْ الأَنْصَارِ يَأْسِرنِي ، فَقَالَ : شُدّ يَدَيْك بِهِ فَإِنّ أُمّهُ ذَاتُ مَتَاعٍ ، لَعَلّهَا تَفْدِيهِ مِنْك ، قَالَ : وَكُنْتُ فِي رَهْطٍ مِنْ الأَنْصَارِ حِينَ أَقْبَلُوا بِي مِنْ بَدْرٍ ، فَكَانُوا إذَا قَدّمُوا غَدَاءَهُمْ وَعَشَاءَهُمْ خَصّونِي بِالْخُبْزِ وَأَكَلُوا التّمْرَ لِوَصِيّةِ رَسولِ اللّهِ ﷺ إيّاهُمْ بِنا ، مَا تَقَعُ فِي يَدِ رَجُلٍ مِنْهُمْ كِسرةُ خُبْزٍ إلاّ نَفَحَنِي بِها ، قَالَ فَأَسْتَحْيِيَ فَأَرُدّها عَلَى أَحَدِهِمْ ، فَيَرُدّها عَلَيّ ما يَمَسّها﴾ .

واتە : (ابْنُ إِسْحَاقَ) گوتوویەتی (نبيه)ی کوڕی (وهب) لە هۆزی (عبدالدار) بۆی باسکردم کە : پێغەمبەری خوا ﷺ کە دیلەکانی هێنایەوە ، دوایی دابەشی کردن بەسەر هاوەڵانیدا {یانی : دوو دوو ، سێ سێ ، چوار چوار ، ئەو حەفتا کەسەی بەسەر هاوەڵانیدا دابەش کردن ، چونکە شوێنێکیان نەبووە ، کە هەموویانی لێ بنو خزمەتیان بکەن ، یان ڕەنگە باش نەبووبێ هەموویان لە یەك شوێن بن ، لە ڕووی ئەمنییەوە ، بۆیە دابەشیکردن بەسەر هاوەڵانیدا} فەرمووی : (اسْتَوْصُوا بِالأُسَارَى خَيْرًا) ئاگاتان لێیان بێ ، ئامۆژگارییتان دەکەم دەربارەی دیلەکان ، بە چاکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن .

وە لە نێو دیلەکاندا ، ئەبو عەزیز هەبوو کوڕی عومەیری کوڕی هاشم کە دەکاتەوە برای موصعەبی کوڕی عومەیر برای بابو دایکی ، ئەبو عەزیز دەڵێ : موصعەب بە لامدا تێپەڕی لە کاتێك دا کە پیاوێك لە پشتیوانەکان منی بە دیل دەگرت ، موصعەب بەو پیاوەی گوت : (شُدّ يَدَيْك بِهِ فَإِنّ أُمّهُ ذَاتُ مَتَاعٍ ، لَعَلّهَا تَفْدِيهِ مِنْك) چاك دەستی ببەستە ، توندی ببەستە ، چونکە دایکی دەوڵەمەندە ، بەڵکو قەرەبووت بداتێ لە بەرانبەریدا ، دوایی کە ئازادی دەکەی !

ئنجا دەڵێ : من لەگەڵ کۆمەڵێك لە پشتیوانەکان بووم ، کاتێك لە بەدرەوە هێنایانمەوە بۆ مەدینە (باسی ئەوە دەکات کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا کردوە) ، دەڵێ : کاتێك کە نانی بیوەڕۆیان دەهێنا ، یاخود نانی ئێوارەیان دەهێنا ، ئەگەر خواردنەکە نانی تێدابایە ، (دیارە ئەو کاتە نان کەم بووە ، خورمایان خواردوە ، شتی دیکەیان خواردوە) ، بۆ خۆیان خورماکەیان دەخوارد ، بەڵام نانەکەیان دەدا بە من ، {بۆچی ؟ لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وای ڕاسپارد بوون کە ئاگاتان لێیان بێ} ، وە هەر کامێکیان لەتکە نانێکی دەسکەوتبایە (یانی : نانی گەنم ، یان نانی جۆ) دەیدا بە من ، منیش شەرمم دەکرد ، بیخۆم ، دەمدا بە یەکیان ، بەڵام ئەویش دیسان دەیدایەوە بە من ، (بە کورتی ، واتە : خواردنە باشەکەیان دەدا بە ئێمەو بۆخۆیان خواردنی خراپتریان دەخوارد ، ئاوا مامەڵەیان لەگەڵ دیلەکاندا دەکرد!) .

٤٥ / ﴿كَانَ أَبُو عَزِيزٍ صَاحِبَ لِوَاءِ الْمُشْرِكِينَ بِبَدْرٍ ، بَعْدَ النَّضْرِ بْنِ الْحَارِثِ ، فَلَمَّا قَالَ : أَخُوهُ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ لأَبِي الْيَسَرِ ، وَهُوَ الَّذِي أَسَرَهُ مَا قَالَ ، قَالَ لَهُ أَبُو عَزِيزٍ : يَا أَخِي ، هَذِهِ وَصَاتُكَ بِي ؟ فَقَالَ لَهُ مُصْعَبٌ : إِنَّهُ أَخِي دُونَكَ ! فَسَأَلَتْ أُمُّهُ عَنْ أَغْلَى مَا فُدِيَ بِهِ قُرَشِي ، فَقِيلَ لَهَا : أَرْبَعَةُ آلآفِ دِرْهَمٍ ، فَبَعَثَتْ بِأَرْبَعَةِ آلآفِ دِرْهَمٍ فَفَدَتْهُ بِهَا) .

واتە : ئەبو عەزیز کە لە دوای (النَّضْرِ بْنِ الْحَارِثِ) لە جەنگی بەدردا ، ئاڵا هەڵگری هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بوو ، ئنجا کاتێك کە موصعەبی کوڕی عومەیر کە برایەکەیەتی بە (أَبِي الْيَسَرِ)ی گوت ، کە بە دیلی گرتوە ، (واتە : پیاوە پشتیوانییەکە) چاك دەستی ببەستە ، چونکە دایکی دەوڵەمەندە ، بەڵکو فەرەبوویەکی باشت بداتێ ، ئەبو عەزیز بە موصعەبی گوت : برایەکەم ! ئا ئەوە ڕاسپاردەو ئامۆژگاریی تۆیە ، دەربارەی من ؟! موصعەبیش پێی گوت : ئەو برا ئەنصارییە برامە ، نەك تۆ .

ئنجا دەڵێ : دوایی دایکی ئەبو عەزیز پرسیاری کرد : کێ لە دیلەکانی قوڕەیش لە هەموو کەس زیاتر فەرەبووی بۆ دراوە ؟ دەڵێ ، گوتیان : زۆرترین ئەندازە چوار هەزار درهەمە ، ئنجا ئەویش چوار هەزار درهەمی نارد ، بۆ ئەوەی کە بیکاتە فەرەبووی ئەبو عەزیزی کوڕی ، کە دەکاتە برای موصعەبی کوڕی عومەیر خوا لێی ڕازی بێ .

٤٦ / ﴿وَكَانَ أَوّلُ مَنْ قَدِمَ مَكة (بِمُصَابِ) قُرَيْشٍ الْحَيْسُمَانَ بْنُ عَبْدِ اللّهِ الْخُزَاعِيّ ، فَقَالُوا : مَا وَرَاءَكَ ؟ قَالَ : قُتِلَ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَشَيبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَأَبُو الْحَكَمِ بْنُ هِشَامٍ ، وَأُمَيّةُ بْنُ خَلَفٍ ، وَزَمعَةُ بْنُ الأَسْوَدِ ، وَنُبَيّهٌ وَمُنَبّهٌ ابْنَا الْحَجَاجِ ، وَأَبُو الْبَخْتَرِيّ بْنُ هِشَامٍ فَلَمّا جَعَلَ يُعَدّدُ أَشْرَافَ قُرَيْشٍ ، قَالَ صَفْوَانُ بْنُ أُمَيّةَ ، وَهُوَ قَاعِدٌ فِي الْحِجْرِ : وَاللهِ إِنْ يَعْقِلُ هَذَا ، فَاسْأَلُوهُ عَنّي ، فَقَالُوا : (و) مَا فَعَلَ صَفْوَانُ بْنُ أُمَيّةَ ؟ قَالَ : هَا هُوَ ذَاكَ جَالِسًا فِي الْحِجْرِ ، وَقَدْ وَاللّهِ رَأَيْتُ أَبَاهُ وَأَخَاهُ حِينَ قُتِلا﴾ .

واتە : یەکەمین کەسێك کە هەواڵی بەڵای قورەیشی هێنا (یانی : هەواڵی تێشکانو دۆڕانو بەزینو کوژرانو گیرانی قورەیشیەکانی بردەوە) بۆ مەککە : پیاوێك بوو بە ناوی (حَيْسُمَانَ بْنُ عَبْدِ اللّهِ الْخُزَاعِيّ) پێیان گوت : ئەرێ دەنگو باس چییە ؟ گوتی : عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کوژرا ، شەیبەی کوڕی ڕەبیعە کوژرا ، ئەبو حەکەمی کوڕی هیشام کوژرا ، ئومەییەی کوڕی خەڵەف کوژرا ، زەمعەی کوڕی ئەسوەد کوژرا ، (وَنُبَيّهٌ وَمُنَبّهٌ) کوڕانی حەججاج کوژران ، ئەبو بوختەری کوڕی هیشام کوژرا ، دەڵێ : ئاوا ناودارانو سەرانی قورەیشی دەژماردن ، صەفوانی کوڕی ئومەییەش کە لە لای حیجر لە نیزیك کەعبەوە دانیشتبوو ، گوتی : دەبێ ئەو کابرایە عەقڵی هەبێ ؟ دەبێ ئاگای لە خۆی بێ ؟ دەربارەی منیش پرسیاری لێ بکەن ! گوتیان : ئەدی صەفوانی کوڕی ئومەییە ؟ (صەفوان لەوێ دانیشتبوو ، نەچوو بووە جەنگەکە) گوتی : ئەوەتا دانیشتوە لە لای حیجر ، بەڵام سوێند بە خوا : دیتم بابیشیو براشی کوژران ، (واتە : هەواڵەکە ڕاستەو شتێك نیە ، ئاگام لە خۆم نەبێ).

٤٧ / ﴿قَالَ ، قَالَ أَبُو رَافِعٍ مَوْلَى رَسولِ اللّهِ ﷺ : كُنْتُ غُلامًا لِلْعَبّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطّلِبِ ، وَكَانَ الإِسْلامُ قَدْ دَخَلَنَا أَهْلَ الْبَيْتِ ، فَأَسْلَمَ الْعَبّاسُ وَأَسْلَمَتْ أُمّ الْفَضْلِ وَأَسْلَمْتُ ، وَكَانَ الْعَبّاسُ يَهَابُ قَوْمَهُ ، وَيَكْرَهُ خِلافَهُمْ ، وَكَانَ يَكْتُمُ إِسْلامَهُ ، وَكَانَ ذَا مَالٍ كَثِيرٍ مُتَفَرّقٍ فِي قَوْمِهِ ، وَكَانَ أَبُو لَهَبٍ قَدْ تَخَلّفَ عَنْ بَدْرٍ ، فَبَعَثَ مَكانَهُ الْعَاصِيَ بْنَ هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ ، وَكَذَلِكَ كَانُوا صَنَعُوا ، لَمْ

يَتَخَلّفْ رَجُلٌ إلاّ بَعَثَ مَكانَهُ رَجُلاً ، فَلَمّا جاءَهُ الْخَبَرُ عَنْ مُصَابِ أَصْحَابِ بَدْرٍ مِنْ قُرَيْشٍ ، كَبَتَهُ اللّهُ وَأَخْزَاهُ وَوَجَدْنا فِي أَنْفُسِنا قُوّةً وَعِزًّا .

قَالَ : وَكُنْت رَجُلاً ضَعِيفًا ، وَكُنْت أَعْمَلُ الأَقْدَاحَ ، أَنْحَتُها فِي حُجْرَةِ زَمْزَمَ ، فَوَاللّهِ إنّي لَجالِسٌ فِيها أنْحَتُ أقْداحِي ، وَعِنْدِي أُمّ الْفَضْلِ جالِسَة وَقَدْ سَرَّنا مَا جاءَنا مِنْ الْخَبَرِ ، إذْ أَقْبَلَ أَبُو لَهَبٍ ، يَجُرّ رِجْلَيْهِ بِشَرٍّ ، حَتّى جَلَسَ عَلَى طُنُبِ الْحُجْرَةِ ، فَكانَ ظَهْرُهُ إلَى ظَهْرِي ، فَبَيْنَمَا هُوَ جالِسٌ ، إذْ قَالَ النَاسُ : هَذَا أَبُو سُفْيَانَ ابْنُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطّلِبِ (قَالَ ابْنُ هِشامٍ : وَاسْمُ أَبِي سُفْيَانَ الْمُغِيرَةُ) قَدْ قَدِمَ ، قَالَ : فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ : هَلُمّ إلَيّ فَعِنْدَك لَعَمْرِي الْخَبَرُ ، قَالَ فَجَلَسَ إلَيْهِ وَالناسُ قِيَامٌ عَلَيْهِ ، فَقَالَ يَا ابْنَ أَخِي ! أَخْبِرْنِي كَيْفَ كانَ أَمْرُ الناسِ؟ قَالَ : وَاللّهِ مَا هُوَ إلاّ أَنْ لَقِينا الْقَوْمَ ، فَمَنَحْناهُمْ أَكْتَافَنا يَقُودُونَنا كَيْفَ شاءُوا ، وَيَأْسرونَنا كَيْفَ شاءُوا ، وَأَيْمُ اللهِ مَعَ ذَلِكَ مَا لُمْت الناسَ ، لَقِينا رِجالاً بِيضًا ، عَلَى خَيْلٍ بَلْقٍ بَيْنَ السّمَاءِ وَالأَرْضِ ، وَاللّهِ مَا تُلِيقُ[1] شيئًا ، وَلا يَقُومُ لَها شَيْءٌ ، قَالَ أَبُو رَافِعٍ فَرَفَعْت طُنُبَ الْحُجْرَةِ بِيَدَيّ ، ثُمّ قُلْتُ : تِلْكَ وَاللّهِ الْمَلائِكَة ، قَالَ : فَرَفَعَ أَبُو لَهَبٍ يَدَهُ ، فَضَرَبَ بِها وَجْهِي ضَرْبَةً شَدِيدَةً . قَالَ وَشاوَرْتُهُ فاحْتَمَلَنِي فَضَرَبَ بِي الأَرْضَ ، ثُمّ بَرَكَ عَلَيّ يَضْرِبُنِي ، وَكُنْت رَجُلاً ضَعِيفًا ، فَقَامَتْ أُمّ الْفَضْلِ إلَى عَمُودٍ مِنْ عُمُدِ الْحُجْرَةِ ، فَأَخَذَتْهُ فَضَرَبَتْهُ بِهِ ضَرْبَةً ، فَعَلَتْ فِي رَأْسِهِ شَجّةً مُنْكَرَةً ، وَقَالَتْ : اسْتَضْعَفْتَهُ أَنْ غَابَ عَنْهُ سَيّدُهُ ؟ فَقَامَ مُوَلّيًا ذَلِيلاً ، فَوَاللّهِ مَا عَاشَ إلاّ سَبْعَ لَيَالٍ ، حَتّى رَمَاهُ اللّهُ بِالْعَدَسَةِ فَقَتَلَتْهُ) .

واتە: ئەبو ڕافیع کە کۆیلەی ئازادکراوی پێغەمبەر بووە ﷺ دەڵێ من غوڵامێك بووم ، غوڵامی (عباس)ی کوڕی (عبدالمطلب) بووم ، ئیسلام هاتبووەماڵی ئێمەوە ، عەبباسیش مسوڵمان بوو بوو ، (أم الفضل)یش {کە دایکی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە ، خێزانی عەبباسە} ئەویش مسوڵمان بوو بوو ، وە منیش مسوڵمان بووبووم ، بەڵام عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ کە مامی پێغەمبەرە ﷺ) لە گەلەکەی دەترسا ، وە پێی ناخۆش بوو کە پێچەوانەیان بجووڵێتەوە ، (دیارە عاتیفەی خزمایەتیی بەسەریاندا زاڵ بووە) بۆیە مسوڵمانەتییەکەی خۆی

---

[1] ) لا تُليقُ شيئاً : أي : لا يَثْبُتُ له شيء. المنجد ، ص ٧٤٢ .

دەشاردەوە ، هەروەها ماڵو سامانێکی زۆری هەبوو لە نێو گەلەکەیدا بڵاو بووبۆوە {ترساوە ئەگەر مسوڵمان بێ ، ماڵەکەی لێ زەوت بکەن} (أبو لَهَب)یش یەکێك بوو لەوانەی کە نەچوو بووە جەنگی بەدر {(أبو لَهَب)یش ، کە برای (عباس بن عبدالمطلب)ە هەردووکیان مامی پێغەمبەرن ﷺ} .

ئنجا دەڵێ : ئەبو لەهەب لە جێی خۆی (عَاصِي بْنَ هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ)ی ناردبوو ، وە هەموویان هەر وایان دەکرد ، ناودارانی قورەیش ئەوانەی کە نەچوو بوون بۆ جەنگی بەدر ، هەرکامێکیان پیاوێکی لە شوێنی خۆی ناردبوو ، (دیارە پارەی داوەتێو گوتوویەتی تۆ لە جیاتی من بچۆ) .

کاتێك کە هەواڵەکەیان پێ گەیشت ، کە قورەیش چییان بەسەرهاتوە لە جەنگی بەدردا ؟ زۆر هەستی بە سەرشۆڕییو خەفەتباریی دەکرد ، ئێمەش بە پێچەوانەوە ، زۆر هەستمان بە هێزو بە عیزەتمەندیی دەکرد ، ئنجا ئەبو ڕافیع دەڵێ : منیش پیاوێکی بێهێز بووم (دیارە لە ڕووی جەستەییەوە بێدارو بار بووە ، لە بەرانبەر خەڵکی دیکەی بەهێزدا) وە من (أقداح)م چاك دەکردن ، دەمتاشین {(قِدْح) دارێکی ڕاستو ڕێك بووە ، بۆ کۆمەڵێك مەبەست بەکاریان هێناوە} وە من لە حوجرەی زەمزەم دا دانیشتبووم ، ئەو دارانەی خۆمم دەتاشین ، وە (أم الفضل)یش لەوێ دانیشتبوو ، وە ئەو هەواڵەمان زۆر پێ خۆش بوو ، کە لە جەنگی بەدردا مسوڵمانان سەرکەوتوون ، لەو کاتەدا ئەبو لەهەب هات پێی ڕادەکێشا (واتە : زۆر بە قالب گرانییو بە بێ تاقەتیی) ، هەتا دانیشت لە لای ژوورەکەی ئێمە ، وە پشتی لە پشتی من بوو ، کاتێك کە دانیشتبوو ، خەڵك گوتیان : ئەوە ئەبو سوفیانی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتتەڵیب هات ، دەڵێ : (أبو لَهَب) پێی گوت : وەرە بۆ لام ، بە تەئکید تۆ هەواڵی ڕاستت لە لایە .

دەڵێ : ئەبو سوفیانی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەڵیبیش هات دانیشت ، وە خەڵکیش ڕاوەستابوون ، بۆ ئەوەی کە هەواڵەکە بگێڕێتەوە ، لێی پرسی : برازام هەواڵم پێ بدە ، خەڵك چی لێهات لە جەنگی بەدردا چی بوو ؟ دەنگو باس چییە ؟ گوتی : بە خوا هەر کە پێیان گەیشتین ، یەکسەر ئێمە تێشکاین ، ئیدی ئەوانیش بە دوامان کەوتن ، ئەوەی کە دەیانویست کوشتیانو ، ئەوەی کە

ویستیان بە دیلیان گرت ، چۆنیان پێ خۆش بوو ، وایانکرد ، بەڵام بە خوا من لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنە لە خەڵکی ناگرم ، چونکە پیاوانێکی سپیمان بینین ، کە سواری ئەسپی بەڵەك بوون ، لە نێوان ئاسمان و زەویدا (مەبەستی پێ فریشتەکانە) هیچ کەس ، وە هیچ شتێك خۆی بۆ ڕانەدەگرتن ، {ئەبو ڕافیع دەڵێ :} منیش پەتی ژوورەکەم (کە دیارە پەردەیەکی پێوە بەستراوە) بەرز کردەوە ، گوتم : بە خوا ئەوانە فریشتە بوون کە هاوکاریی مسوڵمانانیان کردوە ! .

(أَبو لَهب)یش دەستی بەرز کردەوەو زۆر بە توندی زللەیەکی لە دەم‌وچاوی دام ، دەڵێ منیش دیارە بەرگریم لە خۆم کرد ، ئەویش هەڵی گرتم‌و بە زەوی دادام ، وە پاشان چۆکی لەسەر سینگ دا کوتام ، منیش پیاوێکی بێهێز بووم ! (دیارە خراپی لەو غولامەی عەبباس داوە ، کە ناوی ئەبو ڕافیعە) ، دەڵێ (أُم الفَضْل)یش دارێك لەوێ بوو هەڵی گرت‌و زۆر بەقوەت لەسەری (أَبو لَهب)ی داو ، بە خراپی سەری شکاندو گوتی : تۆ بە بێهێزی دەزانی ، لەبەر ئەوەی گەورەکەی لێرە نیە ،

ئنجا (أَبو لَهب)یش هەڵسا ڕۆیی (یانی شەڕی لەگەڵ برا ژنەکەی خۆی دا نەکرد) ، پشتی تێ کردو بە زەبوونیی ڕۆیشت ، دەڵێ : بە خوا تەنیا حەوت شەوان دوای ئەوە ژیا ، تووشی نەخۆشی (عَدَسَة) بوو ، کوشتی .

{(عَدَسَة)ش بریتیە لە نەخۆشییەك کە جۆرێك لە دوومەڵ‌و کوان لە بەدەن دێ ، وە کەم وایە ئینسان دەرباز بکات[(١)]} .

٤٨ / ﴿وَحَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ بْنِ الزّبَيرِ ، عَنْ أَبِيهِ عَبّادٍ قَالَ نَاحَتْ قُرَيْشٌ عَلَى قَتْلاهُمْ ، ثُمّ قَالُوا : لا تَفْعَلُوا فَيَبْلُغُ مُحَمّدًا وَأَصْحَابَهُ فَيَشْمَتُوا بِكُمْ ، وَلا تَبْعَثُوا فِي أَسراكُمْ حَتّى تَسْتَأْنُوا بِهِمْ ، لا يَأْرَبُ عَلَيْكُمْ مُحَمّدٌ وَأَصْحَابُهُ فِي الْفِدَاءِ ، قَالَ : وَكَانَ الأَسودُ بْنُ الْمُطّلِبِ قَدْ أُصِيبَ لَهُ ثَلاثَةٌ مِنْ وَلَدِهِ ، زَمْعَةُ بْنُ الأَسودِ ، وَعَقِيلُ بْنُ الأَسودِ ، وَالْحَارِثُ بْنُ زَمْعَةَ ، وَكَانَ يُحِبّ أَنْ يَبْكِيَ عَلَى بَنِيهِ ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ ، إذْ سَمِعَ نَائِحَةً مِنْ اللّيْلِ ، فَقَالَ لِغُلامِ لَهُ وَقَدْ ذَهَبَ

---

١) العَدَسَةَ : بَثْرَةٌ تُشْبِهُ حَبَّةَ العَدَس ، المنجد ، ص ٤٩١ ، ط ٤٣ .

بَصَرُهُ : أُنْظُرْ هَلْ أُحِلّ النّحْبُ ، هَلْ بَكَتْ قُرَيْشٌ عَلَى قَتْلاهـا ؟ لَعَلّي أَبْكِي عَلَى أَبِي حَكِيمَـةَ يَعْنِي : زَمَعَـةَ فَإِنّ جَوْفِي قَدْ احْتَرَقَ . قَالَ : فَلَمّا رَجَعَ إلَيْهِ الْغُلامُ قَالَ إنّمَا هِيَ امْرَأَةٌ تَبْكِي عَلَى بَعِيرٍ لَها أَضَلّتْهُ) .

واتە : یەحیای کوڕی عەبباد ، کوڕی عەبدوڵڵا ، کوڕی زوبەیر لە بابی عەبباد دەگێڕێتەوە ، قورەیشییەکان شینیان دەگێڕا لەسەر کوژراوەکانیان ، دوایی گوتیان : وا مەکەن کە دوایی هەواڵ بە موحەممەدو هاوەڵانی بگاتەوەو پێی دڵخۆش بن ، کە ئێوە ئاوا شین دەگێڕن ، بۆ مردووەکانتان ، وە جارێ پەلەش مەکەن لە ناردن بە دوای دیلەکانتاندا ، بۆ ئەوەی موحەممەدو هاوەڵانی بە گرانجانیی مامەڵەتان لەگەڵ دا نەکەن ، بڵێن : وا دیارە زۆر بە پەلەن ، وە قەرەبووی زۆرتان لێ داوا بکەن .

دەڵێ : ئەسوەدی کوڕی عەبدولموتتەلیب سێ لە کوڕەکانی : زەمعەی کوڕی ئەسوەد ، وە عوقەیلی کوڕی ئەسوەد ، وە حارسی کوڕی زەمعە ، وە هەرسێکیان لەنێو کوژراوەکاندا بوون ، وە زۆری حەز دەکرد کە بۆیان بگریەت ، بەڵام دیارە لەبەر قەومەکەی کە شینگێڕانیان قەدەغە کرد بوو ، بۆیان نەدەگریا ، (دیارە ئەوانە زۆر پابەند بوون بە عادەتو نەریتی خۆیانەوە) .

ئەسوەد لە حاڵێکی وادا بوو ، کە بیستی ئافرەتێك دەگریاو ، شینی دەگێڕا ، بە غوڵامێکی خۆی گوت ، (لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەسوەدی کوڕی موتتەلیب چاوی نەمابوون ، کوێر بوو) گوتی : ئەرێ بزانە ! ئایا ڕێ دراوە بۆ کوژراوەکانمان بگرین ؟ ئایا ئەوە قورەیشن بۆ کوژراوەکانیان دەگرین ؟ بەشکو منیش بۆ زەمعە بگریم ، چونکە خەریکە هەناوم بسووتێ ، لەبەر ئەوەی گریانو شین گێڕانیان قەدەغە کردووە نەگریاوم ! دەڵێ : غوڵامەکەش چووو وەڵامەکەی هێنایەوە ، گوتی : ئەوە ئافرەتێکە حوشترێکی لێ ون بووە بۆی دەگری ، ئنجا ئەسوەد لەوبارەوە شیعرێکی گوتوە ، سەرەتایەکەی دەڵێ :

أَتَبْكِي أَنْ يَضِلّ لَها بَعِيرٌ وَيَمْنَعُها مِنْ النّوْمِ السّهُودُ

ئایا ئافرەتێك بۆ حوشترێك بگریەت ، وە خەمو خەفەت خەوی نەهێڵێ ...

(یانـی : چـۆن دەبـێ ژنێـك بـۆ حوشترەکـەی بگـرى ، بـەلاَم مـن بـۆ کـوڕەکانم نەگریـم ؟) .

﴿وَكَانَ فِي الأُسَارَى أَبُو وَدَاعَةَ بْنُ ضُبيرةَ السّهْمِيّ ، فَقَالَ رَسولُ اللّهِ ﷺ : إنّ لَهُ بِمكة ابْنًا كَيّسًا تَاجِرًا ذَا مَالٍ ، وَكأَنّكُمْ بِهِ قَدْ جاءَكُمْ فِي طَلَبِ فِدَاءِ أبِيهِ ، فَلَمّا قَالَتْ قُرَيْشٌ : لا تَعْجَلُوا بِفِدَاءِ أُسرائِكُمْ ، لا يأْرَبْ عليكم محمد وأصحابُهُ ، قَالَ الْمُطّلِبُ بْنُ أَبِي وَدَاعَةَ ، (وَهُوَ الّذِي كانَ رَسولُ اللّهِ ﷺ عَنِي) : صَدَقْتُمْ لا تَعْجَلُوا ، وَانْسَلّ مِنَ اللّيْلِ ، فقَدِمَ الْمَدِينَةَ ، فَأَخَذَ أَبَاهُ بِأَرْبَعَةِ آلافِ دِرْهَمٍ ، فَانْطَلَقَ بِهِ﴾ .

واتــە : وە لــە نێـو دیلەکـاندا (أَبُو وَدَاعَةَ بْنُ ضُبيرةَ السّهْمِيّ) هـەبوو کـە پێغەمبـەری خــوا ﷺ فـەرمـووی : (إنّ لَهُ بِمكة ابْنًا كَيّسًا تَاجِرًا ذَا مَالٍ وَكانّكُمْ بِهِ قَدْ جاءَكُمْ فِي طَلَبِ فِدَاءِ أبِيهِ) .

واتـە: کـوڕێکی هەیـە زۆر وریـایە ، وە بازرگـانە ، وە سـەروەتو سـامانێکی زۆری هەیـە ، هـەراك[1] بینیتـان هات بۆ ئـەوەی فەرەبووی بـابی بداتو لـە دیلـی دەربـاز بکا .

ئنجـا کـاتێك کـە قـوڕەیش گوتیـان : پەلـە مەکـەن لـە نـاردنی فـەرەبوو ، بـۆ دیلەکانتـان بۆ ئەوەی موحەممەد و هاوەڵەکانی زۆرتـان لـێ داوا نەکـەن ، {بلێێن : دیـارە زۆر بۆیـان ئاتـاجن} ، (مطلـب)ی کـوڕی (أَبي وداعـة) {وەك ئـەوەی کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ باسـی کردبـوو ، فـەرموو بـووی : کـوڕێکی ئاوایـە} ، بـە قوڕەیشییەکانی گوت : ڕاست دەکەن {پەلە مەکەن ، زوو مـەنێرن} ، بـەلاَم بۆخـۆی بە دزیـەوە بە شەو هاتـە مەدینە ، وە بـابی خـۆی کڕیـەوە ، بـە چوار هـەزار درەمو بـردیـەوە بۆ مەککە .

٤٩ / ﴿ثُمّ بَعَثَتْ قُرَيْشٌ فِي فِدَاءِ الأُسَارَى ، فَقَدِمَ مِكْرَزُ بْنُ حَفْصِ بْنِ الأَخْيَفِ فِي فَدَاءِ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو ، وَكَانَ الّذِي أَسرهُ مَالِكُ بْنُ الدّخْشُمِ ، أَخُو بَنِي سَالِمِ بْنِ

١) هەراك : خـەریکە ، نیـزیکە .

عَوفٍ ، قال ابن إسحاق : وحدَّثني محمد بن عمرو بن عطاء : أَنّ عُمَرَ بْنَ الْخَطّابِ قَالَ لِرَسول اللّهِ ﷺ : يَا رَسولَ اللّهِ ! دَعْنِي أَنْزِعْ ثَنِيّتَيْ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو ، وَيُدْلِعُ لِسَانَهُ ، فَلا يَقُومُ عَلَيْك خَطِيبًا فِي مَوْطِنٍ أَبَدًا ، قَالَ : فَقَالَ رَسولُ اللّهِ ﷺ : لا أُمَثّلُ بِهِ فَيُمَثّلُ اللّهُ بِي ، وَإِنْ كُنْتُ نَبِيّاً) .

واتە : قورەیش ناردیان بۆ ئەوەی دیلەکانیان بکڕنەوە ، (مِكْرَزُ بْنُ حَفْصِ بْنِ الأَخْيَفِ) هات بۆ کڕینەوەی سوهەیلی کوڕی عەمر ، کە یەکێك لە هاوەڵان کە ناوی (مَالِك بْنُ الدّخْشُمِ) بوو کە لە هۆزی بەنی سالیم بوو ، گرتبووی لە لای ئەو بوو .

(إبن إسحاق) دەڵێ : (محمد) کوڕی (عمرو) کوڕی (عطاء) بۆی باسکردم کە : عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! لێم گەڕێ هەردوو ددانی پێشەوەی سوهەیلی کوڕی عەمر دەربێنم ، با زمانی بێتە دەرێ ، (چونکە سوهەیلی کوڕی عەمر زۆر پیاوێکی قسەزان بوو) ، بۆ ئەوەی کە لە هیچ شوێنی دیکە هیچ کاتێك نەتوانێ لە دژی تۆ وتار بداتو ، خەڵکت لە دژ هانبدا ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : من شێواندن (مثلة) بە جەستەی کەس ناکەم ، نەوەك لە بەرانبەردا ، با من پێغەمبەری خواش بم ، پەروەردگاریش جەستەی من بشێوێنێ .

هەروەها ئیبنو ئیسحاق دەڵێ : ﴿وَقَدْ بَلَغَنِي أَنّ رَسولَ اللهِ ﷺ قَالَ : لِعُمَرِ فِي هَذَا الْحَدِيثِ ، إنّهُ عَسَى أَنْ يَقُومَ مَقَامًا لا تَذُمُّهُ) .

واتە : پێم گەیشتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو قسەیەدا بە عومەری کوڕی خەتتابی فەرموو : نیزیکە کە سوهەیلی کوڕی عەمر دوایی هەڵوێستێك بنوێنێ ، کە تۆ سەرزەنشتی نەکەی .

ئەوە بوو دوایی لە جەنگی هەڵگەڕاوە (حرب الردّة)دا کە خەڵکێکی زۆر هەڵدەگەڕێتەوە ، سوهەیلی کوڕی عەمر کە دوایی مسوڵمان دەبێ ، هەڵوێستێکی زۆر جوامێرانە دەنوێنێ ، ئەوەش دیارە خوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆی ﷺ لەوە ئاگادار کردۆتەوە ، وە ئەو دووربینییەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پێویستە بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ سەرکردەیی خەڵك بکات ، پەلە نەکات لە

سزادانی خەڵکدا ، وە دووربین بێ ، وە هەمیشە خێرو چاکە لە خەڵك چاوەڕێ بکات ، بە گەشبینیی تەماشا بکات .

٥٠ / ﴿قال إبن إسحاق : فَلّما إنقضى أَمرُ بَدْرٍ، أَنزَلَ الله ﷻ فيه من القرآن : (الأنفال) بأسرها ، فكانّ مما نَزّل في اختلافهم في النَّفْل حين اختلفوا فيه : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ①﴾ الأنفال .

واتە : کاتێك کە جەنگی بەدر ، وە دەرهاوێشتەکانی جەنگی بەدر کۆتاییان پێ هات ، خوا ﷻ سوورەتی ئەنفالی هەموو لەوبارەوە ناردە خوار ، لەوەی کە خوای پەروەردگار لە قورئان ناردیە خوار ، دەربارەی ڕاجیایی‌و ناکۆکییان سەبارەت بە دەستکەوتەکانی جەنگ ، کاتێك کە تێیدا کەوتنە ناکۆکیی ، کە خوا ﷻ ئاوا دەست پێ دەکات : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ①﴾ الأنفال .

واتە : دەربارەی دەستکەوتەکانی جەنگ پرسیارت لێ دەکەن ؟ بڵێ : دەستکەوتی جەنگ هی خواو پێغەمبەرە ﷺ ، دەجا پارێز لە خوا بکەن ، وە پەیوەندیی نێوانتان چاك بکەن ، وە فەرمانبەریی خوا پێغەمبەرەکەی بکەن ، ئەگەر بڕوادارن.

ئنجا ئیبنو ئیسحاق دەڵێ : ﴿فكان عُبادَةَ بْنَ الصّامتِ فيما بَلَغني إذا سُئِلَ عَنِ الأَنفال ، قال : فِينا أَصْحابُ بَدْرٍ نَزَلَتْ ، حِينَ اخْتَلَفْنا فِي النّفل وَساءَتْ فِيهِ أَخْلاقُنا ، فَنَزَعَهُ اللّهُ مِنْ أَيْدِينا ، فَجَعَلَهُ إلَى رَسولِهِ ، فقَسَمَهُ رَسولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ عَنْ بَوَاءٍ ، يَقُولُ عَلَى السواء ، وكان في ذلك : تقوى الله وطاعته وطاعة رَسولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ وصلاح ذات البَيّن﴾ .

واتە : عوبادەی کوڕی صامیت (کە یەکێکە لە هاوەڵان ، وە لە جەنگی بەدردا بەشدار بووە) وەك پێم گەیشتوە : هەر کات لەبارەی (الأَنفالِ)ەوە پرسیاری لێکرابایە ، دەیگوت : سوورەتی ئەنفال دەربارەی ئێمەی خەڵکی جەنگی بەدر هاتۆتە خوار ، کاتێك کە دەربارەی چۆنیەتی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگی بەدر ، بوو بە کێشەمان ، وە ڕەوشتمان تێیدا تێکچوو ، (واتە : بە شێوەك مامەڵەمان لەگەڵ کرد ، کە شایستەی ئێمە نەبوو) ، خوای بەرزو مەزن ئەو دەستکەوتەی لە دەستی ئێمە دەرهێنا ، وە گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش بە یەکسانیی لە نێوانمان دا دابەشیکرد .

ئنجا لەوەشدا پارێزکردن لە خوا ، وە فەرمانبەریی کردن بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو ، وە بەین چاك بوونمان هەبوو ، کە خەریك بوو لەسەر ئەوە نێوانمان تێکبچێ .

{ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤ هەر مرۆڤە ، تەنانەت با هاوەڵانی پێغەمبەریش بن ، وە تەنانەت با ئەوانەش بن کە لە جەنگی بەدردا بەشدارییان کردوە ، کە دیارە هاوەڵانێك لە جەنگی بەدردا بەشدارییان کردوە ، پلەو ئیمتیازی تایبەتییان هەبوە ، بەڵام ئەوەتا سیفەتەکانی بەشەر لەوانیشدا هەر بوونو ، لەسەر دەستکەوت ، خەریك بووە نێوانیان تێکبچێ ، چونکە پێش ئەوە خوای کاربەجێ دیاریی نەکردوە ، چۆن دەستکەوتو (غنیمة) دابەش بکرێ ، وەك دوایی لە هۆی هاتنە خوارەوەی دا باسی دەکەین ، بۆیە هەر کامێکیان ویستوویەتی بەشی زیاتری پێببڕێ }.

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە چوار (٤) ئایەتی سەرەتای سوورەتی **(الأنفال)** پێك دێ : ئایەتەکانی (١ - ٤) ، کە وەك پێشەکی وان ، بۆ کۆی بابەتەکانی سوورەتەکەو ، خوای کاربەجێ تێیان دا باسی حوکمەو دەستکەوتەکانی جەنگ **(أنفال)** دەکات ، کە عایدی خوا ﷻ و پێغەمبەرە ﷺ ، وە فەرمان بە بڕواداران دەکات ، کە پارێز لە خوا بکەن‌و ، پەیوەندیی نێوانیان باش بکەن‌و ، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن .

پاشان پێناسەی بڕوادارانی ڕاستەقینە دەکات ، بە پێنج سیفەت ، لە سیفەتە بنەڕەتییەکانیان ، کە ئەمانەن :

١ / دڵڕاچڵەکین بە یادی خوا

٢ / ئیمان زیادبوون ، لە کاتی بەسەردا خوێنرانەوەی ئایەتەکانی خوا .

٣ / پشت بە خوا بەستن .

٤ / نوێژ کردن .

٥ / ماڵ‌و سامان بەخشین ، لە پێناوی خوای پەروەردگاردا .

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ
بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا
ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ
يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، لە بارەی (ئەنفال)ەوە پرسیارت لێدەکەن ؟ بڵێ : ئەنفال (دەستکەوتەکانی جەنگ) هی خواو پێغەمبەرن ، دەجا پارێز لە خوا بکەنو نێوانتان باش بکەن ، وە ئەگەر بڕوادارن ، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ﴿١﴾ بە دڵنیاییەوە بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە : هەر کات یادی خوا کرا ، دڵیان ڕادەچلەکێ ، وە هەر کات ئایەتەکانیان بەسەردا خوێنرانەوە ، بڕوایان زیاد دەکات ، وە تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن ﴿٢﴾ ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەنو ، لەوەی کە پێمان داون دەبەخشن ﴿٣﴾ ئا ئەوانەن بڕواداری ڕاستەقینە ، لە لای پەروەردگاریان چەندان پلەیان هەن، وە لێبوردنو بژێوێکی زۆر باش ﴿٤﴾)) .

# شـیکـردنـەوەی هـەنـدێ لـە وشـەکـان

(ٱلْأَنفَالُ ) : کۆی (نَفَل)ە ، {النَّفْلُ : قِيلَ هُوَ الغَنِيْمَةُ بعَيْنِهَا ، لَكِن اخْتَلَفَتِ العِبَارَةُ عَنْهُ لاخْتِلافِ الإعْتِبَارِ ، فَإنَّهُ إذَا اعْتُبِرَ بكَوْنِهِ مَظْفُوراً بهِ ، يُقَالُ لَهُ : غَنِيْمَة ، وَإذَا اعْتُبِرَ بكَوْنِهِ مِنْحة مِنَ اللهِ ابْتِدَاءً ، مِنْ غَيْرِ وُجُوبٍ ، يُقَالُ لَهُ : نَفَل ، أَوْ مَا يُحْصَل بغَيْرِ قِتَالٍ ، وَهُوَ الفَيء ، وَأَصْلُ ذَلِك مِنَ النَّفْلِ ، أي : الزِّيَادَةُ عَلَى الوَاجِبِ ، وَمِنْهُ (النافلة)} .

وشەی (نَفَل) چاوگە ، واتە : دەستکەوتی جەنگ ، بەڵام بە پێی جیاوازیی ئیعتیبارەکان ناوەکە دەگۆڕێ : ئەگەر لەو ڕووەوە تەماشای بکرێ ، کە لە جەنگدا وە دەستهاتوە ، پێی دەگوترێ : غەنیمەت ، وە ئەگەر لەو ڕووەوە تەماشا بکرێ ، کە ئەوە بەخششێکی خوای بەخشەرە ، ئەوە پێی دەگوترێ : (نَفَل) ، وە ئەگەر لەو ڕووەوە تەماشای بکرێ ، کە بەبێ جەنگ دەستبکەوێ ، ئەوە پێی دەگوترێ : (الفَيء) ، هەمووشی لە (نَفْل)ەوە هاتوە ، کە بریتیە لە زیادە لە واجب ، وەك دەگوترێ : (صَلاَة النَّافِلَة) ، واتە : ئەو نوێژەی کە لەسەرت واجب نیە ئەنجامی بدەی ، {وەك : وەترو شەونوێژو نوێژی چێشتەنگاوو باقی نوێژە سوننەتەکانو ڕۆژووە سوننەتەکان} .

(ذَاتَ بَيْنِكُمْ ) : (نَفْسَ مَا بَيْنِكُمْ ، وَهِيَ الحَالُ وَالصِّلَةَ الَّتِي بَيْنَكُمْ تَرْبُطُ بَعْضَكُمْ بِبَعْضٍ ، وَالبَيْنُ فِي أَصْلِ اللُّغَةِ ، يُطْلَقُ عَلَى الإتِّصَالِ وَالإفْتِرَاقِ ، وَيُعَبَّرُ عَنْ هَذِهِ الرَّابِطَةِ بذَاتِ البَيْن) .

واتە : خودی نێوانتان ، ئەویش بریتیە لەو حاڵو پەیوەندییەی کە لە نێوانتاندا هەیە ، هەندێکتان بە هەندێکتانەوە دەبەستێتەوە ، وشەی (بَين) لە ئەسڵی زماندا ، بە پێکەوە پەیوەست بوونو لێك جیابوونەوە دەگوترێ ، وە بەو پەیوەندییەی کە لە نێواندا هەیە ، دەگوترێ .

(وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ) : (الوَجَلُ : اسْتِشْعَارُ الخَوْفِ ، وَجَلَ يَوْجَلُ وَجَلاً فَهُوَ وَجِلُ ، قَالَ :

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ ، ﴿إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾الحجر ، ﴿ وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ﴿٦٠﴾ ﴾المؤمنون) .

(وَجَلْ) بریتیە لە هەست کردن بە ترس ، لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ : (وَجَلَ يَوْجَلُ وَجَلاً فَهُوَ وَجِلٌ) .

واتە : ترسا ، دەترسێ ، ترسان ، ئەو ترساوە ، بەڵام عەینی مانای ترسیش ناگەیەنێ ، بەڵکو بە مانای ڕاچڵەکین دێ لە ترسان ، وەك لە قورئاندا هاتوە ، کە دەفەرموێ : ﴿إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾الحجر ، واتە : ئێمە لە ئێوە دەترسێین ، یان دەفەرموێ : ﴿ وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ﴿٦٠﴾ ﴾المؤمنون ، واتە : دڵیان ڕاچڵەکیوە .

(حَقًّا ) : (أَصْلُ الحَقّ : المُطَابَقَة وَالمُوَافَقَة) .

وشەی (حق) واتە : شتی چەسپاو ، شتێك کە لەگەڵ شتێك پڕ بە پێست بێو لەگەڵی گونجاوبێ .

(دَرَجَٰتٌ ): (الدَّرَجة : نَحْو المَنْزِلَة، لَكِن يُقَالَ لِلْمَنْزِلَة دَرَجة إِذَا اعْتُبِرَ بالصّعُودِ...).

وشەی (درجة) بە مانای پێگەو پلە دێ ، بەڵام لەو ڕووەوە بەو مانایە دێ ، کە تەماشای بەرزبوونەوەی دەکرێ ، ئەگەرنا بەرەو خواربێ ، پێی دەگوترێ : (درکة) ، بۆیە گوتراوە : (الجنّة درجات ، والنّار درکات).

(وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ) : (الكَرِيمُ : يُوصَفُ بِهِ كُلُّ شَيء شَرُفَ فِي بَابِهِ) .

وشەی (کریم) هەر شتێکی پێ پێناسە دەکرێ ، کە لە جۆری خۆی باشترین بێ ، خوا دەفەرموێ : ﴿ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ ، ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ ﴾ الشعراء ، خوا دەفەرموێ : ﴿ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ ﴾ الدخان ، (کریم) واتە : باش ، نایاب ، کەواتە : کە دەفەرموێ : ﴿ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ واتە : ڕزقو ڕۆزییەکی پڕ ڕێزو باش .

## هـۆی هاتـنـه خوارەوەی ئايەتەكـان

١) ﴿عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ، رضي الله عنه ، قَالَ : لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ قُتِلَ أَخِي عُمَيْرٌ ، وَقَتَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ وَأَخَذْتُ سَيْفَهُ ، وَكَانَ يُسَمَّى ذَا الْكَتِيفَةِ ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ : اذْهَبْ فَاطْرَحْهُ فِي الْقَبْضِ ، فطرحته ، قَالَ : فَخرجْتُ وَبِي مَالاَ يَعْلَمُهُ إِلاّ اللّه مِنْ قَتْلِ أَخِي ، وَأَخْذِ سَلْبِي ، فَمَا جَاوَزْتُ إِلاَّ يَسِيراً ، حَتَّى نَزَلَتْ سُورَةُ الأَنْفَالِ ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ : اذْهَبْ فَخُذْ سَيْفَكَ﴾ {أَخرجَهُ أَحْمَد برقم : (١٥٥٦)}[١].

واتـه : سـەعدی كوڕی ئەبی وەقاص خـوا لێی ڕازی بـێ ، دەڵێ : له ڕۆژی بـەدردا عـومەیـری بـرام كوژرا ، سەعیدی كوڕی عاصم كـوشـت ، وه شـمشێرەكەیشـم گـرت (كـه دیاره شـمشێرێكی ناودار بوو) پێی دەگوترا : (ذَا الْكَتِيفَة) ، شـمشێرەكەم هێنـا بـۆ لای پێغـەمبـەری خـوا ﷺ گـوتم : ئـەم شـمشـێرەم گرتـوه ! فـەرمووی : بچۆ بیخـه سـەر دەستكـەوتی جـەنگ ، منـیش لـەوێـم دانـا ، گەڕامـەوە ، هـەر خـوا دەزانـێ دڵـم چەند نارەحـەتـه (یـەكەم : برام كوژرا بوو ، دووەم : ئـەوەش كـه وەك دەستكـەوت دەستم كـەوتبوو ، ئەویشـم لـێ وەرگیـرا) دەڵـێ : منـیش تۆزێـك واوە ڕۆیشتم ، یەكسـەر سـووڕەتی ئەنفـال هـاتە خـوار ، دوایـی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بانگی كـردم ، فـەرمووی : بڕۆ شـمشێرەكەت هەڵگـرەوە .

---

١) تعليق شعيب الأرنؤوط : حَسَنٌ لِغَيْرِهِ رجاله ثقات رجال الشيخين غير أن فيه انقطاعاً ، ... ونقل الأرناؤوط ما خلاصته أن قوله (سعيد بن العاص) خطأ ، وأن الذي قتل يوم بدر هو (العاص بن سعيد بن العاص) واختلفوا أقتله سعد بن وقاص ، أم علي بن أبي طالب؟! ثم العاص بن سعيد هذا ، ابنه : هو (سعيد بن العاص بن سعيد بن العاص) ولد في الإسلام ، ولم يشرك قط ، أبوه : هو (سعيد بن العاص) مات قبل بدر مشركاً ، فليس واحد منهما يصلح أن يكون هو المراد في الحديث . وَأَخْرَجَهُ أَيْضَاً ابْنُ أَبِي شَيْبَة ، برقم : (١٤٠٣١) ، وَسَعِيدُ بْنُ مَنْصُور ، برقم : (٢٦٨٩) ، وغيرهم.

٢) ﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ، أَنَّهُ قَالَ : خَرجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى بَدْرٍ فَلَقِيَ الْعَدُوَّ ، فَهَزَمَهُمُ اللهُ تَعَالَى ، فَتَبِعَهُمْ طَائِفَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَقْتُلُونَهُمْ ، وَأَحْدَقَتْ طَائِفَةٌ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ ، وَاسْتَوْلَتْ طَائِفَةٌ بِالْعَسْكَرِ وَالنَّهَبِ ، فَلَمَّا نَفَى اللهُ عَزَّ وَجَلَّ الْعَدُوَّ وَرَجَعَ الْمُسْلِمُونَ الَّذِينَ طَلَبُوهُمْ ، قَالُوا : نَحْنُ طَلَبْنَا الْعَدُوَّ وَبِنَا نَفَاهُمُ اللهُ تَعَالَى وَهَزَمَهُمُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ ، وَقَالَ الَّذِينَ أَحْدَقُوا بِرَسُولِ اللهِ ﷺ : مَا أَنْتُمْ بِأَحَقَّ بِهِ مِنَّا هُوَ لَنَا ، نَحْنُ أَحْدَقْنَا بِرَسُولِ اللهِ ﷺ أَنْ لا يَنَالَ الْعَدُوُّ مِنْهُ غِرَّةً ، وَقَالَ الَّذِينَ اسْتَوْلَوْا عَلَى الْعَسْكَرِ وَالنَّهَبِ : هُوَ لَنَا وَاللهِ ، مَا أَنْتُمْ بِأَحَقَّ بِهِ مِنَّا ، نَحْنُ حَوَيْنَاهُ وَاسْتَوْلَيْنَا عَلَيْهِ ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بَيْنِكُمْۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾﴾ ، فَقَسَمَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَهُمْ عَنْ فُوَاقٍ﴾ {أَخرجَهُ ابْنُ حِبَّان برقم : (٤٨٥٥) ، قال شعيب الأرنؤوط : إِسْنَادُهُ حَسَنٌ ، وأَخرجَهُ أَيْضاً التِّرمِذِيُّ برقم : (١٥٦١) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (٢٨٥٢) ، وَالبَيْهَقِيُّ فِي (الكُبْرَى) برقم : (١٨٤٤٤)} .

واتە : عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیو ئەو هاوەڵانەی لە خزمەتی دا بوون ، ڕۆیشت بەرەو بەدر ، لەوێ بەرەنگاری دوژمن بوونەوە ، دوژمن شکا ، کۆمەڵێك لە مسوڵمانان شوێنیان کەوتن ، دەیانکوشتن ، کۆمەڵێکیشیان دەوری پێغەمبەری خوایان دابوو ، پارێزگارییان لێ دەکرد ، وە کۆمەڵێکیش دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگ لە سوپایەکە ، ئنجا کاتێك خوا ﷻ دوژمنی شکاندو لە کۆڵ کردەوە ، وە ئەوانەی کە شوێنیان کەوتبوون لە جەنگەکە گەڕانەوە ، گوتیان : دەبێ دەستکەوتی جەنگی بۆ ئێمە بێ ، ئێمە بەدوای دوژمن کەوتین ، وە بەهۆی ئێمەوە ، خوا ئەو دوژمنانەی دوورخستەوەو شکاندنی .

وە ئەوانەش کە دەوری پێغەمبەریان دابوو گوتیان : نەخێر ، لە ئێمەتان زیاتر بەش پێوە نیە ، بەڵکو دەبێ بۆ ئێمە بێ ، ئێمە پێغەمبەری خوامان ﷺ دەپاراست ، تاکو دوژمن لە بێئاگایی دا زەفەری پێ نەبات .

وە ئەوانەش کە دەستکەوتی سوپایەکەیان کۆکردبۆوە ، گوتیان : ئێوە لە ئێمە زیاتر بەشتان پێوە نیە ، دەبێ بۆ ئێمە بێ، ئنجا خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی یەکەمی سوورەتی ئەنفالی ناردە خوار ، ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾﴾ ، پێغەمبەری خواش ﷺ لە نێوانیان دا دابەشیکرد .

٣) ﴿عنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ، قَال : سَأَلْتُ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ عَنْ الأَنْفَالِ ؟ فَقَالَ : فِينَا مَعْشَرَ أَصْحَابِ بَدْرٍ ، نَزَلَتْ حِينَ اخْتَلَفْنَا فِي النَّفْلِ ، وَسَاءَتْ فِيهِ أَخْلاقُنَا ، فَانْتَزَعَهُ اللهُ مِنْ أَيْدِينَا وَجَعَلَهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَسَمَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ عَنْ بَوَاءٍ ، يَقُولُ عَلَى السَّوَاءِ﴾ {أَخرجَهُ ابْنُ حِبَّان برقم : (٤٨٥٥) ، قال شعيب الأرنؤوط : حَسَنٌ لِغَيْرِهِ} .

واتە : ئەبی ئومامەی باهیلیی خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : لە عوبادەی کوڕی صامیتم پرسی خوا لێی ڕازی بێ ، دەربارەی سوورەتی ئەنفال ؟ ئەویش گوتی : ئەم سوورەتە دەربارەی ئێمە هاوەڵانی بەدر هاتە خوار ، کە ڕاجیاییمان بوو ، وە ڕەوشتمان تێیدا خراپ بوو ، {ناکۆکییو دووبەرەکییان تێیدا پەیدابوو} ، خواش لەژێر دەستی ئێمەی دەرهێناو ، دایە دەست پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆ ئەوەی ئەو دابەشی بکات ، ئەویش بە یەکسانیی لە نێوانمان دا دابەشی کرد.

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوای بە بەزەیی دەفەرموێ : (بسم الله الرحمن الرحيم) واتە : بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە ، جاری دیکەش گوتوومانە : کە ئینسان دەڵێ : (بسم الله الرحمن الرحيم) دەبێ سێ شتان لە دڵو مێشکی خۆی دا ئامادە بکات :

یەکەم : بە ناوی خوای بە بەزەییو بەخشندەوە ، ئەو کارە دەکەمو ، بۆ خوا ئەم کارە دەکەم .

دووەم : ئەو کارە بەپێی شەریعەتی خوا دەکەم .

سێیەم : ئەم کارە دەکەم بە شانو شەوکەتی خۆم نا ، بەڵکو بە یارمەتی خواو بە ئاسانکاریی خوا .

هەر سێ واتایەکە دەبێ لە دڵدا ئامادە بن ، چونکە پێچەوانەی هەر کام لەو سێیانە گوناهێکی گەورەو زەبەلاحە :

١/ کارەکەت بۆ خوا نەبێ ، شیرکە .

٢/ کارەکەت بەپێی شەرعی خوا نەبێ ، ئینحرافو بیدعەتە .

٣/ وە کارەکەت بدەیە لای خۆت ، ئەوە بە خۆ سەرسام بوون (الإعجاب بالنفس)ە ، وە نەگێڕانەوەی فەزڵە ، بۆ خاوەنی فەزڵ .

دیارە ئێمە پێشتر باسی ڕووداوەکانی جەنگی بەدرمان کرد ، وە باسی هۆی هاتنە خوارەوەی کۆی سووڕەتی ئەنفالمان کرد ، بە تایبەتی ئەم ئایەتە : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾﴾ کەواتە : بەرچاومان ڕوونە دەربارەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ﴾ ، دەربارەی دەستکەوتەکانی جەنگ

پرسیارت لێدەکەن ؟ کە ئایا بۆ کێیەو ؟ چۆن دابەش دەکرێو ؟ بە کێ دەدرێ ؟ ﴿قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ بلێ: دەستکەوتەکانی جەنگ هی خواو پێغەمبەرن ﷺ ، واتە: ئەوان بڕیار دەدەن کە دەستکەوتەکانی جەنگ چییان لێ دێو ، دەدرێن بە کێو چۆن دابەش دەکرێن ؟ ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بَيْنِكُمْ﴾ دەجا پارێز لە خوا بکەنو پەیوەندیی نێوانتان باش بکەن ، بۆیە دەفەرموێ: پارێز لە خوا بکەن ، چونکە وەك عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ ، گوتی: خەریك بوو ڕەوشتمان تێیدا باش نەبێ ، وە دەمەقاڵێیان لەوبارەوە بووە ، خواش ئاگاداری کردوونەوە ، کە لەسەر ماڵی دنیا نێوانیان تێکنەچێ ، کە هەمیشەش پەیوەندیی خەڵك لەسەر دنیاو بەرژەوەندییەکانی دنیا تێکدەچێ ، ئەگەرنا لەسەر چوونە بەهەشت ، یان لەسەر ڕەزامەندیی خوا ، هەرگیز دوو کەس بەشەڕ نایەن ، یان لەسەر نەچوونە دۆزەخ ! ! هەمیشە دەمەقاڵێیەکان لەسەر شتی دنیاییە .

ئنجا ئەگەر دەشتانەوێ پارێزتان بۆ پەیدابێ ، وە پەیوەندیی نێوانتان چاك بێ ، ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ، ئەوە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ، وە ئەگەر فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەیتان ﷺ ، کرد ، ئەوە پارێز دەکەن ، وە ئەگەر پارێزیشتان کرد ، لەو شتانەی خوا پێی ناخۆشن ، ئەو کاتە لەسەر دنیاو بەرژەوەندیی دنیا نێوانتان تێکناچێ ، وە پەیوەندییەکانتان خراپ نابن .

ئنجا خوای پەروەردگار لە ئایەتی دووەمو سێیەمدا پێناسەی بڕواداڕانی ڕاستەقینەمان بۆ دەکات ، هەرچەندە لە شوێنی دیکەش دا خوا پێناسەی بڕواداڕانی کردوە ، بەڵام پێویست دەکات هەمیشە بە گوێماندا بدرێتەوە ، بە پێنج سیفەت پێناسەیان دەکات ، کە سێیان پەنهانن‌و ، دوویان ئاشکران :

دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ، بێگومان بڕواداران تەنیا ئەوانەن کاتێك یادی خوا کرا ، دڵیان ڕادەچڵەکێ ، دڵیان دەترسێ ، وە هەر کات

ئایـەتـەکانییـــان بەســەردا خوێنرانـــەوە ، بڕوایــان زیــاد دەکــات ، وە تـــەنیا پشــت بـــە پەروەردگاریان دەبەستن .

ئەوە ســێ سیفـەتی پەنهـان ، کـە تـەنیـا خــوا دەیانزانــێ لەگەڵ خودی کـەسـەکـە ، بـەڵام خـەڵـك هەستیان پـێ ناکـات ، مەگـەر شـوێنـەوارەکـانیان ، جـاری وایـە کـەسـێك فرمێسکی بە چاودا دێتە خـوار ، دەزانرێ ئەوە ترسی خـوای چۆتـە دڵ ، وە هەروەهـا ئەگــەر زانیمــان کـە پشــتی بـە پــارەو ســەروەتو سامانو خـزمو قـەومو عەشـیرەتو چـیو چـی نـەبەســتوە ، پشـتی تـــەنیا بـە خـــوا بەسـتبوو ، لـە هەڵسوکەوتـەکـــەیدا دەردەکـەوێ ، وە هـەروەها ئەگـەر ئایـەتـــەکانی خـــوا کارلــێکی لەگەڵدا کــردن ، کـــاتێك ئایـەتـەکانی خـوای بەســـەردا دەخوێنـرێنـــەوە ، هەست دەکــەین کــە ئـەوە ئیمانی زیـاد بــووە ، بەڵام بە حـەقیقـەت ئەو سیفـەتانـە تـەنیا خـوا دەیانبـینــێ .

سیفـــــەتەکانی چــــوارەمیان و پێنجـــــەمیان : ﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ ، ئەوانـەی کـە نوێژ بەرپـا دەکـەن ، وە لـەوەی پێمان داون خــەرج دەکـەنو دەبەخشـن .

نوێــژ بەرپاکــردن ئەوەیــە کــە تـۆ نویــژ وەك خـــوا فــەرزی کــردوە ، ئــاوا هــــەقی خـــۆی بدەیـەو ، ئەنجـامی بــدەی ، وە لــەوەش کــە پێمـــان داون ، دەبەخشـــن ، واتــە : هەم هەقی خـوا جێبەجێ دەکەن ، هەم هـەقی خـەڵك ، یـاخود هـەم دینداریی لە ڕووە مەعنـەوییـەکەیــەوە دەکــەن ، کــە نوێــژە ، هـەم لـە ڕووە ماددییـەکـەیــەوە ، چونکـە مسـوڵمانـەتیی هـەر ئەوە نیـە کـە شتێکی شـەخصیی بـێ ، یان شـتێکـی مەعنـەویــی بــێ ، یــان هــەر شــتێکی مــاددیی بــێ بە تـەنیـا ، یان تەنیـا شـــتێکی دەروونـی بــێ ، بەڵکـو دەبـــێ دەرو دەروونـت ، ســەرو ســامانت بـۆ خـــوای پەروەردگــار بـــێ ، بـۆ خـــوا ملکەچ بــێ .

لە کۆتـایی دا لـە ئایـەتی چوارەمــدا دەفەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ﴾ ، ئا ئەوانە بڕوادارانی ڕاسـتـەقینـەن ، یــانــی : بـە ڕاسـتیی ئــا ئەوانـە بـڕوادارن ، ئنجــا ئایـا خـوای پەروەردگـار ، چییـان بۆ ئامادە دەکـاتو ، چییان لــێ دەکـات ؟ دەفـەرموێ :

﴿ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾، لەلایەن پەروەردگاریانەوە، چەندان پلەیان بۆ دانراون ، وە لێبوردنێکی مەزن ، وە بژێوو ڕزقو ڕۆزییەکی زۆر چاك .

کەواتە : ئەوە پێناسەی ئەو بڕوادارانەیە ، کە ئەگەر ڕازاوە بن بەو سیفەتانە ، ئنجا بە بڕواداری ڕاستەقینە لە قەڵەم دەدرێن ، وە هەر کەسێکیش بڕواداری ڕاستەقینە بێ ، دیارە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا دەکات ، وە بە ئەندازەی ئەوەی ئیمانداران فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا دەکەنو ئەهلی تەقوا دەبن ، وە پەیوەندیی نێوانیان چاك دەکەن ، وە مشتو مڕو کێشەیان نابێ لەسەر دنیاو لەسەر بەرژەوەندییەکانی دنیا .

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە ئیمانی ڕاستەقینەیان هەیە ، وە بمان ڕازێنێتەوە بەو سیفەتە پەنهانیی و ئاشکرایانەی ، کە خوای پەروەردگار بە مەرجی گرتوون ، بۆ ئیماندارانی ڕاستەقینە .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾ ، پێشتریش باسمان کرد ، (أنفال) کۆی (نَفْل)ە ، کە لە (نَفَل)ەوە هاتوە ، ئەویش بە مانای زیادە دێ ، ئنجا (نَفْل) :

١/ هەم بە مانای غەنیمەتو دەستکەوت دێ .

٢/ وە هەم بە مانای ئەوەش دێ ، کە سەرکردەی جەنگی مسوڵمانان ، پێشەوای مسوڵمانان دەیبەخشێ بە کەسێك بە شێوەیەکی دیارییکراو .

٣/ وە هەم بە مانای هەرماڵو سامانێك دێ ، کە وە دەست مسوڵمانان دەکەوێ ، بەبێ جەنگ ، بەلاّم بە پێی سیاق دەزانین کە لێرەدا مەبەست پێی دەستکەوتی جەنگییە ، بەلاّم بەو ئیعتیبارەی کە خوا پێی بەخشیون ، نەك بەو ئیعتیبارەی کە لە جەنگدا گرتوویانە .

پێشتریش باسمان کرد : (دەستکەوت) بە ئیعتیباری ئەوە کە خوا پێی بەخشیون ، پێی دەگوترێ : (نَفَل) ، لەبەر ئەوە زیادەیە کە خوا دەیانداتێ ، بەلاّم بە ئیعتیباری ئەوەی کە لە جەنگدا دەگیرێ ، پێی دەگوترێ : (غَنیمة) بۆیەش پرسیاریان کردوە ، چونکە بە پێی عادەتو کلتووری ئەوان ، دیارە بە جۆرێکی دیکە ئەو دەستکەوتی جەنگە دابەش کراوە ، بۆیە پرسیاریان کردوە ، ئەگەرنا هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ ، نەدەکەوتنە کێشەو مشتومڕەوە ، بەلاّم بە پێی کلتووری خۆیان ، دیارە ئەوەی دەستکەوتی جەنگ کەوتۆتە دەستی ، زیاتر هی وی بووە ، بەلاّم شەریعەتی خوای پەروەردگار بە پێی کلتووری نەفامیی ئەوان دابەشی نەکردوە ، بە پێی شەریعەتی دادگەرانەی خوا : هەم ئەوانەی پێشی جەبهە ، هەم ئەوانەی پشتی جەبهە ، هەموو ئەوانەی کە هەر ئەرکێکیان پێ سپێردرابێ ، بەشدار بوون لەو دەستکەوتەدا .

ئنجا کە دەشفەرموێ : دەستکەوتی جەنگی هی خواو پێغەمبەری خوایە ، واتە : ئەوان دابەشی دەکەنو ، بڕیاری لەبارەوە دەدەن ، کە دیارە دوایی زیاتر قسەی لەبارەوە دەکەین لەکاتی تەفسیرکردنی ئایەتی : ﴿ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ ﴾ دا ، الأنفال .

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ﴾ ، دەجا پارێز لە خوا بکەن وە پەیوەندیی نێوانتان چاك بکەن ، پێشتر باسمان کرد : وشەی (ذات) مانایەکەی دەبێتەوە بە خودی ئەو شتە ، دەڵێ : (ذَاتَ بَيْنِكُمْ ) (الذات : العين ، والنفس) خودی نێوانتان چاك بکەن ، وە وشەی (ذات) لە زاراوی قورئان دا بە مانای (صاحب) هاتوە ، واتە : خاوەن ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ ﴾ لقمان ، واتە : بێگومان خوا ﷻ بە نهێنیی سینەکان ئاگادارە ، ئنجا ئایا بۆچی بۆ نهێنیی دڵەکان گوتراوە : (ذات) ؟ وەك یانی : ئەو نهێنییانەی لە سینەکاندان ، بوون بە خاوەنی ئەو سینەو دڵو دەروونانە ، کەواتە : ﴿ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ﴾ ، یانی : خودی پەیوەندییەکانی نێوانتان چاك بکەن ، دیارە بۆیە خوای پەروەردگار لێرەدا وایفەرمووە ، چونکە هاوەڵانی بەڕێز ، خەریك بووە لەسەر دەستکەوتەکانی جەنگی بەدر ، کێشەو ناکۆکییان لە نێواندا پەیدابێ ، کە بوو بوون بە سێ بەش :

١) بەشێکیان کە زیاتر جەنگاوەرەکان بوون ، دەیانگوت : ئێمە زیاتر بەشمان پێوەیە، چونکە : جەنگمان کردوە .

٢) بەشێکیان کە کۆکەرەوەی دەستکەوتەکان بوون ، دەیانگوت : ئێمە زیاتر بەشمان پێوەیە، چونکە : کۆمان کردۆتەوە .

٣) بەشێکیشیان کە زیاتر لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون ، بۆ پاسەوانیی‌و پارێزگاریی لێکردنی ، دەیانگوت : ئێمە زیاتر بەشمان پێوەی هەیە !

سەرەنجام ئەوە بوو کە خوای دادگەر لە هەموویانی وەرگرتەوە ، واتە : هیچ کام لە ئێوە خاوەنی دەستکەوتەکانی جەنگ نین بە تەنیا ، بەڵکو هەمووتان خاوەننی ، وە خوا مافی دابەش کردنی دەستکەوتەکانی جەنگیشی تەنیا بە پێغەمبەر ﷺ دا ، ئنجا لێرە خوای پەروەردگار دەفەرموێ : پارێز لە خوا بکەن ، وە پەیوەندیی نێوانتان چاك بکەن .

کەواتە : نێوان باشبوون ، بەرهەمی بۆ خوا صوڵحانە ، ئەگەر خەڵك‌و کۆمەڵگا پارێز لە خوا بکەن ، بە تەئکید پەیوەنیشیان لەگەڵ یەکدی دا باش دەبێ ، بۆیە هەر کۆمەڵگایەك بیەوێ تەبایی لە نێو ڕیزەکانی خۆی بەرقەرار بکات ، پێشێ دەبێ خەم لە پەیوەندیی تاکەکان بخوات لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ، چونکە ئەگەر تاکەکانی کۆمەڵگا ، بەڕاستیی خوایان خۆشبوێ‌و ، لە خوا بترسێن ، وە هەست بە چاودێریی خوا بکەن : دەستدرێژیی ناکەنە سەر ماڵ‌و نەفس‌و ناموسی یەکدی ، بۆیە کوردەواریی خۆمان گوتوویانە : (لەو کەسە بترسێ کە لە خوا ناترسێ) ، مرۆڤ ئەگەر پەیوەندیی لەگەڵ خوا باش بوو ، بێگومان پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکیش دا باش دەبێ ، بۆیەش خوا لە زۆر شوێنی قورئاندا ، تەقواو ئیحسانی پێکەوە هێناون وەك خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ النحل ، پارێز لە خوا کردن‌و ، لەگەڵ خەڵکدا چاك بوون .

یان خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾ الحج ، خوا بپەرستن‌و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدەن .

یان دەفەرموێ : ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ ﴿١٢٥﴾ ﴾ النساء ، واتە : دینداریی کێ چاکترە لە هی کەسێك ، کە خۆی بە خوا سپاردوەو ملکەچە بۆ خوا ، وە چاکەکاریشە !

هەروەها عەبدولقادری گەیلانی زۆر جوانی گوتوە ، کە دەڵێ : ئیسلام لە دوو وشەدا خولاصە ، دەبێتەوە : (صِدْقٌ مَعَ الحَقّ ، وَخُلقٌ مَعَ الخَلْق) ڕاستیی لەگەڵ خوا ، ڕەوشت باشیی لەگەڵ خەڵك .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ، ئەگەر ئێوە بڕوادارن ، واتە : ئەگەر ئیماندارین ، دەبێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن ، کەواتە : سەنگی مەحەك بریتیە لە فەرمانبەریی کردنی خوا ، وە پاشان هی پێغەمبەر ﷺ ، ئنجا لە ڕاستییدا فەرمانبەریی کردن بۆ خوا ، لە دەست گرتنی بە قورئانەوە دا بەرجەستە دەبێ ، وە فەرمانبەرییشمان بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە پابەند بین بە سوننەتو ڕێبازو ڕێو شوێنی پێغەمبەری خواوە .

وشەی (أطيعوا) دەڵێ : (الطوع : الإنقياد ويضادّه الكره ، والطاعة مثله ، لكن أكثر ما تقال في الإئتمار لما أُمِرَ ، والإرْتِسَام فِيمَا رسم) ، (طوع) واتە : پێخۆشبوونو ملکەچ بوون ، وە پێچەوانەی پێخۆشبوونو ملکەچ بوون ، پێ ناخۆش بوونو ملکەچ نەبوونە ، وشەی (طاعة) و (طوع) یەکن ، بەڵام مەبەست لە (إطاعة) ئەوەیە کە فەرمانێك بکرێو جێبەجێ بکرێ ، یاخود ڕێو شوێنێ دابنرێو ، پابەندیی پێوە بکرێ .

لێرەوە من دەمەوێ ئاماژەیەك بکەم بەوە ، کە سوننەتی پێغەمبەر وەك لە کتێبی : (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) لە بەرگی شەش لە باسی : (إتباع الرسول)دا باسم کردوە ، زۆر کەس هەن سوننەت لە بەرانبەر قورئاندا دادەنێن ، ڕاستە قورئانو سوننەت ، دوو پێکهێنەری سەرەکیی شەریعەتن ، بەڵام سوننەتو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ ، شتێك نیە کە لە بەرانبەری قورئان دابێ ، چونکە سوننەت ئەو ڕێبازەیە ، کە پێغەمبەر ﷺ پێیدا ڕۆیشتوە ، کە نێوەڕۆكو کرۆکی سوننەت بریتیە لە قورئان ، وە من لەو کتێبەشدا کە نووسیومە دەربارەی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەم باش ڕوونکردۆتەوە[1] ، چونکە

---

١) پاشان لەو بابەتەی ئاماژەم پێداو لە وتارێکم کە لە کۆڕێك دا داومە ، کتێبی (سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە نێوان تێپەڕاندنو بەزایەدان دا) پەیدابوو ، کە ئێستا چاپو بڵاوکراوەتەوە .

ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە ئێمە بێنین ، قورئان‌و سوننەت بخەینە دوو تای یەك تەرازووەوە ، چونکە لە ڕاستییدا سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بریتیە لە قورئان بە جێبەجێکراویی ، یانی : پێغەمبەری خوا ﷺ غەیری قورئانی پێنەبووە ، وە هەموو ئایەتەکانی خوای پەروەردگار کە باسی ڕێبازو بەرنامەی پێغەمبەری خوا دەکەن ، هەر باسی قورئان دەکەن ، بۆ وێنە : لە سوورەتی **(إبراهيم)**دا ، خوا دەفەرموێ : ﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ١ ﴾ ، واتە : ئەلیف ، لام ، ڕا ، (ئەمە) کتێبێکە بۆ تۆمان ناردۆتە خوار ، تاکو خەڵکی لە تاریکاییان دەربێنی بەرەو ڕۆشنایی .

ئنجا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن خەڵکی لە تاریکاییان دەرهێناوە بەرەو ڕۆشنایی ؟ بێگومان بە هۆی قورئانەوە .

هەروەها خوای پەروەردگار لە سەرەتای سوورەتی **(الأعراف)**دا دەفەرموێ :

﴿ الٓمٓصٓ ١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ﴾ ، واتە : بە ناوی خوای بە بەزەیی‌و بەخشندە ، ئەلیف ، لام ، میم ، صاد . ئەمە کتێبێکە (لە لایەن خواوە) بۆ لات نێرراوەتە خوار ، ئنجا با بە هۆیەوە هیچ سەغڵەتییەك لە سینەتدا نەبێ ، (ئەم کتێبە هاتۆتە خوار) تاکو خەڵکی پێ وریابکەیەوەو بیرخەرەوە بێ بۆ بڕواداران .

کەواتە : نابێ سوننەت لە بەرانبەری قورئاندا دابنرێ ، وەك دوو تای یەك تەرازوو ! وە لە ڕاستییدا سوننەت بریتیە لە ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی کار پێکردنی قورئان ، نەك تەفسیری قورئان ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە چەند ئایەتێکی کەم ، ئەویش چەند وشەیەك لەو ئایەتانەدا ، کە بۆ هاوەڵان ئیشکال هاتۆتە پێش‌و تێی نەگەیشتوون ، ئەگەرنا قورئانی تەفسیر نەکردوە ، بەڵام قورئانی بە کردەوە بۆ ئێمە تەفسیر کردوە ، بەهۆی سوننەتەوە دەزانین کە دەبێ چۆن پابەندیی بە قورئانەوە بکرێ ؟

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ ﴾، خوا زاناو توانا پێناسەی بڕواداران دەکات بە پێنج سیفەت، پێنج سیفەتی بنەڕەتیی، ئەگەرنا وە نەبێ بڕواداران هەر ئەو پێنج سیفەتەیان هەبن:

سیفەتی یەکەم: هەر کاتێك یادی خوا کرا، دڵیان ڕادەچڵەکێ، وە هەندێك گوتوویانە: دڵیان دەترسێ، ئنجا ئایا ئەوە هەموو کاتێکە؟ دەبێ هەر کاتێك ناوی خوا هات، دڵت ڕابچڵەکێ؟ نەخێر، بەڵکو واتە: لە هەندێك حاڵەتی تایبەتدا، بۆیەش وا دەڵێم: تاکو ئینسان لە خۆی نەکەوێتەوە گومانەوە، کە هەموو جارێ ناوی خوا دێ، دڵی ڕانەچڵەکا، بڵێ: دیارە من ئەو سیفەتەی بڕوادارانم تێدا نیە! بەڵکو لە هەندێك حاڵەتدا کە پێویست بکات، لە هەندێ کەش و هەواو حاڵەتی تایبەتدا، دەبێ دڵت ڕابچڵەکێ بە زیکرو یادی خوای بێ وێنە.

ئنجا یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا بۆچی لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾، بەڵام لە شوێنی دی دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۝٢٨ ﴾ الرعد، واتە: ئەوانەی بڕوادارنو دڵیان بە یادی خوا ئارام دەگرێ، ئارامیی بۆ دێ، ئەمە بۆچی؟ کەسێك بە سەرکێڵیی تەماشای قورئان بکات، دەڵێ: ئەم دوو ئایەتە بە یەکەوە ناکۆکن، بەڵام ئەگەر بە قووڵیی تەماشایان بکەین وانیە، چونکە: خوا لە سوورەتی ئەنفال دا، باسی ناکۆکیی هاوەڵانی کردوە، لەسەر دەستکەوتەکانی جەنگی بەدر، ئنجا ئەوانە پێویستییان بەوە هەیە، ئاگادار بکرێنەوە کە دەبێ سامو هەیبەتی خوایان لە دڵ دا هەبێ، دڵیان ترسی خوای تێدابێو ڕابچەڵەکێ، بۆ ئەوەی سەرپێچیی لە فەرمانی خوا نەکەن، لەسەر دنیاو دەستکەوت، بەڵام ئەوەی سوورەتی (الرعد) خوای پەروەردگار پێناسەی بڕواداران دەکات کە:

بڕواداران کەسانێکن دڵیان بە خوا خۆشە ، لە هەڕەشەی دوژمنان ناترسێن ، خوای پەروەردگاریان لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ ، بۆیە لەوێ دا شوێنەکە وا دەخوازێ ، باسی ئارامگرتنی دڵ بکات بە هۆی یادی خواوە .

سیفەتی دووەم : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا ﴾ ، کاتێك ئایەتەکانی خوایان بەسەردا خوێنرانەوە ، ئیمانیان زیاد دەکات ، واتە : خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا بەسەریاندا ، دەبێتە هۆی زیادبوونی ئیمانیان ، ئێمە لێرەدا پێویستە لەبارەی کەمو زیادکردنی ئیمانەوە هەڵوەستەیەك بکەین :

## کورتە باسێك لەبارەی کەمو زیادکردنی ئیمانەوە

زانایان ڕاجیاییان هەبووە ، لەسەر ئەوە کە ئایا ئیمان هەر وەك خۆیەتی ، یان کەمو زیاد دەکات ؟ زۆربەیان گوتوویانە : ئیمان زیاد دەکاتو کەمیش دەکات ، هەندێکیش گوتوویانە : نەخێر ، هەر وەك خۆیەتی ، ئنجا ئەوانەی کە گوتوویانە : ئیمان زیادو کەم دەکات ، واتە : هەم خودی ئیمان ، هەم کردەوەکانی ئیمان ، وە ئەوانەش کە گوتوویانە : هەر وەك خۆیەتی ، مەبەستیان پێی کردەوەکان نەبووەو ، مەبەستیان پێی خودی ئیمانەکەیە ، نەك کردەوەکان ، واتە : ئەو بەڕاست دانانو پەسندکردنو خۆشویستنەی خوای پەروەردگار ، ئەوە کەمو زیاد ناکات.

بەڵام لە ڕاستییدا ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین ، وە سەرنجی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەین ، زۆر بە ئاشکرا دیارە ، کە ئیمان هەم وەك خودی خۆی ، هەم وەك شوێنەوارەکانی ، کە بریتیە لە کردەوە باشەکان ، کەمیش دەکاو زیادیش دەکات ، بۆیەش زانایانی ڕەسەنی ئیسلام بنچینەیەکیان داناوە ، دەڵێن : (الإِيمَان : يَزِيدُ وَيَنْقُصُ ، يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ ، وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَة) .

واتە : ئیمان : کەم دەکاو زیاد دەکات ، بە فەرمانبەریی زیاد دەکاو ، بە سەرپێچیی کەم دەکات .

ئنجا با تەماشای ئەم دەقانە بکەین :

١) خوا فەرموویەتی : ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾﴾ آل عمران ، ئەوانەی کە خەڵك (ی ناحەز) پێیان گوتن : بێگومان خەڵك (ی دوژمن) بۆتان کۆبوونەتەوە ، دەجا لێیان بترسن ! کەچی ئەو (هەڕەشەو ترساندن)ە ، ئیمانی زیاد کردنو گوتیان : خوامان بەسەو ، چاکترین کار پێسپێرراویشە .

دیارە لێرەدا خوای میهرەبان باسی هاوەڵان دەکات لە جەنگی ئوحود دا، پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی ئالی عیمراندا باسمان کردوە ، کە سوددیی (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) دەگێڕێتەوە دەڵێ : کاتێك ئەبو سوفیان و هاوەڵەکانی (واتە : سوپاکەی) گەیشتنە ئەو کابرا عەرەبە دەشتەکییەی {ئەوەی کە لە کاروانەکەی هۆزی (عبدالقیس)دا بوو} دیارییەکیان بۆ دیاریی کرد (لە ڕیوایەتی دی دا هاتوە ، کە بارێکیان زەخیرەو خۆراك داوەتێ ، لە بەرانبەر ئەوەدا کە جەنگێکی دەروونیی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکات) ، کە هەواڵ بدات بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ، کە ئەوە ئەبو سوفیانو سوپایەکەی بۆیان کۆبوونەتەوەو گەڕاونەوە سەریان ، (هێرشیان دەکەنەوە سەر) ئنجا کە هەواڵی دا بە پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانی گوتیان : (حَسْبُنَا اللهُ ونِعْمَ الوَكِيل) ، وە دوایی هەر چاوەڕێیان کرد ، سێ چوار ڕۆژ لە (حَمْرَاءِ الأَسَد) مانەوە ، بەڵام ئەبو سوفیانو سوپایەکەی جورئەتیان نەکرد بۆیان بێن ، خوای باڵادەست دەربارەی وانو ، دەربارەی ئەو عەرەبە خێڵەکییەی کە هەواڵەکەی بۆ هێنا بوون ، لە بەرانبەر ئەو دیارییەدا کە پێی درابوو ، بۆ ئەوەی ئەو جەنگە دەروونییەیان لەگەڵ بکات ، ئەم ئایەتەو چەند ئایەتێکی دوای ویشی ناردنە خوار[1] .

---

١) بڕوانە : (الإستعاب في بيان الأسباب ، ج ١ ، ص ٣٣٢ ، ٣٣٣) کە گوتوویەتی : أخرجه ابن اسحاق في (المغازي) (٣ / ٤٥ ، ٤٧) ابن هشام ، والطبري في (جامع البيان) ( ٤ / ١١٩) والبيهقي في (دلائل النبوّة) (٣ / ٣١٥ – ٣١٧) ، قلنا : وهو مرسل.

ئنجا لەوێشدا گوتوومە : ئیمانی باش ، وەك تیغی ڕەسەنو باش وایە ، تیغ ئەگەر ماددەکەی باش بێ ، هەتا شتی پێ ببڕی ، سافتر دەبێ ، بە پێچەوانەی تیغی نارەسەنەوە ، شتێکی پێ ببڕی ، کول دەبێ ، ئیمانی باشیش هەتا زیاتر بکەوێتە نێو نارەحەتییان ، قاییم تر دەبێ .

٢) خوا دەفەرموێ : ﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا ﴿٢٢﴾﴾ الأحزاب ، (ئەم ئایەتەش باسی جەنگی ئەحزاب دەکات) واتە : کاتێك بڕواداران حیزبەکانیان بینی ، (گەلەکۆمەکیی قوڕەیشو هاوکارەکانیان ، کە ئابلْووقەی مەدینەیاندا) گوتیان : ئەمە ئەوەیە کە خواو پێغەمبەری خوا هەواڵیان پێداوین ، وە خواو پێغەمبەری خوا ڕاستیان فەرمووە ، وە (ئەو ئابلْووقەدانو دەورە دانە ، لەلایەن سوپای کوفرەوە ، کە چەند پێکهاتەیەکی جیاوازی هەبوو) هەر ئیمانی بۆ زیاد کردنو ، ملکەچیی بۆ زیاد کردن ، کەواتە : ئیمان زیاد دەکات .

٣) وە خوا دەفەرموێ : ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٤﴾﴾ الفتح ، واتە : خوا ئەو کەسەیە کە ئارامیيو هێمنیی دەخاتە نێو دڵی بڕوادارانەوە ، تاکو لەگەڵ ئیمانەکەیاندا ، ئیمانی دی زیاد بکەن ، واتە : ئیمانەکەیان بچێتە ئاستێکی دیکەوە .

٤) پێغەمبەری خوا ﷺ ، زۆر فەرموودەی هەن لەوبارەوە ، بۆ وێنە لە یەکێکیاندا فەرموویەتی : ﴿الإيمانُ بِضْعٌ وَسَبعُونَ أَوْ بِضعٌ وسِتُّونَ شُعْبَةً : فَأَفْضَلُهَا قَولُ : لاَ إلَـهَ إلاَّ الله ، وَأَدْنَاهَا إمَاطَةُ الأذَى عَنِ الطَّرِيقِ﴾ {أَخرجَهُ البُخَارِيُّ برقم : (٩) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٥٨) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (١٨١)} .

واتە : ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشەیە ، یان شەستو ئەوەندە بەشەیە ، بەرزترین بەشی ئیمان ، بریتیە لە گوتنی : (لاَ إلَـهَ إلاَّ الله) (هەڵبەتە :

سەرەڕای گوتنی ، دەبێ پێشتر بە دڵ قبووڵ کرابێ) ، وە کەمترین بەشی ئیمان ، بریتیە لە لابردنی ئازارێك لەسەر ڕێی خەڵکی .

کەواتە : مادام ئیمان ئەوەندە بەشەبێ ، جاری وا هەیە هەموو بەشەکانی نین ، وە جاری وا هەیە بەشەکانی هەن بۆ تۆخیی ، جاری وایە بە کاڵیی هەن ، کەواتە : ئیمان زیادو کەم دەکات .

ئنجا ئەوانەش کە گوتوویانە : ڕاستە ئیمان زیاد دەکات ، بەڵام خودی ئیمان نا ، بەڵکو شوێنەوارەکانی ئیمان ، ئێمە دەڵێین : نەخێر ، هەم خودی ئیمان زیادو کەم دەکات ، هەم شوێنەوارەکانی ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٦٠) ﴾ ، واتە : وە یادبکەوە کاتێك ئیبراهیم گوتی : پەروەردگارم ! پێشانم بدە ، چۆن مردووان دەژیێنیەوە ، (خوا) فەرمووی : ئەدی ئیمانت نەهێناوە ؟ گوتی : با ، بەڵام تاکو دڵم دابمەزرێ و ئارام بگرێ .

زانایان دەڵێن : ئیبراهیم عليه السلام ویستوویەتی ئەو دڵ ئارامییەی کە بە هۆی (علم اليقين)ەوە ، بۆی پەیدا بووە ، {(علم اليقين) ، واتە : تۆ زانیارییەکی جێی دڵنیایی و تەواوت هەیە دەربارەی شتێك} ویستوویەتی جۆرێکی دیکەش لە دڵ ئارامیی بۆبێ ، کە پێی دەگوترێ : (عين اليقين) ، واتە : بە چاوی خۆی بیبینێ ، بە عەقڵ و عیلم ، دڵنیا بووە ، کە خوا مردووان زیندوو دەکاتەوە ، بەڵام ویستوویەتی بەچاوی خۆی ، چۆنیەتییەکەی ببینێ .

ئنجا لێرەدایە کە پێغەمبەری خۆمان موحەممەد ﷺ فەرموویەتی : ﴿نَحْنُ أَحَقُّ بِالشَّكِّ مِنْ إبرَاهِيمَ ، إِذْ قَالَ : ﴿ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾﴾ {رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم : (٣٣٧٢) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٣٨٠)}.

واتــە : ئێمــە شایستــەترین بــە دوودڵــیی لــە ئیبــڕاهیم ﷺ کــە گــوتی : پەروەردگارم ! پێشانم بدە چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە ؟

واتــە : ئیبــڕاهیم نـەکەوتۆتـە گومانــەوەو ، ئەگـەر ئێمـە بکەوینـە گومانــەوە ، ئیبــڕاهیم نـەکەوتۆتــە گومانــەوە ، کاتێـك ئـەو داواکارییــەی کــردوە ، بەڵکــو حیکمەتـەکەی ئەوە بووە ، کە وەك گوتوویـەتی : بۆ ئەوەی دڵم زیاتـر ئـارام بگـرێ ، ئیمـانی هەبووەو ، ویستوویـەتی ئیمانی زیـاتر بێ .

کەواتـە : ئیمـان زیـادو کەم دەبـێ .

<u>سـیفەتی سـێیەم :</u> خـوا ﷻ دەفـەرمویٚ : ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ، وە پشـت بە پەروەردگاریان دەبەستن ، ئنجا لە زمانی عەرەبییـدا ، ئەگـەر (جارو مجرور) پـێش کـەوتن ، مانـای کـورت هەڵهێنـان دەگەیـەنێ ، کـە لێـرە دەفـەرموێ : ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ . واتـە : تـەنیـا پشـت بە پەروەردگاریان دەبەستن ، ئەگـەر فـەرمووبـای : (يتوكلـون علـى ربهـم) ، واتــە : پشـت بـە پـەروەردگاریان دەبەســتن ، بـەڵام دەگونجـێ پشـت بـە کـەسی دیکـەش ببەسـتن ، بـەڵام ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ، تـەنیا پشت بـە پـەروەردگاریان دەبەسـتن ، وەك ئێمـە لـە نوێــژدا دەڵێیــن : ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾الفاتحــة ، واتــە : بـەس تۆ دەپەرستین ، پشتیش هەر بە تـۆ دەبەسـتین .

ئنجا پشت بە خـوا بەسـتن ، وەك کـاتی خۆشـی باسمان کـردوە ، ئەوەنیـە کـە ئینسان دەست لـە هۆکارەکـان بـەر بـدات ، دەبـێ دەسـتت بـە هۆکارانــەوەبێ و ، دڵت بە خـواوە پەیوەسـت بـێ ، هەرچـی لە دەسـتت دێ ، وەك هۆکـاران ئامادەیـان بکـە ، بـەڵام دڵــت بـە خــواوە پەیوەســت بــێ ، بزانــە ئەگـەر خــوا بیــەوێ کـارەکـەت تـەواو دەبـێ ، ئەگـەرنا هـەموو هۆکـارەکانیش تـەواو دەکـەی ، جاری وایـە شـتێك دێتـە ڕێ ، کـارەکەت بۆ ناکـرێ .

سیفەتی چوارەم : خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ ، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن ، دەڵێ : (إِقَامَةُ الشيءِ تَعْنِي : الإِتْيَانَ بِهِ عَلَى وَجْهِهِ) .

واتە : کە شتێکت ئیقامە کرد ، یانی : وەك خۆی جێبەجێت کرد ، یەکێك لە زانایان دەڵێ : مرۆڤ کاتێك ڕادەوەستێ جوانترین حاڵەت بەخۆوە دەگرێ ، سەر ، لە سەرێیە ، ئەندامەکانی دی هەر یەکەیان لە شوێنی خۆیانن ، ئنجا کە نوێژیش ئیقامە دەکرێ ، یانی هەقی خۆی بدرێتێ ، هەر شتە لە شوێنی خۆیدا ، هەم هەقی ڕواڵەتی نوێژەکە بدەی ، کە بریتیە لە ڕاوەستانو ڕکووعو سەجدەو قورئان خوێندنو تەحییات ، هەم هەقی نێوەڕۆکی نوێژەکە بدەی ، کە بریتیە لە ملکەچیی و ترسانو بیر لێکردنەوەی ئەو وشانەی کە دەیانڵێی .

سیفەتی پێنجەم : خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ ، وە لەوەی کە پێمان داون ، خەرج دەکەن ، دەبەخشن ، بۆچی ؟ چونکە ڕزق ڕزقی خوایەو ، خەڵك خەڵکی خوایە ، کەسێك کە خوای بەخشەر نیعمەتێکی پێداوە ، سەروەتو سامانێکی داوەتە دەستی ، دەبێ بزانێ کە ئەوە سپاردەی خوایە لە لای ، پێش ئەو لە دەستی خەڵکی دیکە دابووە ، دوای ویش دەچێتە دەستی خەڵکی دیکە ، ماوەیەکی کەم لە دەستی تۆ دایە ، بزانە ئەوە سپاردەی خوایە ، بیگەیەنە بە شوێنی خۆی ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء .

واتە : بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنی خۆیان ، ئەو سەروەتو سامانەی کە لە دەستتان دایە ، بە تایبەتی زەکاتو ئەوەی کە لەسەر ئینسانی مسوڵمان واجب دەبێ ، ئەوە هی خۆت نیە ، ئەو کەسەی کە زەکات دەدات ، نەك نابێ هیچ منەتی لە دڵدا هەبێ ، بەڵکو دەبێ مەمنوونی ئەو کەسەش بێ کە زەکاتەکەی لێوەردەگرێ ، چونکە

ئەوە ئەمانەتی ئەو خەڵکەیە ، خوا لە لای تۆی داناوە ، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە کەسی وایە ، زەکات دەدات بە هەژاران، کۆڵێك منەتیشیان لەسەر دەکات ، یان دوایی پاشملە باسیان دەکات ! خوا دەربارەی ئەو کەسانە لە سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾ ﴾ .

واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! خێرو چاکەکانتان بە هۆی منەتکردنو ئازاردانەوە هەڵمەوەشێننەوە ، وەك بابایەك کە سامانەکەی بۆ ڕووپامایی خەڵکی خەرج دەکاتو ، بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە ، جا وێنەی ئەوە ، وەك وێنەی تاتە بەردێك وایە ، کە تەنکە گڵێکی لەسەرە ، بارانێکی دلۆپە قورس لێی دەداتو بە ڕەقو تەقی دەیخاتە گۆڕێ ، وە سەرەنجام (ئەو جۆرە ماڵخەرج کەرانە لە ڕۆژی دوایی دا) هیچیان دەستگیر نابێ لە بەرهەمی ئەوەی کردوویانە ، وە خوا ڕێنمایی کۆمەڵی بێ بڕوایان ناکات .

ئنجا لە ڕاستییدا هەر کەسێك ئەوماڵو سامانەی لە دەستی دایە ، بە هی خوای بزانێ کاتێك کە دەیبەخشێ ، منەت ناکات بەسەر ئەو کەسەدا کە پێی دەبەخشێ ، وە پاشملە باسی ناکات ، بۆچی ؟ چونکە هەست ناکات کە شتی خۆیەتی داویەتی بەو ، بەڵکو هەست دەکات ، هەقی خۆیەتی بۆی گێڕاوەتەوە .

**مەسەلەی <u>پێنجەم</u>** : کە دەفەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَمَغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٤﴾ ﴾ ، ئا ئەوانە بڕواداری بەڕاستیین ، لەلایەن پەروەردگاریان چەندان پلەیان هەن ، وە لێبوردنێکی گەورەو بژیوێکی باش .

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە دێنین ، هەرچەندە هەندێك لە زانایان سەنەدەکەیان بە بێهێز داناوە ، بەڵام مەتنەکەی زۆر جوانە ، وە زۆربەی

تەفسیرەکان هێناویانە : ﴿عَنِ الْحَارِثِ بْنِ مَالِكٍ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ : أَنَّهُ مَرَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ ، فَقَالَ لَهُ : يَا حَارِثُ ! كَيْفَ أَصْبَحْتَ ؟ قَالَ : أَصْبَحْتُ مُؤْمِنًا حَقًّا ، قَالَ : أُنْظُرْ مَا تَقُولُ ، إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ حَقِيقَةً ، فَمَا حَقِيقَتُكَ ؟ قَالَ : قَدْ عَزَفَتِ الدُّنْيَا عَنْ نَفْسِي ، وَأَظْمَأْتُ نَهَارِي ، وَأَسْهَرْتُ لَيْلِي ، وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى عَرْشِ رَبِّي بَارِزًا ، وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى أَهْلِ الْجَنَّةِ يَتَزَاوَرُونَ فِيهَا ، وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى أَهْلِ النَّارِ يَتَضَاغُونَ فِيهَا ، يَعْنِي : يَصِيحُونَ ، قَالَ : يَا حَارِثُ ! عَرَفْتَ فَالْزَمْ ، ثَلاثَ مَرَّاتٍ﴾ {أَخرجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ ، برقم : (٣١٠٦٤) ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ ، برقم : (٤٤٥) ، وَالطَّبَرَانِيّ برقم : (٣٣٦٧)} .

واتە : حاریسی کوڕی مالیکی ئەنصاریی خوا لێی ڕازی بێ ، بە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، تێپەڕبوو ، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموێ : ئەی (حَارِث) ! چۆن بەیانیت کردەوە ؟ ئەویش دەڵێ : ڕۆژم کردۆتەوە ئیمانداریێکی ڕاستم ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سەرنج بدە بزانە چی دەڵێی ؟ هەموو شتێك نێوەڕۆکێکی هەیە ، ئایا نێوەڕۆکی تۆ چییە بۆم باس بکە .

ئەویش گوتی : دڵم بە بە دنیاوە نەچەسپیوە ، وە لە ڕۆژگاردا خۆمم تینوو کردوە ، وە شەوگاری خۆمم بێدار کردۆتەوە، (واتە : بە شەوان ناخەوم و شەونوێژ دەکەم ، بە ڕۆژیش بەڕۆژوو دەبم ، هەڵبەتە مەرج نیە هەموو ڕۆژو شەوێك وا بووبێ) ، وەك ئەوەی ئێستا تەماشای عەرشی خوا بکەم ، بیبینم بە دەرکەوتوویی ، وە وا هەست دەکەم سەیری خەڵکی بەهەشت دەکەم ، لە بەهەشتێدا سەردانی یەکدی دەکەن ، وە وا هەست دەکەم ، تەماشای خەڵکی دۆزەخی دەکەم ، لەوێدا هاوار هاواریانە ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جاران فەرمووی : ئەی (حارث) ! زانیوتە ، پابەندبە لەسەر ئەو ڕێیەو ، دەستی پێوە بگرە .

## ئایا مرۆڤ دەتوانێ : بڵێ : بەڕاستیی من بڕوادارام ؟
## یان دروستە بڵێی : ئیماندارم ، بێ ئەوەی بڵێی : ( إن شاء الله )؟

زانایان لەوبارەوە مشتومڕێکیان هەیە ، بەڵام دەربارەی ئەوە ئەگەر لێت پرسرا : ئایا مسوڵمانی ؟ هەموویان گوتوویانە : ئاساییە بڵێی : بەڵێ مسوڵمانم ، بەڵام ئەگەر لێت پرسرا ئایا ئیمانداری ؟

زۆربەیان گوتوویانە : دەبێ بڵێی : إن شاء الله ئیماندارم ، بۆچی ؟

چونکە مسوڵمانەتیی زۆر مەدحی تێدا نیە ، ئەعرابیش مسوڵمان بوون ، مونافیقیش بە ڕواڵەت مسوڵمان بوون ، مسوڵمانەتیی گشتییە ، دەگونجێ کەسێك مسوڵمان بێتو نەچێتە بەهەشت ، بەڵام کە گوتت : ئیماندار (مؤمن)م ، واتە : بە تەئکید بەهەشتییم ، بۆچی ؟ چونکە ئیمانداران بەهەشتیین .

ئنجا دەڵێین : ئەوە جۆرێکە مەدحی خۆکردنو خۆ پێ چاك بوون ، وە مانای وایە تۆ قسە لە سەرەنجامی خۆت دەکەی ، سەرەنجامیش تەنیا خوا دەیزانێ ، بۆیە وا باشە ، بڵێی : إن شاء الله ئیماندارم .

ئنجا لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە دێنین ، کە قسەیەکی جوانە : (رُوِي عَنِ الحَسَنِ البَصْرِي أَنَّ رَجُلاً سَأَلَهُ : أَمُؤْمِنٌ أَنْتَ ؟ قَالَ لَهُ : الإِيْمَانُ إِيْمَانَانِ ، فَإِنْ كُنْتَ تَسْأَلُنِي عَنِ الإِيْمَانِ بِاللهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالجَنَّةِ وَالنَّارِ وَالبَعْثِ وَالحِسَابِ ، فَأَنَا بِهِ مُؤْمِنٌ ، وَإِنْ كُنْتَ تَسْأَلُنِي عَنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى : ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ﴾ ، فَوَاللهِ مَا أَدْرِي أَنَا مِنْهُمْ أَمْ لا)[1].

---

١) تفسير القرآن الحكيم ، ج ٩ ، ص ٥٠٧ و ٥٠٨ .

واتە: پیاوێك لە حەسەنی بەسرایی پرسی: ئایا تۆ بڕواداری؟ ئەویش گوتی: دوو جۆرە بڕوا هەن، ئەگەر لەوەم لێ دەپرسی: كە ئایا بڕوام بە خواو بە فریشتەكانیو بە كتێبەكانیو بە پێغەمبەرانیو بە بەهەشتو دۆزەخو زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە هەیە، بەڵێ: بڕوادارم، بەلاّم ئەگەر لەوەم لێدەپرسیی كە خوا دەفەرموێ: {بە دڵنیاییەوە بڕواداران تەنیا ئەوانەن كە هەر كات یادی خوا كرا، دڵیان ڕادەچڵەكێ، وە هەر كات ئایەتەكانیان بەسەردا خوێنرانەوە، بڕوایان زیاد دەكات، وە تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن. ئەوانەی نوێژ بەرپا دەكەنو لەوەی كە پێماناداون دەبەخشن. ئا ئەوانەن بڕواداری ڕاستەقینە}، ئەوە بە خوا نازانم، لەوانم، یان لەوان نیم.

لەبەرچی وایگوتوە؟ چونكە لە كۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانە: بڕواداری ڕاستەقینەن، پلە بەرزەكانی بەهەشتیان هەن ...، ئنجا ئەگەر گوتت: بەڵێ من بەهەشتییمو پلە بەرزەكانی بەهەشتم هەن، ئەوە جۆرێك لە مەدحی خۆ كردنی تێدایە، بۆیە وا باشە مرۆڤ بە ڕەهایی نەڵێ: بڕوادارم.

ئنجا حەسەنی بەسرایی جوانی ڕوون كردۆتەوە: ئەگەر پرسیاركەر مەبەستی مسوڵمانەتیی بێ، بەڵێ هەموومان مسوڵمانین، بەلاّم ئەگەر مەبەستی ئەو ئیماندارانە بێ، كە خوا بەڵێنی بەهەشتی پێداون، تۆ نابێ بە ڕەهایی بڵێی: لەوانم، بەڵكو دەبێ بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ (إن شاء الله) ئیماندارم.

**مەسەلەی شەشەم**: خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾، لەبەرئەوەیە، چونكە ئیمانداران هەموویان یەك پلەیان نیە، بەڵكو لە بەهەشت دا چەندان پلە هەن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی كردۆتەوە: ﴿إنَّ أهْلَ عِلّيِينَ لَيَرَاهُمْ مِنْ أَسْفَلَ مِنْهُمْ، كَمَا تَرَاءوْنَ الكوكبَ الغَابِرَ فِي أُفُق مِنْ آفاق السَّمَاء، قالُوا: يَا رَسُولَ الله! تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ لاَ يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ، قَالَ: بَلَى والّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، رِجَالٌ آمَنُوا بِاللهِ وَصَدَّقُوا المُرْسَلِينَ﴾ {أَخرجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٩٥٨)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (٨٨٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٥٨) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَابْنُ مَاجَهْ، برقم: (٩٦)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (١١٣٠)، وَابْنُ حِبَّانَ، برقم: (٧٣٩٣) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قال شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَن}.

واتە : ئەوانەی لە شوێنە بەرزەکانی بەهەشتن ، ئەوانەی لە خوارەوەن ، وا تەماشایان دەکەن ، وەك چۆن تەماشای ئەستێرەیەکی دوور دەکەی لە ئاسۆیەك لە ئاسۆیەکانی ئاسمان ، گوتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوانە پێگەی پێغەمبەرانن ، جگە لەوان کەس ناگاتە ئەو پلە بەرزانە ، فەرمووی : با ، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ، پیاوانێکیش دەگەنە ئەو پلە بەرزانە ، کە بڕوایان بە خوا هێناوە ، وە پێغەمبەرانی خوایان بە ڕاست داناوە.

ئنجا لێرەدا دیارە کۆڕەکە، کۆڕی پیاوان بووە، بۆیە فەرموویەتی: پیاوان، ئەگەرنا هەر کەسێك ئیمانی چاکی هەبێ ، ئنجا پیاو بێ ، یان ئافرەت ، ئەوە شوێنیانە ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ : ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾﴾ ، واتە : هەر کەسێکیش فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکات ، ئەوە ئەوانە لەگەڵ کەسانێك دان کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون ، لە پێغەمبەران‌و صیددیقان‌و شەهیدان‌و صاڵحان ئەوانەش باشترین هاوەڵن .

**مەسەلەی حەوتەم** : خوا ﷻ کە دەفەرموێ : ﴿وَمَغۡفِرَةٞ﴾ ، وە لێبوردنێك ، زانایان گوتوویانە : (لِـذنُوبِهم الأَصْلِيـة ، وَلِـذنُوبِهِم الإِضَافِيـة ، كَالغَفْلَـة وَالسَّهْو) ، ئنجا ئایا ئەو دوو جۆرە گوناهە جیاوازییان چییە ؟ دەڵێین : گوناهی ئەسڵیی وەك : قەتڵ‌و زیناو درۆو بوختان ، بەڵام گوناهی (إضافِي) واتە : لە ئەسڵدا گوناح نیە ، بەڵام بە نسبەت ئەوانەوە گوناهە ، وەك بێگایی‌و هەڵەو لەبیرچوون ، کە سزای لە بەرانبەردا نیە ، بەڵام پاداشتێکیان لە دەست چووە ، وە لێرە دایە کە زانایان گوتوویانە : (حَسَنَاتُ الأَبْرَار ، سَيِّئَاتُ المُقَرَّبِين) .

واتە : ئەوەی بۆ چاکەکاران چاکە ، بۆ زۆر لە خوا نیزیکان خراپە ، چۆن ؟ لە (صحيح البخاري)[1]دا هاتوە ، ڕۆژێك پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ

١) ﴿عَنْ طَلْحَةَ بن عُبَيْد الله ، قَالَ : جَاءَ رَجُلٌ إلى رسول اللهِ ﷺ مِنْ أَهْل نَجْدٍ ، ثائرُ الرأسِ يُسْمَعُ دويُّ صوتِهِ ولا يُفْقَهُ ما يقول ، حَتَّى دَنَا فإذا هو يَسأل عَنِ الإِسْلام ؛ فقال رسول الله ﷺ : خَمْسُ صلواتٍ فِي اليومِ والليلةِ ، فقال : هَلْ عليّ غيرُها ؟ قال : لا إلاَّ أنْ تَطَوَّعَ ، قال

گوتی: خوا چی لەسەر پێویست کردووم؟ فەرمووی: لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژ، گوتی: چی دی، فەرمووی: مەگەر بۆخۆت نوێژی سوننەت بکەی، ئنجا دەربارەی ڕۆژوو زەکاتو حەجیش پرسیاری کردو، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوە، کابراش گوتی: سوێند بەوەی تۆی بەهەق ناردوە، لەو پێنج پایانەی ئیسلام، نە لێیان زیاد دەکەمو نە لێیان کەم دەکەم، واتە: فەرزەکان دەکەم، بەڵام سوننەتان ناکەم، کە کابرا ڕۆیشت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات، سەرفرازە.

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، فەرموویەتی: هەر کەس دەیەوێ تەماشای پیاوێکی بەهەشتیی بکات، با تەماشای ئەو پیاوە بکات.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، فەرموویەتی: ﴿نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ﴾ {أَخرجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٣٣٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١١٠٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٧٩)}.

واتە: عەبدوڵڵا پیاوێکی زۆر باشە، ئەگەر شەونوێژی کردبایە.

کەواتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کاتێك دەبێتە پیاوێکی باش، ئەگەر شەونوێژانیش بکات، بەڵام بۆ مسوڵمانێکی ئاسایی فەرموویەتی: ئەگەر پێنج پایەکانی ئیسلام جێبەجێ بکات، پاش هەبوونی ئیمانو عەقیدەو، خۆ پاراستن لە گوناهە گەورەکان، ئەوە دەچێتە بەهەشت!

**مەسەلەی هەشتەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾، وشەی (كَرَم) لە ئەسڵی زمان دا، بە مانای ڕێز دێ، وە بە مانای بەخشندەیی دێ، بەڵام لە زاراوەی قورئان دا: (الكريمُ: يُوصَفُ بِهِ كُلُّ شَيءٍ شَرُفَ فِي بَابِهِ)[1]، وشەی (كريم) هەر شتێکی پێ پێناسە دەکرێ، کە لە جۆری خۆی باشترین بێ،

رسول الله ﷺ: وصيامُ رمضانَ، قال: هل عليّ غيره؟ قال: لا إلاَّ أن تَطَوَّعَ قال، وذكر له رسول الله ﷺ الزكاةَ، قال: هل عليَّ غيرُها؟ قال لا إلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ، قال: فأدبر الرجل وهو يقول: والله لا أزيد على هذا، ولا أَنْقصُ، قال: رسول الله ﷺ: أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ﴾، رَوَاهُ البُخَارِيُّ، برقم ٤٦، و مُسْلِمٌ، برقم: ١٠٩.

١) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص ٧٠٧.

وەك خـــوا ﷻ دەفـــەرموێ : ﴿ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ الأنفـــال ، ﴿ مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ ﴾ الشـعراء ، ﴿ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ ﴾الدخـــان ، (كـريم) واتــه : پەســندو باش ، کەواتـه : کـه دەفەرموێ : ﴿ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ ، واتــه : ڕزقو ڕۆزییـەکی پڕ ڕێـزو پەسـندو باش ، یانی : خـوای بـێ وێنـه لێـرەدا سـەرنجی هاوەڵانی بەڕێـز خوا لێیـان ڕازی بـی ڕادەکێشـێ ، کـه ئەگەر ئێـوه لـەو جۆره بڕوادارانــه بـن ، خۆتـان بەو سیفەتانـه بـڕازێننـەوه ، ئەوه خـوا لـەو کـەمو کوڕییانــەی هەتانــن ، دەبـووریّ ، وه ڕزقو بـژیوێکی زۆر باشــتان دەداتــێ ، زۆر باشـتــر لــەو دەسـتکــەوتی جەنــگو غەنیمـەتـەی ، کـه خـەریك بوو لەســەری تووشــی ناکۆکـیی ببــن !

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دە (١٠) ئایەت پێکهاتوە، ئایەتەکانی: (٥ تا ١٤)، کە خوای کاربەجێ تێیاندا باسی سەرەتای دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە هاوەڵانی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای کافرەکانی مەککە، دەکات، کە بەشێك لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ پێیان ناخۆش بووە.

وە خوا ﷻ ئەوەیان دەخاتەوە یاد کە بەر لە دەستپێکردنی جەنگ، گفتی یەکێك لە دوو کۆمەڵەکەی پێدابوون: کاروانەکەی ئەبو سوفیان، یان سوپایەکەی قوڕەیش: (إِمَّا العِيرو النَّفير) هەرچەندە ئەوان حەزیان بە کاروانەکە دەکرد، چونکە بێ دڕك بوو، کاروانەکە تەنیا سی، چل (٣٠ – ٤٠)کەسی لەگەڵدا بوو، گوتیان: ئەوە بە ئاسانیی دەتوانین بیگرین، بەڵام ئەو سوپایەی بەرەو ڕوویان هاتبوو لە مەککەوە، ژمارەیان نیزیکەی هەزار کەس بوو، بەڵام خوای دادگەرو کاربەجێ ویستی هەق بچەسپێنێ و، لووتی ئەهلی کوفر بشکێنێ، بۆیە بە گژ سوپایەکەیدا کردن.

پاشان خوا ﷻ ئەوەیان دەخاتەوە یاد، کە لە سەرەتای جەنگەکەوە، هاواریان کردۆتە خوا، بەتایبەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گفتی ناردنی هەزار فریشتەی پێداون، بۆ ئەوەی دڵخۆشیان بکەن، وە مەعنەویاتیان بەرز بێتەوە.

هەروەها خوا ئەوەیان دەخاتەوە یاد، کە وەنەوزیان هاتوەو خەوکەیەکیان هاتۆتێ، وە بارانی بۆ ناردوون، کە باران بۆ باراندنەکە، کۆمەڵێك سوودو حیکمەتی تێدا بوون بۆ ئەوان، کە دوایی باسیان دەکەین.

پاشان دەیخاتەوە بەرچاویان کە خوا ﷻ چۆن فەرمانی دڵچەسپاندنی بڕواداارانی بە فریشتەکان کردوە ، وە ڕایگەیاندوە کە ترس دەخاتە دڵی کافرانەوە ، وە فەرمانیشی بە بڕواداران کردوە ، کە لە تەپڵی سەرەوە هەتا پەنجەیان ، لە کافرەکان بدەن ، ﴿ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ١٢ ﴾ ، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن : (لە کلاوی تا پێڵاوی) یان (لە تەپڵی سەری ، تا نووکی پێی) ، وە دەیخاتە ڕوو کە هۆکاری ئەوەش ، سەرپێچییان بووە لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا ﷻ .

﴿ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾
يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذۡ
يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ
لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ
وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٨﴾ إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ
أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ﴿٩﴾ جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ وَلِتَطۡمَئِنَّ
بِهِۦ قُلُوبُكُمۡۚ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ
ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ رِجۡزَ
ٱلشَّيۡطَٰنِ وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ ﴿١١﴾ إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ
فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ
وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ
وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٤﴾ ﴾ .

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{(هەرچەندە ئەو شێوە دابەشکردنەی دەستکەوتی جەنگتان پێناخۆش بوو ، بەڵام بەرژەوەندییتانی تێدا بوو) ئەوەش وەك ئەوە بوو ، کە پەروەردگارت بە هەق (بەرەو جەنگی بەدر) لە ماڵی خۆت هێنایتیەدەر ، وە کۆمەڵێك لە بڕوادارانیش پێیان ناخۆش بوو ﴿٥﴾ دوای ئەوەی هەق دەرکەوتبوو (کە بەرەنگاربوونەوەی دوژمن بوو) مشتومڕیان لەبارەیەوە دەکرد ، وەك بەرەو مەرگ ببرێن ، لە حاڵێکدا کە سەرنجی دەدەن ﴿٦﴾ (یاد بکەنەوە) کاتێك خوا بەڵێنی پێدان ، کە یەکێك لە دوو کۆمەڵەکە (کاروان یان سوپا) دەبێتە دەستکەوتتان ، وە ئێوە حەزتان دەکرد ئەوەی بێ دڕکە ، بە قسمەتتان بێ (کە کاروانەکە بوو) بەڵام خوا دەیەوێ : هەق بە وشەکانی (بڕیارەکانی) بچەسپێنێو ، دوای کافران ببڕێ ﴿٧﴾ تاکو هەق بچەسپێنێو ناهەق لابەرێ ، هەرچەندە تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێ ﴿٨﴾ (یاد بکەوە) کاتێك هاوارتان لە پەروەردگارتان دەبەست ، ئەویش وەڵامی دانەوە : کە بە دڵنیایی من بە هەزار فریشتەی هی دیکە بە دوای خۆخەر پشتتان دەگرم ﴿٩﴾ وە خوا ئەوەی تەنیا بە مایەی دڵخۆشیی‌و ئارامیی ئێوە گێڕا ، ئەگەرنا سەرخستن لەلایەن خواوەیە ، مسۆگەر خوا زاڵی کاربەجێیە ﴿١٠﴾ (یاد بکەنەوە) کاتێك (خوا) وەنەوزێکی هێمنکەرەوەی لەلایەن خۆیەوە بەسەردا هێنان ، وە لە ئاسمانەوە ئاوی بەسەردا باراندن ، تاکو بەهۆیەوە پاکتان بکاتەوەو (خوتخوتەو) پیسیی شەیتانتان لێ لابەرێو ، دڵەکانتان بەهێز بکاتو ، پێیەکانتانی پێ بچەسپێنێ ﴿١١﴾ (یاد بکەنەوە) کاتێك پەروەردگارت سروشی بۆ فریشتەکان کرد : کە بێگومان من لەگەڵتانم ، دەجا ئەوانەی بڕوایان هێناوە ، دامەزراو بکەن ، بە زوویی ترس‌و بیم (بەرانبەر بە ئێوە) دەهاوێمە دڵی ئەوانەی کە بێبڕوان ، دەجا (ئەی بڕوادارینە !) لە پشت گەردنیان‌و هەر سەرە

پەنجەیەکیان بدەن (لە تەپڵی سەریانەوە ، هەتا سەری پەنجەیان لێیان بدەن) ﴿١٢﴾ ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە ئەوان دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەییان کردوە ، وە هەر کەسێکیش دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ، ئەوە بێگومان خوا سزای توندە ﴿١٣﴾ ئا ئەو سزایەتان (ئەی کافرەکان !) بچێژن ، وە دڵنیابن کە بێبڕوایەکان سزاو ئازاری ئاگریان بۆ دانراوە ﴿١٤﴾} .

# شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان

(وَتَوَدُّونَ) : (الـوُدُّ : مَحبـةُ الشـيءِ وَتَمَنِّـي كـونِهِ ... ، وَالتَمَنّـي : هُـوَ تَشْـهِّي حُصُـولِ مَا تَـوَدُّهُ) ، (وُدُّ)

واتە : خۆشەویستیت بۆ شتێك كە خۆزگەی پێ بخوازی كە ببێ ، خۆزگە خواستنیش ئەوەیە كە تۆ حەز بكەی فلان شتە كە خۆشت دەوێ ، بە قسمەتت بێ .

(ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ ) : واتە : ئەوەی كە دڕكی پێوەیە ، بەڵام (شوكة) واتە : یەك دڕك ، (الشوكُ : مَا يَدِقُّ وَيَصْلُبُ رَأْسُهُ مِنَ النَّباتِ ، وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ السِّلاَحِ وَالشدَّةِ) .

(شوكُ) بریتیە لە هەر ڕووەكێك كە سەرەكەی تیژ بێ ، وە وشەی (شوكة) بەكاردەهێنرێ لە جیاتی توندیی ، وە لە جیاتی چەك .

(دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ) : (دَبَـرَ فُـلاَنٌ القَـوْمَ : صـارَ خَلْفَهُـمْ ، وَالدَّابِـرُ : يُقَـالَ لِلْمُتأَخِّـرِ ، كە دەگوترێ : (دَبَـرَ فُـلاَنٌ القَـوْمَ) .

واتە : كەوتە پشتیانەوە ، فلان كەس كەوتە پشت خەڵكەكەوە ، وە (دَابِـرُ) بە كۆتایی شتێك دەگوترێ ، كە دەفەرموێ : ﴿ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ ، واتە : دوایان ببڕێ ، كەسیان لێنەهێڵێ .

(تَسۡتَغِيثُونَ ) : واتە : هاوارتان لێ دەكرد ، هاوارتان تێدەبەست ، (الغَوْثُ : يُقَالُ فِي النُّصْرَةِ ، وَالغَيْثُ فِي الْمَطَرِ ، وَاسْتَغَثْتُهُ : طَلَبْتُ منه الغَوْثَ) .

(غَـوْث) لە یارمەتیداندا بەكاردێ ، وە (غَيْـث) لە باراندا بەكاردێ ، (اسْتَغَثْتُهُ) واتە : داوام لێكرد یارمەتییم بدات ، یاخود داوای یارمەتییم لێكرد .

(مُمِدُّكُم ) : واتە : ئیمدادتان بکات ، هاوکارییتان بکات ، (أَصْلُ الْمَدِّ : الْجَرُّ ، وَمِنْهُ الْمُدَّةُ لِلْوَقْتِ الْمُمْتَدِّ ، وَأَكْثَرُ مَا جَاءَ الإِمْدَادُ فِي الْمَحْبوبِ ، وَالْمَدُّ فِي الْمَكْرُوهِ) .

وشەی (مَدّ) لە ئەسڵدا واتە : درێژکردنەوە ، ڕاکێشان ، بۆیە بە کاتێکی درێژکراوە دەگوترێ : (مُدَّةُ) وە (إمداد) بە زۆری بۆ هاوکاریی کردن بۆ کاری خێرو چاکەیە ، بەڵام ئەگەر بگوترێ : (مَدّ) واتە : بۆ کاری خراپ هاوکاریی کرد .

(مُرْدِفِينَ ) : واتە خەڵکی دیکەیان بە دوای خۆیان داوە ، (أَرْدَفَ يُرْدِفُ فَهُوَ مُرْدِفٌ)

واتە : کەسێك کە سواری وڵاخی دەبێ ، کەسێکی دیکە لە دوای خۆی سوار دەکات ، یاخود کەسێك دەچێ بۆ شوێنێك ، کەسێکی دی بە دوای خۆ دەدات ، (مُرْدِف) واتە : بە دوا خۆخەر ، دەڵێ : (الرِّدْفُ : التَّابِع ، وَالمُرْدِفُ : المتَقَدِّم الَّذِي أَرْدَفَ غَيْرَهُ) ، وە لێرەدا بەمانای شوێنکەوتوو دێ ، کەسێکە کە بە پێش دەکەوێ‌و خەڵکی دیکە بەدوای خۆی دەخات .

(بُشْرَىٰ) : (البُشْرَى وَالبَشَارَةُ : وَهِيَ الخَبَرُ السارُّ) .

مانای هەردوو وشەی (بُشْرَى ، بَشارَة) بریتیە لە هەواڵی خۆش ، ئنجا بۆچی پێی گوتراوە : هەواڵی خۆش ، چونکە ئینسان کە هەواڵی خۆشی بۆ دێ ، پێستی دەمو چاوی گەش دەبێتەوە ، وە بە پێچەوانەوە : هەواڵی ناخۆشی بۆ بێ ، پێستی دەمو چاوی تاڵ دەبێ ، هەموو مرۆڤێك وایە .

(وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ) : واتە : وە بۆ ئەوەی کە دڵتان پێی ئارام بگرێ ، (الطُّمَأْنِيْنَة والإِطْمِئْنَانُ : السُّكُونُ بَعْدَ الإنْزِعَاجِ) ، (طُمَأْنِيْنَة وإِطْمِئْنَان) بریتیە لە ئارامییەك لە دوای جووڵە جووڵ‌و نارەحەت بوونێك .

(ٱلنُّعَاسَ ) : (النُّعَاسُ : النَّوْمُ القَلِيلُ) .

(نُعَاس) بریتیە لە خەوێکی کورت ، وەنەوزیشی پێ دەڵێن ، واتە : پێشەکی خەوتن ، یاخود خەوێکی سووك ، یان سەرخەو شکاندن .

(أَمَنَةً مِّنْهُ) : (أَصْلُ الأَمْنِ : طَمْأَنِينة النَّفسِ ، وَ زَوَالُ الْخَوْفِ وَأَمَنة : أَمْن) .

وشەی (أَمَنة : أَمْن) لە بنچینەدا بریتییە لەوە کە نەفسی ئینسان ئارام بگرێ ، وە ترسی نەمێنێ ، واتە : ئارامیی یان هێمنیی .

(رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ) : (الرِّجْزُ : الإضْطِرابُ ، الذَّنْبُ ، مَا يَدْعُو الشَّيْطانُ إِلَيْهِ مِنَ الكُفْرِ وَالبُهْتَانِ وَالفَسادِ) .

وشەی (رجز) هەم بە (ز) ، وە هەم بە (س) واتە : (رِجْس) بە مانای جووڵە جووڵ و گوناح دێ ، وە بە مانای هەر شتێك دێ كە شەیتان خەڵكی پێ بانگ دەكات ، خوتخوتەی بۆ دەكات لە بێبڕوایی و بوختان و خراپەكاریی .

(وَلِيَرْبِطَ) : (رَبَطَ الشيءَ : شَدَّهُ بالْمَكانِ لِلْحِفْظِ ، وَمِنْهُ رِباط الخَيْلِ ، وَهُوَ مَكانُ إقامة الخيل) ، (رَبَطَ الشيءَ) .

واتە : ئەو شتەی بەستەوە ، لەو شوێنەی كە دەبێ ئەو شتەی تێدا بپارێزرێ ، لەوەوە گوتراوە : (رِباط الخَيْلِ) ، ئەو شتەی كە وڵاخی پێ دەبەسترێتەوە ، یان وڵاخی لێ دەبەسترێتەوە ، تەویلە .

(ٱلرُّعْبَ) : واتە : (الإِنْقِطاعُ مِنْ امْتِلاءِ الْخَوْفِ) .

(رُعْب) واتە : ترسێكی وا ، كە دڵی ئینسان پڕ بكات و پەكی بخات .

(فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ) : (الرُّؤوس ، الجِهة العُلْيا مِنَ العُنُق) .

واتە : مەبەست لە (فَوْقَ الأَعْنَاق) سەرە ، چونكەی ئەوەی لە سەرووی گەردنەوەیە سەرە ، یاخود لە لای سەرەوەی مل بدەن ، چونكە دیارە كە تۆ بتەوێ كەسێك بكوژی ، ئەگەر لە گەردنی بدەی ، ئاسانتر تەواو دەبێ ، بە تایبەت بۆ ئەو كاتە كە جەنگ بە شمشێر بووە ، بەڵام ئێستا دیارە كە چەكەكان وان پێویست ناكات تەنیا لە سەر بدەی ، یان سەر ببڕی ، فیشەك كە بە تەپڵی سەرەوە بنرێ ، سەرەكە هەر بە جەستەكەیەوە ماوە مردووشە ، یان لە دڵی دەدەی .

(بَنَانٍ ) : کۆی (بَنَانة)یە ، دەڵێ : (البَنَانة : وَاحِدَةُ البَنَان ، وَهِيَ أَطْرَافُ الأَصابِعِ)[١].

(بَنَانة) بریتیە لە سەرەپەنجە ، (بَنَان) ، واتە : کۆی سەرەپەنجەکان .

(شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ) : واتە : سەرپێچیی خواو پێغەمبەری خوایان کرد ، چونکە دەڵێ : (الشِّقَاقُ : المُخَالَفَةُ ، وَكونُكَ فِي شِقّ غَيْر شِقّ صاحِبِكَ ، أَو مِنْ شَقّ العَصا بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ) .

واتە : (شِقَاق) بریتە لە سەرپێچیی و دووبەرەکیی ، ئەویش لەوەوە هاتوە کە تۆ لە بەرێکی ، ئەویش لە بەرێکی دیکەیە ، (شِقّ) واتە : لا ، هەندێکیش گوتوویانە : لەوەوە هاتوە کە گۆچانێك لە نێوانتاندا بێ ، گۆچانەکە لەت بکەی ، هەر لەتکەی بەدەست لایەکتانەوە بێ .

---

١) مختار الصحاح، ص٧٠.

# هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١ / هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە کە خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَمَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ٦﴾

﴿عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصارِيِّ رضي الله عنه، يَقُولُ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ وَنَحْنُ بِالمَدِينَةِ: إِنِّي أُخْبِرْتُ عَنْ عِيرِ أَبِي سُفْيانَ أَنَّها مُقْبِلَةٌ، فَهَلْ لَكُمْ أَنْ نَخْرُجَ قِبَلَ هَذَا العِيرِ؟ لَعَلَّ اللهَ يُغْنِمْنَاهَا؟ فَقُلْنَا: نَعَمْ، فَخَرَجَ وَخَرَجْنَا، فَلَمَّا سِرْنَا يَوْماً أَوْ يَوْمَيْنِ، قَالَ لَنَا: مَا تَرَوْنَ فِي القَوْمِ فَإِنَّهُمْ قَدْ أُخْبِرُوا بِمَخْرَجِكُمْ؟ فَقُلْنَا: لاَ وَاللهِ مَا لَنَا طاقَةٌ بِقِتَالِ العَدو، وَلَكِنْ أَرَدْنَا العِيرَ، ثُمَّ قَالَ: مَا تَرَوْنَ فِي قِتَالِ القَوْمِ؟ فَقُلْنَا مِثْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ المِقْدَادُ بْنُ عَمْرٍو إِذَنْ لا نَقُولُ لَكَ يا رَسولَ الله! كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى لِمُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ: ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ٢٤﴾ المائدة، قَالَ: فَتَمَنَّيْنَا مَعْشَرَ الأَنْصارِ، لَوْ أَنَا قُلْنَا، كَمَا قَالَ المِقْدَادُ، أَحَبُّ إِلَيْنَا مِنْ أَنْ يَكونَ لَنَا مَالٌ عَظِيمٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رَسولِهِ:

﴿كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَمَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ٦﴾ الأنفال، ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ١٢﴾ الأنفال، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ

﴿وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ ۝٧﴾الأنفال، وَالشوكة القَوْمُ، وَغيْرَ ذَاتِ الشوكة العِيرُ، فَلَمَّا وَعَدَنَا إِحْدَى الطائِفَتَيْنِ، إِمَّا القَوْمَ، وَإِمَّا العِيرِ، طابَتْ أَنْفُسنا، ثُمَّ إِنَّ رَسولَ اللّهِ ﷺ بَعَث رَجُلاً لِيَنْظُرَ مَا قِبَلَ القَوْمِ؟ فَقَالَ: رَأَيْتُ سَواداً وَلاَ أَدْرِي، فَقَالَ رَسُول اللّه ﷺ: هُمْ هُمْ هَلُمُّوا أَنْ نَتَعَادَّ، فَفَعَلْنَا، فَإِذَا نَحْنُ ثَلاثَ مِئة وَثَلاثَة عَشَر رَجُلاً، فَأَخْبَرْنَا رَسولَ الله بِعِدَّتِنَا فَسَرَّهُ ذَلِكَ، فَحَمِدَ الله، وَقَالَ: عِدَّة أَصْحَاب طَالُوت، ثُمَّ إِنا اجْتَمَعْنَا مَعَ القَوْمِ فَصَفَفْنَا، فَبَدَرَت مِنَّا بادِرَةٌ أَمَامَ الصَّف، فَنَظَرَ رَسول الله ﷺ إِلَيْهِم، فَقَالَ: مَعِي مَعِي، ثُمَّ إِنَّ رَسول الله ﷺ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَنْشُدُكَ وَعْدَكَ، فَقَالَ ابْنُ رَوَاحَة: يَا رَسول الله! إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُشِيرُ عَلَيْكَ، وَرَسولُ اللّهِ ﷺ أَفْضَلُ مَنْ يُشِيرُ عَلَيْهِ: إِنَّ الله عَزَّ وَجَلَّ أَعظَمُ من أَن تَنْشُدُهُ وَعْدَهُ، فَقَالَ: يَا ابْن رَوَاحَة! لأَنْشُدَنَّ اللّهَ وَعْدَه، فَإِنَّ الله لاَ يُخْلِفُ المِيْعَاد، فَأَخَذَ قَبْضَةً مِنَ التُّرَابِ، فَرَمَى بِها رَسول الله ﷺ فِي وُجُوهِ القَوْمِ فَانْهَزَمُوا، فَأَنْزَلَ الله عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَمَا رَمَيۡتَ إِذۡ رَمَيۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۝١٧﴾الأنفال، فَقَتَلْنَا وَأَسَرْنَا، فَقَالَ عُمَر رضي الله عنه: يَا رَسولَ الله! مَا أَرَى أَنْ يَكُونَ لَكَ أَسْرَى، فَإِنَّمَا نَحْنُ دَاعُونَ مُولِفُون، فَقُلْنَا مَعْشَرَ الأَنْصار: إِنَّمَا يَحْمِلُ عُمَر عَلَى مَا قَالَ، حَسدٌ لَنَا، فَنَامَ رَسول الله ﷺ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ، ثُمَّ قَالَ: ادْعُوا لِي عُمَر، فَدُعِيَ لَهُ، فَقَالَ: إِنَّ اللّهَ عَزَّوَ جَلَّ قَدْ أَنْزَلَ عَلَيَّ: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ۝٦٧﴾الأنفال﴿ {أَخرَجَهُ الطَّبَرَانِيّ فِي (الكبير) برقم: (٤٠٥٦)، وَابْنُ كَثير فِي تفسيره (تفسير القرآن العظيم) ج ٢، ص ٢٩٩، وَابْنُ أَبِي حَاتِم فِي تَفْسيره، برقم: (٨٨٠٥)، وصَحَّحَه مؤلفا الإستيعاب، ج ٢، ص١٩٣، ١٩٤ وَأَيْضا أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٦١٣) مختصراً، وَقَالَ شعيب الأَرنؤوط: إِسنادُهُ حَسَن} .

واتە: ئەبو ئەییووبی ئەنصاریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئێمە لە مەدینە بووین، پێی فەرموویین، من هەواڵم پێدراوە کە کاروانەکەی ئەبو سوفیان دەگەڕێتەوە (واتە: لە شامەوە)، ئایا ئامادەییتان هەیە کە بەرەو ڕووی ئەو کاروانە بچین، بەڵکو خوا بیکاتە دەستکەوتمان؟ گوتمان: بەڵێ، ئەو ڕۆیشتو ئێمەش لە خزمەتی دا ڕۆیشتین، دوای ئەوەی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ڕۆیشتین، پێی فەرموویین: ڕاتان چییە، قورەیش هەواڵیان پێدراوە، کە ئێوە دەرچوون بۆ ئەوەی کاروانەکەیان بگرن، وە هاتوون بۆ بەرگریی لێکردنی؟ گوتمان: نەخێر، ئێمە ناتوانین لەگەڵ دوژمندا بجەنگین، چونکە ئێمە بۆ گرتنی کاروان هاتووین، دووبارە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاتان چییە، کە جەنگ لەگەڵ ئەو سوپایەی قورەیشدا بکەین، کە لە مەککەوە هاتوون؟ دیسان دووبارەمان کردەوە، گوتمان: توانای جەنگ کردنمان نیە، لەگەڵ ئەو سوپایەدا، (دیارە زۆربەیان وایان گوتوە) بەلاّم میقدادی کوڕی عەمر خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئێمە ئەوە بە تۆ ناڵێین، وەك گەلی مووسا بە مووسایان گوت، سەلامی خوای لێ بێ، کە گوتیان:

﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ٢٤﴾ المائدة، واتە: ئەی مووسا! بڕۆ تۆ لەگەڵ پەروەردگارت دژی دوژمن بجەنگە، ئێمەش وا لێرە دانیشتووین، (ئەبو ئەییووب دەڵێ:) ئێمە وەك پشتیوانەکان خۆزگەمان خواست کە ئەو قسەیەمان کردبایە لە جیاتی میقداد، وە دەبڕینی ئەو قسەیەمان لە لا خۆشەویستتر بوو، لە دەستکەوتنی ماڵو سامانێکی زۆر، خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ٦﴾ الأنفال، پاشان خوای زاڵی پایەدا ئەو ئایەتەشی دابەزاند کە دەفەرموێ: ﴿أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ

﴿١٢﴾ الأنفال ، وە پێشتریش خوای بەرز ئەوەی دابەزاند بوو کە دەفەرموێ :
﴿ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ ﴿٧﴾ ﴾ الأنفال ، کە مەبەست لە درك (شوكة) ئەو خەڵکە بوو کە لە مەککەوە هاتبوون ، وە مەبەستیش لە بێ درکەکە ، ئەو کاروانە بوو کە لە شام هاتبوو ، ئنجا کاتێك خوای پەروەردگار یەکێك لەو دوو کۆمەڵەی گفت پێدایـن ، کە بیکاتە دەستکەوتمان ، دڵمان خۆش و ئارام بوو .

دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی نارد بۆ ئەوەی بزانێ ئەو سوپایەی کە هاتوە ، ژمارەیان چەندە ؟ ئەویش چوو ، کە هاتەوە گوتی : ڕەشاییەکم بینی ، بەڵام نازانم ژمارەیان چەندە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەرچەند بن ، ئەوەندەن کە هاتوون ، وەرن با ئێمەش سەرژمێری خۆمان بکەین ، ئێمەش خۆمان سەرژمێر کرد ، تەماشامان کرد ، سێ سەدو سێزدە (٣١٣) پیاوین ، (لە ڕیوایەتی دی دا هاتوە ، کە ژمارەیان سێ سەدو نۆزدە کەس بووە) ئنجا کە دەربارەی ژمارەمان هەواڵمان بە پێغەمبەری خوا ﷺدا ، دڵخۆش بوو ، وە ستایشی خوای کردو فەرمووی : ژمارەی هاوەڵانی طالۆوتین ، (واتە : ئەو سوپایەی کە طالووت بردی بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای جالووت ، سێ سەدو سێزدە کەس بوو) .

دوایی ئێمە کۆبووینەوەو لە بەرانبەر دوژمندا ڕیزمان بەست ، لە پێش ڕیزەکانەوە هەندێکمان ویستیان هەڵسوکەوتێك بکەن ، بێ مۆڵەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، (وەك حاڵەتێکی هەڵچوون ، کە ئەو باسی نەکردوە چی بووە ؟) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لەگەڵ من بن ، لەگەڵ من بن ، بە بێ فەرمانیی من هیچ جموجوڵێك مەکەن .

دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ پاڕایەوەو فەرمووی : خوایە ! ئەو بەڵێنەی کە پێت داوم ، داوات لێدەکەم کە بۆم بێنیە دی ، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! من دەمەوێ پێشنیارێکت بۆ بکەم ، پێغەمبەری خواش ﷺ باشترین کەسە کە پێشنیاری بۆ بکرێ ، بێگومان خوای پایەدارو

پایە بەرز لەوە گەورەترە کە تۆ بەڵێنی خۆتی لێ داوا بکەی، بۆ ئەوەی بیهێنێتە دی! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کوڕی ڕەواحە! بێگومان بەڵێنی خۆم لە خوا داوا دەکەم، وە خوای پەروەردگاریش بەڵێن زایە ناکات، (دیارە عەینی پاڕانەوەکەش خواپەرستییەو، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کورتری بینیوەو، پێغەمبەری خوا ﷺ دوورتری بینیوە).

دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ چنگە خۆڵێکی هەڵگرتو بەرەو ڕووی سوپای قوڕەیش هاویشتی، وە سەرەنجام تێکشکانو خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی لەوبارەوە ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴿١٧﴾﴾ الأنفال، واتە: تۆ نەبووی کە هاویشتت (خۆڵت کردە چاوی دوژمنەکان)، بەڵکو خوا بوو هاویشتی (هەر چەندە تۆ هاویشتت، بەڵام ئەوەی کە خۆڵەکەی گەیاندە دەمو چاوی هەمووان، خوای پەروەردگار بوو)، ئیدی لێمان کوشتنو لێمان بە دیل گرتن، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! پێم وایە، باش نیە کە دیلمان هەبن، چونکە ئێمە لە قۆناغێکدا نین، کە لێیان بە دیل بگرین، دەڵێ: ئێمەش کە پشتیوانەکان بووین گوتمان: ئەوەی وا لە عومەر دەکات دەڵێ: دیلان نەگرین، هیچ شتێك نیە جگە لە حەسوودیی، (کە دەیەوێ ئێمە ئەو دیلانە نەگرینو، لە بەرانبەریاندا فەرەبوو وەرنەگرینو، لە ڕووی داراییەوە سوود نەبینین، ئەو گومانە خراپەیان بەرانبەر عومەر خوا لێی ڕازی بێ، هەبوو)، بەڵام دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرخەوێکی شکاندو بێدار بۆوە، فەرمووی: عومەرم بۆ بانگ بکەن، بۆیان بانگ کرد، فەرمووی: خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی بۆ ناردوومە خوار: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾﴾ الأنفال، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە کە دیلان بگرێ، هەتاکو دوژمنەکەی لە پەلو پۆ نەخاتو زۆریان لێ نەکوژێ، ئێوە بە هاندەری دنیایی دیلەکانتان

دەگـرن ، بـۆ ئـەوەی دوایـی لـە بـەرانبـەردا قەرەبـوو وەربگـرن ، بـەلاّم خـوا ﷻ بـەرژەوەنـدیی دوارۆژی بۆ ئێوە دەوێ ، وە خـوا زاڵـی کاربـەجێیـە .

{دیارە ئـەم ئـایەتـە پشتگیـریی ڕایـەکەی عومـەر خـوا لـێی ڕازی بـێ دەکـات ، وەك لە کاتی خـۆی دا ئـەم ئـایەتـە دەتوێـژینـەوە } .

٢ / هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئـایەتـەی کـە دەفـەرموێ : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾﴾ .

﴿عَنْ عُمَرَ بْنُ الْخَطَّابِ قَالَ : لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ ، نَظَرَ رَسولُ اللهِ ﷺ إلَى الْمُشْرِكِينَ وَهُمْ أَلْفٌ ، وَأَصْحَابُهُ ثَلاثُمِائَةٍ وَتِسْعَةَ عَشَرَ رَجُلاً ، فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ الْقِبْلَةَ ، ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ فَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ : (اللَّهُمَّ ! أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي ، اللَّهُمَّ ! آتِ مَا وَعَدْتَنِي ، اللَّهُمَّ ! إِنْ تَهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةُ مِنْ أَهْلِ الإِسْلامِ ، لا تُعْبَدْ فِي الأَرْضِ) ، فَمَازَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ مَادًّا يَدَيْهِ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ ، حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ مَنْكِبَيْهِ ، فَأَتَاهُ أَبو بَكْرٍ ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ ، فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ ، ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِهِ ، وَقَالَ : يَا نَبِيَّ اللهِ كَفَاكَ مُنَاشَدَتُكَ رَبَّكَ ، فَإِنَّهُ سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾﴾ الأنفال ، فَأَمَدَّهُ اللَّهُ بِالْمَلائِكَةِ﴾

{أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ ، برقم : (١٧٦٣) ، وَأَبو دَاوُدَ ، برقم : (٢٦٨) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (٣٠٨١) ، وَالبَزَّار ، برقم : (١٩٦) ، وَابْنُ حِبانَ ، برقم : (٤٧٩٣)} .

واتـە : عومەری کـوڕی خـەتتاب خـوا لێی ڕازی بێ دەڵـێ : پێغـەمبـەری خـوا لـە جەنگی بـەدردا ، تـەماشـای هاوبـەش دانـەرەکـانی کـرد ، ژمارەیـان هـەزار بـوو ، وە تـەماشـای هاوەڵەکـانی کـرد ، سـێ سـەدو نـۆزدە کەسـە بـوون ، بۆیـە ڕووی کـردە قیبلەو دەستـەکانی درێـژکـردن ، وە دەستی کرد بـە هاوار لە خـوا بـەستن‌و پاڕانـەوە لـە خـوا ، (وا پێدەچێ دەنگی بـەرز کردبێتـەوە ، چونکـە دەنگەکـەی بیستـراوە) ، دەیفەرمـوو : ئـەی خوایە ! ئـەو بـەڵێنـەی پێت داوم ، بۆم بێنـە دی ، ئـەی خـوایە !

ئەو گفتەی پێتداوم ، بۆم جێبەجێ بکە ! ئەی خوایە ! ئەگەر ئەو کۆمەڵە لە بەین بچن ، تۆ لەسەر زەوی ناپەرستریێ ، (واتە : ئەوەی کە من لە ماوەی سێزدە ساڵی مەککەو ، دوو ساڵی مەدینەدا پەروەردەم کردوون ، ئەوەندەن ، ئنجا ئەگەر ئەوان لە بەین بچن ، مانای وایە تۆوی ئیسلام دەبڕێتەوە ، بۆیە خوایە بەزەییت پێماندا بێتەوە) بۆیە بەردەوام هاواری دەکردە پەروەردگاری : دەستی بەرزکردبوونەوە ، ڕوو بە ڕووگە ، هەتا عەبایەکەی لەسەر شانی کەوتە خوار ، بۆیە ئەبو بەکر هات عەبایەکەی خستەوە سەر شانیو ، دوایی لە پشتڕا لە باوەشی گرتو ، گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەسە ، زۆر لە پەروەردگارت پاڕایەوە ، بێگومان ئەو بەڵێنەی پێی داوی ، بۆت جێبەجێ دەکات ، ئیدی لەوکاتەدا ، خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی ناردە خوار : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾﴾ الأنفال ، واتە : یاد بکەنەوە ! کاتێك لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە ، ئەویش وەڵامی دانەوەو فەرمووی : من بە هەزار لە فریشتەکان کە هی دیکەشیان بەدوادا دێن ، کۆمەکیی ئێوە دەکەمو یارمەتیتان دەدەم ، وە خوا بە فریشتەکان پشتی گرت .

## مانای گشتی ئایەتەکان

لەم دە ئایەتە موبارەکەدا ، خوای بەرزو مەزن باسی سەرەتاو دەسپێکی جەنگی بەدر دەکات ، هەروەها چۆنیەتی ئەنجامدرانی جەنگەکە ، وە چۆن خوای کاربەجێ هۆکارەکانی سازکردنی ئەم جەنگەی ساز کردوە ، وە پاشان هۆکارەکانی سەرخستنی مسولمانان ، وە سەرەنجام ئەوە هاتۆتە دی کە خوای پەروەردگار ویستوویەتیو ، بۆ ئیماندااران بە چاكو بەرژەوەندیی زانیوە .

خوا ﷻ سەرەتا دەفەرموێ : ﴿ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴾ ، واتە : وەك چۆن خوای پەروەردگارت بە هەق تۆی لە ماڵی خۆت هێنایە دەر ، وە کۆمەڵێك لە بڕواداران پێیان ناخۆش بوو ، توێژەرەوانی لەوبارەوە زۆریان قسە کردوە ، وە زۆر مشتومڕیان بووە ، ئایا ئەو (ك)ی سەر (كما) ، چوێنراوە بە چییەوە ؟ بەڵام بە پێی سیاقی ئایەتەکان ، وە قسەی زۆربەی توێژەرەوانی قورئانیش ئەوەیە ، کە پێشتر باسی مشتومڕی هاوەڵان کراوە ، دەربارەی چۆنیەتی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگی بەدر ، لێرەشدا خوا دەفەرموێ : وەك چۆن مشتومڕتان بوو ، دەربارەی ئەوە کە خوا لە ماڵ بردنیە دەر بە هەق ، وە کۆمەڵێك لە بڕوادارانیش پێیان ناخۆش بوو ، بە هەمان شێوەش ئەو دابەشکردنی دەستکەوتەش هەر لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بووە ، وە هەر ئەوە هەقە کە ئەو بڕیاری لەسەر دەدات ، کەواتە : بەرژەوەندیی ئێوە هەر لەوە دایە کە خوا بڕیاری لەسەر دەدات ، واتە : ئەو چوونە دەرەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە هاوەڵانی ، کە لەسەر دڵی هەندێکیان زۆر قورس بوو ، بەڵام بێگومان بەرژەوەندیی دنیاو دوارۆژی مسوڵمانان ، هەمیشە لە شوێنکەوتنی بڕیارو شەریعەتی خوا دایە .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ ﴾ ، دەربارەی هەق موناقەشەو شەڕە قسەیان لەگەڵ تۆدا دەکرد ، دوای ئەوەی ئەو هەقە ڕوون بۆتەوە .

کە ئەو هەقەش وا پێدەچێ بریتی بێ لەوە کە تازە جەنگێك هاتۆتە پێش، شەڕەو دەرگای پێگرتووی‌و، دەبێ بکرێ، ئەوە هەقێکەو، نابێ لێی لابدەی، دەفەرموێ: دوای ئەوەی ئەو هەقە ڕوون بۆتەوەو، دەزانن کە سوپایەکی هەزار کەسی بەرەو ڕوویان دێ لە مەککەوە، نەدەبوو، مشتومڕو موناقەشەیان کردبایە، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، بڵێن: ئێمە بۆ کاروان گرتن هاتووین، نەك بۆ شەڕ کردن!

ئنجا دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ﴾، هەروەك بەرەو مردن ببرێن‌و، تەماشای مردنیش بکەن، هێندە پێیان ناخۆشە، دیارە هەندێکیان وا بوون، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، وە دوایی باسی دەکەین لەبەرچی هێندە پێیان ناخۆش بووە.

دوایی خوای پەروەردگار شتێکیان دەخاتەوە یاد، دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ﴾، وە یاد بکەنەوە کاتێك کە خوا بەڵێنی پێدان کە یەکێك لە دوو کۆمەڵەکان بۆ ئێوە بێ، واتە: ببێتە دەستکەوتتان، ﴿وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ﴾، بەڵام ئێوە خۆزگەتان دەخواست‌و پێتان خۆش بوو، ئەوەی کە دڕکی پێوەنیە بۆ ئێوە بێ، هەڵبەتە بێ دڕکەکە کاروانەکە بوو، بە دڕکەکەش سوپایەکە بوو، ﴿وَيُرِيدُ اللَّهُ أَن يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ﴾، بەڵام خوا دەیویست کە هەق بە وشەو بڕیارەکانی خۆی بچەسپێنی، وە دوای بێبڕوایان ببڕێ، زەبوون‌و زەلیل‌و سەرشۆڕیان بکات‌و تێکیان بشکێنێ، بۆچی؟ ﴿لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ﴾، تاکو هەق بچەسپێنێ، وە ناهەقیش بپووکێنێتەوە، ﴿وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ﴾، هەرچەندە تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێ.

ئنجا خوا شتێکی دیکەیان دەخاتەوە بیر، دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّى مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾، وە یاد بکەنەوە: کاتێك هاوارتان لە پەروەردگارتان دەکرد، ئەویش وەڵامی دانەوە کە من پشتیگرییتان دەکەم، بە هەزار لە فریشتانی بە دوای خۆخەر، (مُرْدِف) کەسێکە لە پێشەوە بڕواو خەڵکی دیکەی بەدوادا بێ، واتە: ئەو فریشتانە، فریشتەی دیکەشیان بەدوادا هاتوە، هەروەها خوێنراویشەتەوە (مُرْدَفِين) واتە: بەدواخراو، ئەو فریشتانەی بەدوای هاوەڵان خراون، بۆ ئەوەی ببنە پشتیوانو هاوکاری ئەوان، دیارە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پاڕاوەتەوە، بە تەئکید هاوەڵانیش هەر پاڕاونەتەوە، وە دەشگونجێ هەر پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەست بێ، کە ئەو کاتە لە جیاتی هەموو هاوەڵانیش پاڕاوەتەوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ﴾، وە بێگومان ئیمدادکرانی ئێوە بە فریشتەکان، وە پشتگیرییکرانی ئێوە بە فریشتەکان، تەنیا خوا کردی بە مایەی دڵخۆشیی، وە بۆ ئەوەی دڵتان پێی ئارام بگرێ، ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، ئەگەرنا سەرکەوتنو سەرخستن، تەنیا لە لای خواوەیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾، وە بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە، واتە: وامەزانن سەرکەوتن لە لایەن فریشتەکانەوەیە، بەڵکو ئەوان هۆکارێکن، بۆ ئەوەی لایەنی مەعنەویی ئێوەی پێ بەرز بێ، وە دڵتان پێی ئارام بگرێ، ئەگەرنا ئەوە هەر خوای باڵادەست کە بڕیار دەدات کە سەربکەون، یان ژێر بکەون؟ وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر خوا سەرتان بخات، هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ (و پێتان ناوێرێ)، وە ئەگەر پشتیشتان بەربدات، ئایا کێ یە ئەو کەسەی کە دوای وی سەرتان دەخات؟ وە با بڕواداران بەس پشت بە خوا ببەستن.

پاشان دەفەرموێ : ﴿ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ ﴾ ، وە یاد بکەنەوە : کاتێك خوا لەلایەن خۆیەوە ، وەك دڵنیاکەرەوەو هێمن کەرەوەیەك خەوچکەیەکی بەسەردا هێنان ، وەنەوزێکی بەسەردا هێنان ، ﴿ وَيُنَزِّلُ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ ﴾ ، وە یاد بکەنەوە : کاتێك خوا لە سەرێوە ئاوی بۆ هێنانە خوارو (بارانی بۆ باراندن) ، بۆ ئەوەی چوار ئامانجی پێ بێنێتە دی :

یەکەم و دووەم بریتین لە : ﴿ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذۡهِبَ عَنكُمۡ رِجۡزَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾ ، تاکو پاکتان بکاتەوە بەهۆی ئەو ئاوەوە ، چونکە هەیان بووە لەشی پیس بووە ، هەیان بووە دژوێن[1] بووە ، بەهۆی ئەو ئاوەوە خۆیان شۆردوە ، وە بۆ ئەوەی وەسوەسەو پیسیی شەیتانتان لێ دوور بخاتەوە ، دەگونجێ لێرەدا مەبەست پێی لابردنی لەش پیسیی بێ ، وە دەشگونجێ مەبەست لێرەدا لابردنی وەسوەسەو خوتخوتەیەك بێ ، لەبەرئەوەی شوێنی هاوەڵان شوێنێك بوو ، ئەگەر بارانی لێ نەباریبایە، تێدەچەقین ، بە پێچەوانەی شوێنی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانەوە ، کە شوێنی ئەوان بەبێ بارینی باران ، لە هی هاوەڵان باشتر بوو .

سێیەم و چوارەم دەفەرموێ : ﴿ وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ ﴾ ، وە بۆ ئەوەی دڵتان پتەوو قایم بکات ، وە بۆ ئەوەی پێیەکانیشتان بچەسپێنێ ، چونکە زەوییەکە بەهۆی ئەو بارانەوە ، پتەوو پندر بووو ، بووە هۆی ئەوە کە تێی نەچەقن .

دووبارە دەفەرموێ : ﴿ إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ ، یاد بکەنەوە : کاتێك کە پەروەردگارت وەحی نارد بۆ فریشتەکان ، پێی فەرموون : ﴿ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ، خوا ﷻ دەفەرموێ : من لەگەڵ ئێوەدام ، ئنجا : ئێوە ئەوانەی بڕوایان هێناوە ، دامەزراویان بکەن ، ئیلهامی باشیان بخەنە دڵو دەروونەوە ، ﴿ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ ﴾ ، بە دڵنیایی ترس دەخەمە دڵی

---

١) دژوێن : چڵکن .

ئەوانەوە کە بێبڕوان ، ئنجا چ ڕاستەوخۆ ، چ ناڕاستەوخۆ لە ڕێی فریشتەکانەوە ئەو ترسە بخاتە دڵو دەروونی کافرەکانەوە ، ﴿ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ﴾ ، ئێوەش ئەی بڕوادارینە ! لە سەرەوەی گەردنی کافرەکان بدەن ، وە لە هەموو سەرە پەنجەیەکیان بدەن ، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن : (لە تەپڵی سەر ، هەتا نووکی پێ ، پێیاندا وەرن) ، هەر شوێنێکتان بە دەرفەت بینی لە جەستەیان ، لێیان بدەن ، ئەمە واتایەکی ، واتایەکی دیکەی : لە سەریان بدەن ، مەبەست پێی لە گەردن دانیانە ، واتە : لە گەردنیان بدەن بۆ ئەوەی ژیانیان تێدا نەهێڵن ، وە ئەگەر سەریانتان بۆ چنگ نەکەوت ، لە دەستو پێیەکانیان بدەن ، تاکو ئەوە ئەندامەی کە شەڕێ پێدەکەن ، کە دەستو پەنجەیانە ، لە کار بکەون .

ئنجا خوا حیکمەتی ئەوە ڕوون دەکاتەوە ، کە بۆچی پێی خۆشە کافرەکان لە بەین بچنو فریشتەکانی ناردوە بۆ هاوکاریی ئیمانداران ؟ دەفەرموێ : ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ ، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە سەرپێچییان کرد لە خواو لە پێغەمبەرەکەی ﷺ ، ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ ، وە بێگومان هەر کەسێك سەرپێچیی لە خواو لە پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات ، خوا سزاو تۆڵەی سەختو توندە .

لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ ذَٰلِكُمۡ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ ئا ئەمەتان بیچێژن ، (کە مەبەست چێژتنی سزایە لە دنیادا) ، وە دڵنیابن کە بۆ بێبڕوایان ، (چ بێبڕوایانی قورەیشی مەککە ، چ بێبڕوایانی دیکە تا دنیا کۆتایی دێ) سزاو ئازاری ئاگر هەیە ، یانی : سزایەکە هەر ئەوەندە نیە ، بەوەندەی دنیا ڕزگاریان بێ ، بەڵکو سزای سەختی دوارۆژیش چاوەڕێیان دەکات .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴾، چ شتێك (تشبیه) کراوە بەم دەرچوونەی پێغەمبەری خوا، لە ماڵی خۆی بە هەق، لە کاتێکدا کۆمەڵێك لە بڕواداران ناخۆشحاڵ بوون بەو دەرچوونە؟ ئەوەی کە بەوە (تشبیه) کراوەو پێی چوێنراوە، بریتیە لە دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ، چونکە ئەویش مشتومڕی هاوەڵانی لەسەر بوو، وەك چۆن دەرچوونیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپاکەی ئەبو جەهل، زۆربەیان، یان هەندێکیان لەسەر دڵیان قورس بوو، بە هەمان شێوەش بڕیاری دابەشکردنی دەستەکەوتەکانی جەنگیشیان لەسەر دڵ قورس بوو، بەڵام وەك چۆن بەرژەوەندییان لەو چوونەدەرەدا بوو، بە هەمان شێوەش بەرژەوەندییان لەوەدا بوو، کە دەستەکەوتەکانی جەنگ لە لایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە دابەش بکرێن بە یەکسانیی، وە هەموویان تێیان دا بەشدار بکرێن، نەك بەو شێوەیەی کە خۆیان مشتومڕیان بوو لەسەری، کە بووبوونە سێ بەش:

١) ئەوانەی کە زیاتر جەنگەکەیان کردبوو، دەیانگوت: ئێمە زیاتر بەشمان پێوەیەتی.

٢) ئەوانەی کە دەستکەوتەکەیان کۆکردبۆوە دەیانگوت: ئێمە پێی موستەحەق ترین، چونکە کۆمان کردۆتەوە.

٣) ئەوانەش کە لە دەوری پێغەمبەر ﷺ، یان لە پشتی جەبهەی شەڕ بوونو، پاسەوان بوون، دەیانگوت: ئێمە زیاتر بەشمان پێوەیە! بەڵام خوای پەروەردگار هەموویانی وەك یەك بەشدار کرد.

کەواتە: هەمیشە بەرژەوەندیی مسوڵمانان لە پابەندیی بە شەریعەت دایە، نەك شوێنکەوتنی بیروڕاو میزاجو ئارەزووەکانی خۆیان، لە کاتێکدا کە

بڕیاری شەریعەت هەیە ، هەڵبەتە ئەگەر بڕیاری شەریعەت نەبوو ، ئەوە فەرمانمان پێکراوە ، کە خۆمان بیر بکەینەوەو عەقڵی خۆمان بەکاربێنین ، وە سەلیقەی خۆمان بخەینە کار ، بەڵام ئەگەر شتێك خوا نوقتەی تێدا خستبێتە سەر پیت ، بواری قسەی تێدا نەماوەتەوە ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ :

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ الأحزاب ، واتە : هیچ پیاوێکی بڕوادارو هیچ ئافرەتێکی بڕوادار ، بۆیان نیە ، کاتێك خواو پێغەمبەری خوا ، بڕیاری کارێك دەدەن ، مافی سەرپشكبوون بە خۆیان بدەن ، وە هەر کەسێك سەرپێچیی لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ، ئەوە بە گومڕاییەکی ئاشکرا گومڕا بووە .

ئنجا کە دەفەرموێ : کۆمەڵێك لە بڕواداران پێیان ناخۆش بوو ، کە ڕەنگە زۆربەشیان بووبن ، بۆچی پێیان ناخۆش بوو ؟

دەتوانین بڵێین لەبەر دوو هۆکار :

١ / جەنگ کردن ، کە ڕەنگە تێیدا بکوژرێی ، بریندار بی ، پەککەوتە بی ، مرۆڤ حەز ناکات تووشی ئەو حاڵەتانە بێ ، سروشتی مرۆڤ وایە ، کە حەز بە سەلامەتیی دەکات ، وەك لە سوورەتی (البقرة)شدا خوای پەروەردگار باسی ئەو حاڵەتەی کردوە ، کە دەفەرموێ : ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾ ، واتە : جەنگتان لەسەر پێویست کراوە {کە دەبێ لە کاتو شوێنی خۆیدا ، بکرێ} وە پێشتان ناخۆشە ، زۆریش نیزیکە شتێکتان پێ ناخۆش بێ ، کەچی بەرژەوەندییو خێری ئێوەی تێدابێ ، وە زۆر نیزیکە شتێکتان پێ خۆش بێ ، {کە بریتیە لە جەنگ نەکردنو ، بێمزەڕەتییو سەلامەتیی} ، بەڵام زیانو زەرەری ئێوەی تێدا بێ .

٢ / وە دەگونجێ لەبەر ئەوە پێیان ناخۆشبووبێ ، کە پێشتر خۆیان بۆ ئامادە نەکردبوو ، نە لە ڕووی ژمارەوە ، نە لە ڕووی کەل‌و پەلی جەنگەوە ، هەروەك ئاشکرایە ، ئێمە پێشتر لە بەسەرهاتەکانی جەنگی بەدردا هێنامان ، کە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ ، یەکێك لە هۆکارەکانی پێناخۆش بوونی ئەنجام دانی ئەو جەنگەیان ڕوونکردەوەو ، گوتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئێمە بۆ گرتنی کاروان هاتووین ، کە سی چل کەسی لەگەڵ بووە ، ئەگەر زانیبامان جەنگ دەکەین ، بە ژمارەیەکی زیاتر دەهاتین ، وە چەك‌و ئیمکانیەتی باشترمان لەگەڵ خۆمان دەهێنا ، کەواتە : هەم لەبارەی چۆنایەتییو ، هەم لەبارەی چەندایەتییەوە ، خۆیان بۆ ئامادە نەکردبوو ، بۆیە پێیان ناخۆش بوو ئەو جەنگە بکەن .

ئنجا ئەو حیکمەتەی کە لێی وەردەگیرێ ، ئەوەیە کە مەرج نیە هەرچی ئێمە پێمان خۆش بوو ، باش بێ ، وە هەرچییەك پێمان ناخۆش بوو ، خراپ بێ ، وەك ئایەتەکەی سووڕەتی (البقرة) باسیکردوە کە پێشتر هێنامان ، هەروەها لە سووڕەتی (النساء)یشدا دەفەرموێ : ﴿...فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ١٩﴾ ، واتە : زۆر نیزیکە حەز بە شتێك نەکەن ، بەڵام خوا خێرو بەرژەوەندییەکی زۆری تێبخات .

## بیرەوەرییەکی خۆم حیکمەتی خوای کاربزان

لێرەدا حەز دەکەم ئامژە بە بیرەوەرییەکی خۆم بکەم : کاتی خۆی لە لایەن ئەمریکییەکانەوە گیرام ، یەکەمجارم بوو بگیرێم ، بەو شێوە گرتنە ، واتە : لە (١٠/ ٧/ ٢٠٠٣ تا ٢٨/ ٤/ ٢٠٠٥) ، کە بیست‌و دوو مانگ لە زینداندا مامەوە .

ئنجا لە ژیانمدا زیندانیی کردنم زۆر پێ ناخۆش بوو ، زۆرجار لە خوا دەپاڕامەوە دەمگوت : خوایە ! بە زیندانیی‌و سجن کردن تاقیم نەکەیەوە ، زۆر لەسەر دڵم قورسە ، چونکە سوپاس بۆ خوا ، وە لە خوا بە زیاد بێ ، لە ژیانمدا زەبوونیی‌و بێ دەستەڵاتییم بەخۆمەوە نەدیبوو ، بەڵام بە تەئکید هەر

کەسێك زیندانیی بکرێ ، بێ دەسـتـەڵات دەکرێ ، چونکـە سـادەتریت شـتی خۆت بـە دەست خۆت نـابێ ، چـی دەخۆی ؟ کـەی دەخـۆی ؟ لـە کـوێ دەخـەوی ؟ چۆن دەخـەوی ؟ چی لەبـەر دەکـەی ؟ کـەی دەسـتنوێژ دەگـری ... ؟ بۆیـە سـەرەتا زۆر زۆرم پـێ ناخـۆش بـوو ، بەڵام دوایی زۆر بیـرم لەو ئـایەتانـە دەکـردەوە : ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴿٢١٦﴾﴾ ، ﴿فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴿١٩﴾﴾ ، وە بێگومـان دوایـی ئـەو زینـدانیی کرانـەم لـە زۆر ڕووەوە بـە خێـر گـەڕا ، بۆ نـموونـە :

١) مـن لـە زینـدانـدا دەرفەتێـکی بـاشـم هـەبـوو ، بـۆ بـەخۆدا چوونـەوەو لـە خـوا نـیـزیك بوونـەوەی زیاتـر ، وە ئـەو زیـندانـە ئیعـتیکافێکی ئیجبـاریی بـوو .

٢) کە لە خوا بە زیـاد بـێ ، توانیم زیـاتـر لە سـەدو چل جـار قورئـان خەتـم بکـەم .

٣) وە کـتێـبێکـم نووسی بـە نـاوی : (الإِسْلاَمُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ اللهِ) ، کـە بـە بۆچـوونی مـن مەوسـووعـەیەکـی گـەورەو گرنگـە ، بـۆ ناسـندنی ئیسـلام لەبـەر ڕۆشـنـایی قورئـان داو ، لە بـواری خـۆی دا وێنـەیـم پـێ شـك نایـەت.

٤) بـواری بیـرکردنـەوەو ڕامـانێـکـی بـاشـم هـەبـوو لـە قورئـانداو ، زۆر تێگەیشـتنی تازەم بۆ دروسـت بـوو ، دەربـارەی زۆر لە ئـایەتـەکانی قورئـان .

٥) دەرکـەوت ئـەوانـەی دەمیـان لـە ئێمـە کوتابـوو ، درۆزن دەرچـوون لـە لای ئـەمریکییـەکان ، وە ئێمـە ڕاسـتو سـاغو سـەربـەرزانـە دەرچـووین ، وە بۆیـان دەرکـەوت کـە ئێمـە ڕاسـت بێـژین ، وە کـەسـانێکی مەبدەئییـن ، چونکـە ئـەو قسـەیەی کـە لـە سـەرەتای گیـرانو تـەحقیـق لەگـەڵ کـرانو ئـەشکـەنجـەدرانم دا گـوتم ، هـەمان قسـە بـوو کـە لـە کـاتی بـەردرانـم دا گوتـم ، چونکـە کەسـێك هـەق بـڵێ ، هـەق نـاگـۆڕێ ، (٢ + ٢) هـەر دەکـاتـە (٤) .

گرنگ ئـەوەیە مسـوڵمان دەبـێ پشـتی بە خـوای بـاڵادەسـت ببەسـتێ ، وە لە خـوای خۆی ڕاببینـێ ، وە گومـانی بـاشـی هـەبـێ بـە پەروەردگـاری ، بەڵکـو دەبـێ یەقیـنـی چاکی پێی هـەبێ ، کە بـە تـەئکید خـوای بەخشـەر بـەندەی خۆی زایە ناکات .

خـوا لـەو کـەسانـەمان بگـێڕێ کـە هـەمیشـە سـەرپەرشـتییمان دەکـات ، وە لـەو کـەسانـەشـمان بگێڕێ کە بـە دڵ خۆمان تـەسـلیمی پەروەردگـار بکـەین ، وە بـە دڵ فەڕاحیـیو بـە دڵخۆشییشـەوە ئـەو شـتـانـەی کە بـەسـەرمان دێـن ، لـەو ڕووەوە کـە لە لایەن خـواوە دێـن ، وەریـان بگرین ، دیـارە ئینسانی ئیمـانداریش دەبـێ هـەمیشـە هـەوڵبـدات لای قـەدەرە چاکـەکان بگـرێ ، وە خـۆی لە قـەدەری خـراپ بپارێزێ .

**مەســــەلەی دووەم** : کـــــە دەفــــەرموێ : ﴿ يُجَـٰدِلُونَكَ فِي ٱلْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَـاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴾ ، مشتومڕیـان لەگـەڵ تـۆدا دەکـرد ، لـە شـتێکدا کە هـەقـە ، دوای ئـەوەی ئـەو هەقـە ڕوون بۆتـەوە ، وەك ئـەوەی کە بـەرەو مەرگ ببـرێن ، وە تـەماشـای مـەرگ بکـەنو تێـوەی ڕابمێـنن ، ئـاوا پێیـان نـاخۆش بوو ، کـە بـەرەو بـەرەنگاربـوونـەوەی سـوپای قـورەیش بـە سـەرکردایەتیی ئـەبـو جەهـل ، دەچوون .

وشـەی : (جِـدال) دیـارە لە قورئـاندا بـە زۆریـی لـەو حاڵەتانـەدا باسکـراوە کـە خـوا پێـی ناخۆشـن ، چونکـە (جِـدال) بریتیـە لەوەی تۆ هـەوڵبـدەی بـەرانبـەرکـەت بـێ دەنگـو بـێ قسـەی بکـەی ، وە مەبـەسـت تێیـدا ئـەوە نیە کـە هـەق بدۆزرێتـەوە ، بۆیـە خـوای زانـاو کـارزان وتووێـژو گفتوگـۆو (حِوار)ی بـۆ ئێمـە پەسـند کـردوە ، بـەڵام ڕێگـریی کردوە لە شـەڕەقسـە (جِـدال) ، وە لـە کاتێکـدا کـە ناچاربیـن هـەر (جِدال)[1] بکـەین ، پێی فەرموویـن : ﴿ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴿١٢٥﴾ ﴾النحـل، واتـە : وە بەباشترین شێوازە باشـتـرە ، شـەڕەقسـەیان لەگـەڵدا بکـە .

یانـی : ئـەگـەر کـەسێکت بـە مل داهـات بـۆ شـەڕە قسـە ، ئـەوە تـۆ ناچـار دەبـی شــەڕە قسـەی لەگــەڵ دا بکـەی ، بـەڵام دەبـێ هـەوڵـبدەی ، بـە بـاشـتـرین شـێوە شـەڕە قسـەی لەگـەڵدا بکـەی .

---

١) من (جِـدال)م بە (شـەڕە قسـە) مانا کردوە ، چونکـە شـارەزایانی زمـان ئـاوا پێناسـەیان کـردوە : (المجادلـة فـي علـم المناظـرة هـي : المناظـرة لا لإظهـار الصـواب ، بـل لإلـزام الخَصْـم) المعجم الوسيط ، ص ١١١.

پێشتر باسمان کرد ، کە خوا دەفەرموێ : ﴿ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ ﴾ ، وا پێدەچێ لێرەدا مەبەست لە (حق) چوونە نێو ئەو جەنگە بێ ، کە جەنگی بەدرە ، چونکە سوپایەك هاتوە ، یەخەی پێگرتووی ، وە تەحەددات دەکات ، لەگەڵ ئەو هەموو ستەمدیدەییو بەشخوراوییە یەی کە هاتۆتە سەریشیان لە مەککە ، ئێستاش سوپایەك هاتوە شەڕیان پێ دەفرۆشێ ، ئەوە هەقێکە دەبێ ملی بۆ بدەیو ، نابێ موناقەشەی دەربارە بکەی ، موناقەشەو وتووێژ لە شتێکدا دەکرێ ، کە بواری قسەی تێدا هەبێ ، بەڵام کە شەڕ بەری دەرگات پێ دەگرێ ، ناکرێ بڵێی : ئەرێ بیکەم ، یان نەیکەم ! چونکە کە شەڕ بەری دەرگای پێگرتی ، واجب دەبێ کە بیکەی ، ئەوانیش خوا لێیان ڕازی بێ ، وا بوون .

کە دەفەرموێ : ﴿ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ﴾ ، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە خوای دادگەر خاتری کەسی نەگرتوە ، وە قورئان هەقی ڕەهای تێدایە ، خوا وەك مەدحی هاوەڵان (أصحاب)ی کردوە ، خوا لێیان ڕازی بێ ، لە دوای پێغەمبەران ، مەدحی هیچ کەسێکی ئاوا نەکردوە ! بۆ وێنە : دەربارەیان فەرموویەتی : ﴿ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٢٢ ﴾المجادلة ، واتە : خوا لەوان ڕازییەو ، ئەوانیش لە خوا ڕازیین ، وە فەرموویەتی : ﴿ لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ١٨ ﴾الفتح ، واتە : بە دڵنیایی خوا لە بڕواداران ڕازی بوو ، کاتێك پەیمانیان لەگەڵ بەستی لەژێر درەختەکەدا ، (خوا) زانی چی لە دڵیان دا هەیە ، بۆیە ئارامییو هێمنیی ناردە سەریان ، وە سەرکەوتنێکی نیزیکیشی کردە پاداشتیان .

وەك گوتم خوای پەروەردگار زۆر مەدحی هاوەڵانی کردوە، خـوا لـە هـەموویـان ڕازی بـێ، بـەڵام لـە شوێنێکـدا کـە خاڵێـکی بێهێـزیـان بـووبـێ، هـەڵـەو کـەمو کوڕییەکان بـووبـێ، زۆر بـە ڕوونیی خستویەتـە بەرچاو، بۆ ئـەوەی هـەم خۆیـان، وە هـەم جیلـەکانی دوایی مسوڵمانانیش کـە بەدوای واندا دێن، پەندی لێوەربگـرن، چونکە بێگومان تـەنیا پێغـەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) لـە هـەڵـەو کـەمو کوڕیی پارێـزراون.

**مەسـەلـەی سـێیـەم**: کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٧ لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ۝٨ ﴾، دیـارە خـوای بـاڵادەسـت بـەڵـێنی بـە پێغـەمبـەر ﷺ دابـوو، کـە یەکـێك لـەو دوو کۆمەڵـەیە دەبنـە دەسـتکەوتی ئێـوە، وەك لـەم فەرموودەیـەدا دیـارە، کـە پێغـەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ﴿سِيرُوا عَلَى بَرَكَةِ اللَّهِ وَأَبْشِرُوا، فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى قَدْ وَعَدَنِي إِحْدَى الطَائِفَتَيْنِ، وَاللَّهِ لَكَأَنِّي الآنَ أَنْظُرُ إِلَى مَصارِعِ الْقَوْمِ﴾(١).

واتـە: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: بـڕۆن بـەرەو پـێش لەسـەر بـەرەکـەتی خـوا، وە مـوژدە بـدەنو دڵخـۆش بـن، چونکـە خـوای بـەرز بـەڵـێنی پێـداوم، کـە یەکـێك لـە دوو کـۆمەڵـەکـان بکاتـە دەستکـەوتی ئێـوە، سـوێند بـە خـوا، ئێسـتا وەك ئـەوەی تـەماشای ئـەو شـوێنانـە بکـەم کـە دوژمنـەکـان لێـی دەکـوژرێـن، {لـە کـاتێکدا کـە ڕووبـەڕوومان دەبنـەوە}، (دیـارە زۆر ئـاسانـە بـۆ خـوای پەنهانـزان پێش ئـەوەی جەنگەکـەش ڕووبـدات، پێشـانی پێغـەمبـەری خـۆی دابـێ، کـە فـلان کـەس لـەوێ دەکوژرێ، فـلان کەس لەوێ دەکـوژرێ، فـلان لـەوێ دەکـوژرێ، ئنجـا کـە واشـی فەرمـووە، بێگومان خـوا شـتێکی خسـتۆتـە پێش چاو).

---

١) جامع البيان للطبري، ج ١٣، ص٣٩٩، والمصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ٥٢٦.

كـە دەفـەرموێ : ﴿وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ﴾ ، وە پێتـان خـۆش بـوو كـە ئـەوەی دڕكـی پێوەنیـە بـۆ ئێـوە بـێ (كـە كاروانـەكـەیە) ، لەبـەرچی ؟ وەك پێشـتریش گوتمان :

یەكـەم : لەبـەرئـەوەی خۆیـان ئـامادە نـەكردبوو ، چ لـە ڕووی ژمارەوە ، چ لە ڕووی چەك و كەلوپـەلو پێداویستییەكـانی جـەنگو جیهـادەوە ، چونكـە ئـەوان لـە سەرەتاوە كە هاتن پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێی فەرموون : كـاروانێك لـە شـامەوە دەگەڕێتـەوە بـە فەرماندەیەتیی ئـەبو سوفیـان چـی ، دەڵـێن ، ئـەگەر بچین ڕێی پـێ بگـرین ، بـەڵكـو خـوا بیكاتـە دەستكـەوتتان ؟ ئـەوان بـۆ كـاروان گـرتن دەرچـوو بـوون ، نـەك ، بۆ شـەڕكردن لەگەڵ سوپایەكی هـەزار كەسیـی .

دووەم : پاشان دیارە سروشتی مرۆڤیش وایە ، كە حـەز بـە شـتی ئـاسـان دەكـات ، حـەز بـە سـەلامەتیی دەكـات ، هـەموو مرۆڤەكـان وان ، ئنجـا هـاوەڵەكـانی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بـن ، یـاخود هـەر كـەسێكی دیكـە بـێ، بـەڵكـو دایكـمان عائیشـە خـوا لـێی ڕازی بـێ ، گوتوویـەتی : ﴿مَا خُيِّرَ رَسولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ أمْرَيْنِ قَطُّ ، إلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا ، مَا لَمْ يَكُنْ إثْمَاً﴾ {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ : البُخَارِيُّ بِرقم : (٣٥٦٠) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٧٧)}.

واتـە : پێغـەمبـەری خـوا ﷺ هەرگیز سەرپشك نـەكراوە لە نێوان دوو شـتاندا ، مەگەر كـامـەیان ئـاسـانـە ، ئـەوەی هـەڵبژاردوە ، بـە مەرجێك گوناح نـەبوو بێ .

هەمیشـە لای ئـاسـانیی گرتـوە ، ئـەوەش دیـارە بنچینـەیەكی شـەرعییە ، چونكـە خـوا دەفـەرموێ : ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ١٨٥﴾ البقـرة ، واتـە : خـوا ئـاسـانیی بۆتـان دەوێ ، زەحمەتی بۆتان ناوێ .

هـەروەها دەفەرموێ : ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ٦﴾ المـائـدة ، واتـە : خـوا نایەوێ تووشی سـەغڵەتییـتان بكـات .

كەواتـە : شـتێكی ئـاسـاییە كـە هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ ، حـەز بـە گرتنـی كـاروانـەكە بكـەن .

بەلاَم دیارە ئەوانەی بەندەکان حەزی پێ دەکەن و دەیانەوێ، جیایە لەوەی خوا بۆ بەندەکانی پێی چاکە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، وە ئێوە حەزتان دەکرد کە هی بێ درك بۆ ئێوە بێ، بەلاَم خوا ﷻ دەیویست هەق بچەسپێنێ، بە وشەکانی (فەرمانەکانی)، وە دەیویست دوای کافران ببڕێ.

ئنجا بە تەئکید ئەوەی خوا دەیەوێ بۆ بەندەو، ئەوەی بەندە دەیەوێ بۆ خۆی، زۆر لێك دوورن: ئەگەر کاروانەکە بووایە، ئەوە کاروانەکەیان دەگرت و دەستکەوتێکی باشیان دەست دەکەوت و، ئەو سێ چل نەفەرەش، یان ڕایان دەکرد، یان دەیانکوشتن، یاخود بە دیل دەگیران و تەسلیم دەبوون، بەلاَم ئەوە لە کوێ، وە ئەوە لە کوێ کە لووتی هێزی کوفر کە لە قوڕیشدا بەرجەستە بوو بوو، بشکێ، وە حەفتایان لێ بکوژرێ و، حەفتایان لێ بە دیل بگیرێ، کە ڕەنگە ئەوەش کە بە قەرەبوو وەریان گرت و، ئەوەی کە بە غەنیمەت لە سوپایەکەیان گرت، زۆر زیاتریش بوو بێ، لە ماڵ و سامانی کاروانەکە، ئنجا سەربارى ئەوەش، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، ئەوانە کۆسپێکی زۆر گەورە بوون لەبەردەم بانگەوازی ئیسلامیی دا، چونکە هەموو هۆزەکانی عەرەب تەماشای قوڕەیشیان دەکرد، دەیانگوت: ئەو موحەممەدە لە خۆیانە، ئەوان چاکتری دەناسن، ئەگەر بڕوایان پێهێنا، ئەوە باشە، وە ئەگەر بڕوایان پێنەهێنا، ئەوە دیارە ئەوان باشتری دەناسن، بەلاَم لە دوای جەنگی بەدرەوە، مەودا لە بەردەم ئیسلامدا زۆر فراوان بوو، کەواتە: ئەوەی خوا ﷻ دەیکات بۆ بەندە، زۆر چاکترە لەوەی کە بەندە بۆ خۆی دەیەوێ بیکات.

دوایی کە دەفەرموێ: ﴿لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾، ئەمە یاسای خوایە، واتە: ئامانجی ئەوەش کە خوای کاربەجێ ئەو ئامادە

سازییەی کردو ، ئەوەی هێنایە پێش ، ئەوە بوو کە هەق بچەسپێنێ‌و باتڵ بپووکێنێتەوە ، هەرچەندە تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێ .

وە مەبەست لە چەسپاندنی هەق ، یانی : لەسەر ئەرزی واقیعو ، لە مەیداندا بەرجەستە ببێ : کە ئەو ئیسلامەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی ، هەقە ، چونکە : ژمارەیەکی کەمی مسوڵمانان ، کە بۆ گرتنی کاروان چوو بوون ، دوژمنەکەیان سێ بەرانبەری ئەوان بوون ، مسوڵمانان ئەسپێك یان دوو ئەسپو حەفتا حوشتریان پێیە ، بەڵام کافرەکان ئەو هەموو ئەسپو حوشترانەیان پێ‌و ، هەموو ڕۆژێك نۆ ، یان دە حوشتریان سەردەبڕین ، ئەو هەموو چەك‌و کەلوپەلەیان پێیە ، لە بەرانبەر سوپایەکی ڕووتەڵی هاوەڵاندا خوا لێیان ڕازی بێ ، تێکبشکێن ! هەر دیارە کە هاوەڵان لەسەر هەقن‌و خوای پەروەردگار یارمەتییان دەدات ، بەتایبەتیش هەندێ ڕیوایەت هەن ، کە زۆر لە کافرەکان کە دوایی مسوڵمان بوون ، گوتوویانە : ئێمە کەسانێکی بەرگ سپییمان دەبینی ، ئەوانە ئێمەیان زۆر ترساند ، کە من قەناعەتم وایە : فریشتەکان بۆ بەهێزکردنی هاوەڵان ، وەك لایەنی مەعنەویی بەشدار بوون ، وەك ئایەتەکەش ئاماژەی پێ دەدات ، بۆ ترس خستنە دڵی دوژمنان ، ئنجا ئەوەش هەمووی ، وەك دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ﴿٤٢﴾﴾ الأنفال .

واتە : بۆ ئەوەی هەرکەس کە دەفەوتێ ، لەبەر ڕۆشنیایی دا بفەوتێ‌و بیانووبڕاو کرابێ ، وە هەرکەس کە دەژی‌و ڕێ دەردەکاو سەرفراز دەبێ ، لەبەر ڕۆشنیایی دا بژی‌و سەرفراز بێ .

چونکە لە ئەنجامی ئەو جەنگەدا : هەم قورەیشییەکان‌و هەم غەیری وانیش کەوتنە پرسیارکردن لە خۆیان : باشە ، ئەوە چی بوو ؟ ئەوان ئەگەر لەسەر هەق نەبن‌و ، خوایان لەگەڵدا نەبێ ، چۆن بەو ژمارە کەمە ، بەسەر ئەو ژمارە زۆرەدا ، چ لە ڕووی چۆنیەتیی ، وە چ لە ڕووی چەندێتییەوە ، زاڵ دەبوون ؟!

شایانی باسیشە کە هەر کام لە وشەی (حَقّ) و ، وشەی (باطِل) هەر جەرەسی بێژەکەیان ئاماژەش دەکات بۆ ماناکەیان ، وشەی (حَقّ) لە دوو پیت پێکهاتوە ،

کە پیتی (ح) و (ق)ن و ، پیتی گەروو (حلق) یان پێدەگوترێ ، وە بێژەی وشەی (حَقّ) دەلالەت لەسەر شتی چەسپاو دەکات ، چونکە بەقووڵایی قورگ دەردەبڕدرێ ، بەلأم جەرەسی وشەی (باطِل) دەلالەت لەسەر شتێکی بۆش دەکات ، چونکە ئینسان بە بۆشایی دەمی ئەم وشەیە دەردەبڕێ ، چونکە (باطِل) لە سێ پیت پێکهاتوە ، کە پەیوەندییان بە بۆشایی زارەوە هەیە ، واتە : (باطِل) شتێکی بۆشە ، وە (حَقّ) شتێکی چەسپاوە .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ﴾ ، یاد بکەنەوە ! کاتێك لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوەو هاوارتان تێدەبەست ، ئەویش وەلأمی دانەوە .

وشەی : (إستغاثة)[1]، واتە : پاڕانەوەو هاوار تێبەستن ، کە زۆر بە سەغڵەتییو تەنگاویی هاوار لە کەسێك بکەی .

دیارە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە مسولمانانیش کاتێك هاواریان لە خوا بەستوەو لێی پاڕاونەوە ، کە هەموو هۆکارەکانیان ئامادە کردوون ، بۆیەش خوای پەروەردگار باشی وەلأم داونەوە ، تۆ دەبێ دوای ئەوەی هەرچی کە بە خۆت دەکرێ ، بیکەی ، ئنجا داوا لە خوا بکەی ، یارمەتیت بدات ، نەك بۆ خۆت هەڵخزێیو پاڵدەیەوە ، ئنجا بڵێی : خوایە ! فلان شتەو فلان شتەم بۆ بکە ، وەك حاڵی ئێستای ئێمەی مسولمان ! نەخێر ، تۆ ئەوەی بۆت دەکرێ بیکە ، ئنجا ئەوەی کە بە خۆت نەکرا ، ئەو بۆشاییانەی کە ماونو بە هۆکارەکان بۆت پڕ ناکرێنەوە ، هەر ئەوەندەت دەست دەڕوات ، بڵێ : خوایە ! ئەو بۆشاییانەم بۆ پڕ بکەوە ، بە تەئکید ئەو کاتە زۆر نیزیکە خوا وەلأمی پاڕانەوەی ئەو جۆرە کەسانە بداتەوە .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە دەفەرموێ : ﴿أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ ، بێگومان من ئیمدادی ئێوە دەکەم ، پشتی ئێوە دەگرم ، هاوکاریی ئێوە دەکەم ، بە هەزار لە فریشتانی بە دوای خۆخەر .

---

١) الغوث : الإعانة و النُّصرة ، والإستغاثة : طلب الغَوث . المعجم الوسيط : ص ٦٦٥.

(مُرْدِف) کەسێکە سواری شتێك ببێو ، کەسێکی دیکەی لە دوای خۆی سوار کردبێ ، یاخود لە پێشەوە بڕواو ، کەسێکی دیکەش بە دوای خۆیدا بێنێ ، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش : ئەویش ئەوەیە کە خوای زاناو کاربەجێ لە سووڕەتی (آل عمران)دا باسی ئەم جەنگی (بەدر)ە دەکات ، بەلاّم ژمارەی فریشتەکان بە سێ هەزار (٣٠٠٠)و پێنج هەزار (٥٠٠٠) دێنێ !

یەکێك ڕەنگە بڵێ : خوا ﷻ لە سووڕەتی ئەنفال دا دەفەرموێ : یەك هەزار ، کەچی لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ : سێ هەزار ، وە پێنج هەزار ، ئەمە یانی چی ؟ وەك دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ .

واتە : وە بێگومان لە حاڵێکدا کە کەمدەست و بێ دەستەلاّت بوون ، خوا لە (جەنگی) بەدردا سەری خستن ، دەجا پارێز لە خوا بکەن ، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن ﴿١٢٣﴾ یاد بکەوە کاتێك کە بە بڕوادارانت دەگوت : ئایا بۆ ئێوە بەس نیە ، کە پەروەردگارتان بە سێ هەزار لە فریشتانی دابەزێنراو ، بەهێزتان بکات ؟ ﴿١٢٤﴾ با ، ئەگەر ئێوە خۆڕابگرنو پارێز بکەن ، ئەوانیش بەم تووڕەییو هەڵچوونەیانەوە ، بە پەلە بێنە سەرتان ، ئەوە پەروەردگارتان بە پێنج هەزار لە فریشتانی خۆنیشانەدارکەر ، هاوکارییتان دەکات ﴿١٢٥﴾ .

وەلاّمەکەی ئەوەیە : کە خوا ﷻ لێرەدا لە سووڕەتی ئەنفال دا دەفەرموێ : (مُرْدِفِين) کەواتە : دیارە ئەو هەزارە ، چەندان فریشتەی دیکەیان بە دوای خۆیان داون ، یانی : خوای بالاّدەست بە سێ وەجبە ناردوونی : وەجبەیەکیان هەزار ، دوایی دوو هەزاری دیو ، بوونە سێ هەزار ، دوایی دوو هەزاری دیکە ئەوجار بوونە : پێنج هەزار ، هەڵبەتە هێزێکیش کە ئیمدادی هێزێك بکات ،

وا باشە هەمووی پێکەوە نەچێ ، وا باشە وەجبە وەجبە بچن ، بۆ ئەوەی دوژمن زیاتر ترسی لێ بنیشێ ، وە ئەوە بۆ ئەوانەش کە هاوکارییان دەکرێ ، زیاتر جێی دڵخۆشییە ، ئەوانەی ئەزموونی جەنگو جەبهەیان هەیە ، ئەو ڕاستییە سەربازییە باش دەزانن .

وە کە خوێنراویشەتەوە : (مُرْدَفِين) واتە : هی دیکەیان بە دوا خراون ، فریشتەکان سەرەتا ژمارەیان هەزار (١٠٠٠) بووە ، بەڵام دواتر هی دیکەیان بە دوا خراون ، یاخود ئەوانە بە دوای هی دیکە خراون ، کەواتە : ژمارەکانی هەزارو ، سێ هەزارو ، پێنج هەزار هەموویان پشتگیری یەکدی دەکەن ، وەك لە بەرگی دووەمی ئەم تەفسیرەدا بە درێژیی باسمان کردوە ، لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (آل عمران) دا .

**مەسەلەی شەشەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ .

یانی : خوا ناردنی فریشتەکانو بەهێزکردنی ئێوەی بە هۆی فریشتەکانەوە ، تەنیا بە مایەی دڵخۆشیی بۆ ئێوە گێڕا ، بۆ ئەوەی دڵتان پێی ئارام بگرێ ، ئەگەرنا یارمەتییو سەرخستن هەر لە خواوەیە ، وە بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە .

واتە : بەشداریی فریشتەکان تەنیا لە ڕووی مەعنەوییەوە بووە ، کە ئەویش بە تەئکید زۆر گرنگەو ، ئینسان ئەگەر لە دەروونەوەو لە ڕووی مەعنەوییەوە بەهێز بێ ، لە ڕووی ماددییو ڕواڵەتییەوە بەهێز دەبێ ، هەمیشە خەڵك کە تێکدەشکێ ، سەرەتا لە ڕووی دەروونەوە تێکدەشکێ ، بۆیەش وا دەڵێین : چونکە هەندێ دەق هەن کە گوایە فریشتەکانیش بە کردەبی بەشداریی جەنگیان کردوە ، بەڵام ئەوە ڕاست نیە ، چونکە :

یەکەم : کوژراوەکان لە کافرەکان لە جەنگی بەدردا کە حەفتا کەس بوون ، هەموویان بکوژەکانیان دیارن ، ئەدی فریشتە کێیان کوشتوە ؟

دووەم: ئەگەر فریشتەکان دەست بەکاربن ، نە هەزار فریشتەو ، نە پێنج هەزار فریشتەی ناوێ ، بەڵکو یەك فریشتە بەسە ، بۆ ئەوەی ناوچەیەك بە تەواویی کاول بکات ، کەواتە : کە خوای پەروەردگار باسی ناردنی فریشتەو ژمارەیانیشی کردوە ، بۆ زیاتر دڵخۆشییو دڵ بەهێزیی هاوەڵان بووە ، کە لەبەرئەوەی ژمارەتان سێ سەدو سێزدە یان نۆزدە کەسە ، دەربەست مەبن ، ئەوە هەزار فریشتە ، ئەوە سێ هەزار ، ئەوە پێنج هەزار ، ئەوانەش پشتگیریی ئێوە دەکەن .

سێیەم : هەر دەقێکی سوننەتیش لەگەڵ قورئان دا تێك بگیرێ ، ئەگەر بگونجێ بە جۆرێك ماناو تەئویل بکرێ کە لەگەڵ قورئان دا بسازێ ، ئەوە باشە ، ئەگەر نا ناچارین وەلای بنێین و بڵێین : ئەوە قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ نیە ، زانایانی لێکۆڵەرەوە (مُحَقِق) هەر وایان کردوە .

یەکێك لەو دەقانەش ئەوەیە کە (مسلم : ١٣٨٤) لە (إبن عباس)ەوە هێناویەتی کە ئەوەیە : ﴿ بينما رجل من المسلمين يومئذٍ يَشْتَدُّ في أثرِ رَجُلٍ من المشركين أَمامَهُ إذْ سَمِعَ بالسوط فوقه ، و صوت الفارس يقول : أقْدِمْ حَيْزوم ، فنظر الى المشرك أمامَهُ ، فَخَرَّ مُسْتَلْقياً ...﴾[1].

واتە : لە کاتێك دا مسوڵمانێك لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی بەدر) بە خێرایی بە دوای پیاوێك لە هاوبەشدانەرەکان دا دەڕۆیشت ، کە لە پێشیەوە بوو ، گوێی لە دەنگی قامچییەك بوو لە سەروویەوە ، وە گوێی لە دەنگی سوارێك بوو دەیگوت : حەیزووم هێرش بکە !

ئیدی کابرای هاوبەشدانەری لە پێش خۆیەوە بینی ، لەسەر گازی پشتە .

ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ ، واتە : پشت بە جگە لە خوا مەبەستن ، تەنانەت پشت بە فریشتەکانیش مەبەستن ، چونکە سەرکەوتن بە فریشتانیش نیە ، بەڵکو تەنیا بە خوای زاڵو توانایە .

---

١) بڕوانە : زاد المسير في علم التفسير ، لإبن الجوزي : ص ٢٢١ ، ٢٢٢، هەروەها بڕوانە : السيرة النبوّية لإبن هشام ، ج ٢ ، ص ٣٤٣ ، ٣٤٤.

**مەسـەلەی حەوتـەم** : کـە دەفـەرمـوێ : ﴿ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ ﴾ ، یاد بکەنــەوە ئــەو کاتــە کــە وەك هــێمن کــەرەوەیەك لــە لایــەن خۆیــەوە ، سووکــە خەوێکی بەسـەردا هێنـان ، لەوبـارەوە ئـەم شوێنـەوارە هـەیە : ﴿عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه ، قَالَ : مَا كَانَ فِينَا فَارِسٌ يَوْمَ بَدْرٍ غَيْرُ الْمِقْدَادِ ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا فِينَا إِلاَّ نَائِمٌ ، إِلاَّ رَسُولَ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَحْتَ شَجَرَةٍ يُصَلِّي وَيَبْكِي حَتَّى أَصْبَحَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (١٠٢٣) ، قَالَ شعيب الأرنؤوط : إسنادُهُ صَحِيح رجاله ثقات رجال الشيخين غير حارثة بن مضرب فمن رجال أَصْحَاب السنن ، وَأَخْرَجَهُ ابْنُ حِبانَ ، برقم : (٢٢٥٧) ، وَابْنُ خُزَيْمَة ، برقم : (٨٩٩) ، وَأَبو يَعْلَى برقم : (٢٨٠)} .

واتـە : عەلـی کـوڕی ئـەبـو طـالێـب خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ : ئێمـە لـە ڕۆژی بـەدردا ، جگـە لە میقـداد هیچ سـوار ئـەسـپی دیکـەمان لەگەڵ نـەبـوون ، وە خۆمـانم بینی هیچ : کاممان نـەبـوو ، کە خەوی لـێ نـەکـەوێ ، جگـە لە پێغـەمبــەری خــوا ﷺ کە لـەژێـر درەختێکـدا ، هەتا بـەیـانی نوێـژی دەکــردو دەگریـا .

دیارە مەبـەسـتـی لـەو خەوە خەوێکـی درێـژخـایـەن نـەبـووە ، خــوا فەرموویـەتی : ﴿ إِذۡ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ ﴾ ، وەك پێشـتــر گوتمـان (نُعَاس)[1] خـەوێکی کـەمـە ، کە بـە کوردیی وەنـەوز یـان خـەوچکە ، یـان سـەرخـەو شکاندنی ، پـێ دەڵـێن .

هەڵبـەتـە حیکمـەتی ئـەو سـووکـە خـەوەش لـە جەنگی بـەدردا ، وا پێـدەچـێ ئـەو خـــەوە لـە ڕۆژی دا بـووبـێ ، چونکـە لـە شوێنـەواری دیکـەدا هـاتوە دەڵـێ : یەکێـك لـە ئێمـە کـە دانیشـتبـوو ، یـان بـە پێـوە وەستا بـوو ، شـمشـێرەکـەی لـە دەست دەکەوتـە خـوارو هـەڵیدەگرتـەوە .

ئنجـا ئـــەو وەنـــەوزە وەك خـــوای پەروەردگـــار دەفـەرموێ : ﴿ أَمَنَةٗ مِّنۡهُ ﴾ ، دڵنیـاکـەرەوەو هێمنکـەرەوەیەك لـە خۆیــەوە ، واتـە : ئـەو خـــەوە بـوو بەهـۆی ئـەوەی هـەم لـە ڕووی جەستـەییەوە شـەکـەتیی و ماندوێتیـان دەرچـێ ، هـەم لـە ڕووی ڕووحییەوە ، مەعنەوییـاتیـان بـەرز بێتـەوە ، چونکـە مرۆڤ کـە لـە گەرمەی

---

١) المعجم الوسيط : ص ٩٣٤.

جەنگدا خەوی لێ دەکەوێ ، مانای وایە جۆرێك لە هەست کردن بە ئارامیی‌و پشت بە خوا بەستن‌و ، متمانە بە خوا بوون هەیە ، لە دڵ‌و دەروونیدا ، ئەگەرنا مرۆڤ لەو کاتەدا خەوی لێناکەوێ ، واتە : هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ ، لەو کاتەدا لە جەوێکی ڕووحیی‌و ئیمانیی بەهێزدا بوو ون ، بۆیە گونجاوە ئەو خەوەیان بەسەردا هاتبێ .

**مەسەلەی هەشتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴾، واتە : یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە خوا ئاوی لە ئاسمانەوە ، لە سەرێوە بەسەردا باراندن .

ئنجا خوای پەروەردگار چوار ئامانج بەو باران باراندنە دێنێتە دی :

١) ﴿ لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ ﴾ ، کە دەگونجێ مەبەست لە پاکبوونەوە ، پاکبوونەوەی جەستەیی بێ ، واتە : تاکو جەستەتان پاك بکاتەوە ، لە تەپو تۆزو چڵك‌و ئارەقە ، وە دەگونجێ مەبەست پێی پاککردنەوەی مەعنەویی بێ ، کە لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتوە ، هەندێکیان تووشی لەش پیسیی‌و (جنابة) بوو ون ، بۆ ئەوەی لە لەش پیسیی پاك ببنەوە ، وە دەشگونجێ هەردووکیشیان مەبەست بن .

٢) ﴿ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ ﴾، وە بۆئەوەی پیسیی شەیتانتان لێ لابەرێ ، (رجز) بە مانای پیسیی دێ‌و ، بە مانای گوناهیش دێ ، وە بە مانای وەسوەسەو خوتخوتەو خەیاڵی خراپیش دێ[1] ، هەندێك لە توێژەرەوان‌و مێژوونووسان باسیان کردوە کە لەبەرئەوەی شوێنە جوگرافییەکەی هاوەڵان باش نەبووە ، وەك دوایی باسی دەکەین ، شوێنێك بووە کە پێیان تێیدا باش جموجۆڵی بۆ نەکراوە ، بەڵام لە ئەنجامی باران بارینەکەدا ، زەوییەکە پتەوو پندر بووە ، وا بووە کە پێیان تێی نەچەقێ‌و جووڵەو هەڵسوکەوتی سەربازییان باشتر بۆ بکرێ .

---

١) المعجم الوسيط : ص ٣٣٠ ، کە گوتوویەتی : هەرکام لە : (رِجْز) و (رِجْس) بە مانای پیسیی‌و گوناهو کردەوەی خراپ‌و سزاو خوتخوتەی شەیتان ، دێن .

ئنجا هەندێك لە هاوەڵان خوتخوتەو گومانی ئەوەیان بۆ هاتوە لە لایەن شەیتانەوە: کە ئەگەر ئێوە خواتان لەگەڵە، ئەگەر ئێوە خوا سەرتان دەخات، ئەدی بۆچی شوێنەکەتان وا خراپە، تەماشا بکەن چۆن لە لم دەچەقن!! ئنجا کە بارانەکە باریوەو زەوییەکە توند بووە، پێیان تێنەچەقیوەو، ئەو وەسوەسەو گومانەی شەیتانیان لێ دوور کەوتۆتەوە.

٣) ﴿وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ﴾، وە بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو بارانەوە، دڵتان ببەستێ، دڵتان گرێ بدات، بەو واتایە کە جاری وا هەیە هۆکارێکی ماددیی دەبێتە هۆی بەهێزکردنی لایەنی مەعنەویی، ئەوانیش بەو بارانە کە باریوە: خۆیان شۆردوە، وە ئەو خوتخوتەو خەیاڵە خراپەی کە گوایە: خوا لەگەڵیان نیە، ئەوەش لاچووە، وە سەرەنجام بارانەکە بووەتە هۆی بەهێزبوونی دڵیان، مەبەست پێی ئەوەیە کە دەفەرموێ: بۆ ئەوەی دڵتان بەهێز بکاو توندو تۆڵ بکات.

٤) ﴿وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ﴾، وە بۆ ئەوەی پێیەکانیشتان بچەسپێنێ، جا لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: (كانَ الأَرْض دَهاساً[1] تَسيخُ فِيها الأَقْدَامُ)، ئەو زەوییە بە شێوەیەك بوو، پێش ئەوەی باران لێی بداتو تەڕبێ، پێیەکان پێیدا دەچوونە خوار، بەڵام دوای ئەوەی باران باری، بە شێوەیەك پتەوو پندر بوو، کە ئینسان پێی تێدا نەچەقێ.

کەواتە: ئەو بارانەی کە خوا باراندوویەتی، ئەو چوار ئامانجەی هێناونەوە دی بۆ جەنگاوەرانی مسوڵمان، کە هەر کامێکیان بە تەئکید کاریگەریی بووە، لە سەرکەوتنیان لەو جەنگەدا.

**مەسەلەی نۆیەمو کۆتایی**: کە خوای کاربەجێ باسی حیکمەتو فەلسەفەو ئامانجی ئەوە دەکات، کە بۆچی خوای زاڵی توانا ئەم جەنگەی هێنایە پێش،

---

١) الدَّهسُ: المكان اللَّيِّن ليس بِرَمْلٍ ولا تُرابٍ ولا طين. المعجم الوسيط: ص٣. کە مەبەست پێی شوێنێکە مرۆڤ پێی تێدا ڕۆبچێ.

دەفـــەرموێ : ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٤﴾ ﴾ ، واتە : ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو ، کە ئەوانە سەرپێچییان لە خواو پێغەمبەری خوا کرد ، وە دژایەتیی‌و بەربەرەکانێی خواو پێغەمبەر ﷺیان کرد ، ئەوەش سوننەت‌و یاسای خوایە کە هەر کەس بەبەرەکانێی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات ، بێگومان خوا تۆڵەو سزای توندە .

دوایی ڕووی دواندن دەکاتە کافرەکان‌و پێیان دەفەرموێ : ﴿ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾، ئا ئەم سزایەتان ، ئەم شکستەتان بیچێژن ، وە دڵنیاش بن ! ئەی کافرینە ! وێڕای شکست‌و زەلیلیی دنیا ، کە بەسەرتاندا هاتوە ، لە دوارۆژیشدا سزای ئاگری دۆزەخ چاوەڕێتانە .

لێرەدا کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ ، ئنجا دەشزانین کە ئەو سزاییەی خوا داونی ، بریتی بووە لەو شکستەی کە لە بەرانبەر سوپای ئیسلامدا پێیان براوە ، کەواتە : دەبێ بڕواداران قامچی قەدەری خوابن بۆ سزادانی کافرانی ناحەزو دوژمن بە ئیسلام ، کە کافران ستەمکارن .

واتە : پێویستە مسوڵمانان هەڵبدەن قامچی قەدەری خوابن ، بۆ سزادانی ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن ، وە ڕێگریی دەکەن لەوەی کە بەندەکان بەندایەتیی ئازادانە بۆ خوای پەروەردگاری خۆیان بکەن ، وە شەڕ بە مسوڵمانان دەفرۆشن‌و ، چاویان لەوەیە کە دەستدرێژیی بکەنە سەر ماڵ‌و سامان‌و ژیانیان .

وە کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾، واتە: سزای ئەو کافریی‌و ملهووڕیی دەستدرێژییەی کە دەیکەن، هەر ئەوەندە نیە کە لە دنیا ئەو شکست‌و زەبوونیی‌و مل شۆڕییەتان بە ملدا بێ، بەڵکو سزای دواڕۆژیش چاوەڕێتان دەکات، کە لەڕاستییدا سزای دنیا، لە چاو هی دواڕۆژ، هەر هیچ نیە، وەك خوای دادگەر باس دەکات، کە سزای دواڕۆژ، سزای مەزنی خوای تۆڵەسێنەرە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ السجدة، واتە: وە لە ئازارو سزای خوارتریان پێ دەچێژین، نەك سزاو ئازاری گەورەتر ـ کە لە دواڕۆژدایە ـ بەڵکو بگەڕێنەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی : (١٥ تا ٢٣) دەگرێتە خۆی ، واتە : نۆ (٩) ئایەت ، لەم نۆ ئایەتەدا خوای کاربەجێ ، سەرەتا بۆ جاری یەکەم لەم سوورەتەدا بە : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، مسولمانان دەدوێنێ ، کە وەك پێشتر باسمان کرد : لە کۆی ئەم سوورەتەدا ، شەش (٦) جاران خوا بە : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ ، مسولمانان دەدوێنێ ، جا ئەمە جاری یەکەمیانە ، پێیان دەفەرموێ : کە لە کاتی هێرشی بە کۆمەڵی بێبڕوایان دا ، پشتیان تێنەکەن ، چونکە پشت لە دوژمن کردن ، مەگەر لە حاڵەتی تاکتیکی جەنگ ، یان پەیوەست بوون بە کۆمەڵێکی دیکەی مسولماناندا ، مایەی تووڕەیی خواو چوونە دۆزەخە ، کە دوایی باسی دەکەین پشت لە دوژمن کردو هەڵاتن لە جەنگ ، یەکێکە لە گوناهە گەورەکان .

پاشان بە بڕواداران دەفەرموێ : کە کوژرانی کافرەکان بە دەستیانو ، چەنگە خۆڵ هاویشتنی پێغەمبەر ﷺ کە هۆکارەکەی خوا بووە ، ئەویش چاکەیەکی دیکەی خوا بووە لەگەڵیان ، وە ڕایدەگەیەنێ کە خوا پووچکەرەوەی پیلانی کافرەکانە .

پاشان ڕوو دەکاتە کافرەکانو پێیان دەفەرموێ : ئەگەر پێشتر داوای سەرخستنتان دەکرد ، ئەوە سەرخستنتان بۆ هات ! وە ئەگەر واز بێنن ، باشترە ، بەڵام ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دژایەتییان ، خواش دەگەڕێتەوە بۆ سزادانیان .

ئنجا بۆ جاری دووەم بە نازناوی ئیمان بانگی بڕواداران دەکات ، کە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن ، وە پشتی تێنەکەن ، وە وەك ئەوانە نەکەن کە

گوتیان : بیستمانو نەشیانبیستوە ، واتە : گوتیان : ئەوە فەرمانی خوامان بیستو لێی حاڵی بووین ، کەچی ڕاستیشیان نەکردو نەیانبیست ، واتە : بیستنی قبووڵ کردنو پابەند بوون ، نەك بیستنی بە گوێ .

وە لە کۆتایی دا ڕایدەگەیەنێ : کە کافرەکان کەڕولاڵو نەفامن ، وە خراپترین زیندەوەرن ، وە ئەگەر خوا خێری پێوە بینیبان ، پێی دەبیستاندن ، بەڵام ئەگەر پێشی بیستاندبان ، هەر پشتیان هەڵدەکردو ڕوویان وەردەگێڕا .

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ
(١٥) وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ
بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ (١٦) فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ
وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِىَ ٱلْمُؤْمِنِينَ
مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (١٧) ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ
ٱلْكَـٰفِرِينَ (١٨) إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيْرٌ
لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدْ وَلَن تُغْنِىَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ
ٱلْمُؤْمِنِينَ (١٩) يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْاْ عَنْهُ وَأَنتُمْ
تَسْمَعُونَ (٢٠) وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ (٢١) إِنَّ
شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ (٢٢) وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ
خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعْرِضُونَ (٢٣) ﴾ .

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی ئـەوانـەی بڕواتان هێنـاوە ! هـەر کات بەوانـەی بێبـڕوان گەیشتــن ، لـە کـاتی کشـانیـاندا بـەرەو لاتـان (بۆ جـەنـگ) پاشـتانیـان تێمـەکـەن ⁽١٥⁾ وە هـەر کـەس پاشیـان تێبکات ، مەگەر بـۆ خـۆ سـووڕاندن لـە بـەرژەوەنـدیی جـەنگـدا ، یـان بـە مەبـەستی پەیوەســت بـوون بــە کۆمەڵــێکی دی (ی مسوڵمــانـان) وە ، ئــەوە تــووڕەیی خــوای پێبــڕاوەو جێگاشــی دۆزەخـە ، ئــەویش خراپتــرین سەرەنجــامە ⁽١٦⁾ (هـەرچــەندە بـەڕواڵــەت ئــەی مسوڵمانینــە ! ئێــوە بــوون کافرەکانتــان دەکوشــت ، بــەڵام لــە ڕاستییــدا) ئێــوە نـەتانـدەکوشــتن‌و خــوا کوشـتنی ، وە (ئــەی پێغـەمبـەر ﷺ !) کـە هاویشــتت (ئـەو چـەنگە خۆڵەکە کە هاویشــتت) تـۆ نـەتهاویشـت (بـە شـێوەیەك کـە بگـاتـە هـەموو کـافرەکان) بـەڵکو خـوا هاویشتی ، ئـەوەشـی بۆیە کرد ، تاکـو بـڕواداران لە لایەن خۆیـەوە بـە تاقیکردنـەوەیەکی بـاش تاقـی بکاتــەوە ، بێگومـان خــوا بیسـەری زانایە ⁽١٧⁾ ئەو کـارەتان بەو شێوەیە بوو ، وە بە دڵنیـایی خـوا بێهـێزو پێزکەری پیلانـی بێبـڕوایانــە ⁽١٨⁾ (ئــەی کـافرینــە !) ئەگــەر پێشــتــر داوای ســەرخســتنتــان (لـە خــوا) دەکـرد ، (بۆ هـەر کـام لـەو دوو کۆمەڵـە کـە لەســەر هـەقـە) ئــەوە سـەرخستنتـان بـۆ هــات ، وە ئەگــەر واز بێنــن ، بـاشــتــرە بۆتــان ، وە ئەگــەر بشـگـەڕێنـەوە (بـۆ جـەنگ دژی مسـوڵمانــان) ئێمــەش دەگەڕێینـــەوە (بـــۆ هاوکارییـــان) وە دڵنیـــابن کـــە کۆمەڵەکــەتان هەرچـەندە زۆرو زەوەنـد بـێ ، ســوودتان پێنــاگەیەنێ ، وە خــوا لەگـەڵ بڕواداران دایە ⁽١٩⁾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! فـەرمانبـەریی خـواو پێغەمبـەرەکەی بکەن ، وە لە حاڵێکدا کـە دەبیسـتن (چییان فـەرمووە) پشـتی تێمەکـەن ⁽٢٠⁾ وە وەك ئەوانـە مەبن کـە گوتیـان : بیستمان ، لە حاڵێکـدا کـە نـەشیـان دەبیست ⁽٢١⁾ مسۆگەر خراپتـرین پێڕۆ (ژیـاندار) لە لای خوا ، ئـەو کـەڕو لاڵانـەن کـە نافـامن ⁽٢٢⁾ وە ئەگـەر خـوا چـاکەی پێوە شك بردبـان (زانیبـای خێریـان پێـوەیە) پێی دەبیستاندن ، وە ئەگـەر پێشـی بیستاندبـان ، بـە ڕوو وەرگێڕانـەوە پشـتیـان هـەڵدەکـرد ⁽٢٣⁾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(لَقِيتُمُ) : (اللِّقَاءُ : مُقَابَلَةُ الشيءِ وَمصادَفتُهُ مَعَاً ، وَغَلَبَ فِي لِقَاءِ العَدُوّ) .

وشەی (لِقَاء) بریتیە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ شتێکدا ، یاخود پێگەیشتنی ، بەڵام وشەی (لِقَاء) زیاتر بۆ گەیشتن بە دوژمن بەکارهێنراوە .

(زَحۡفًا) : (أَصْلُ الزَّحْفِ : انْبِعَاثٌ مَعَ جَرِّ الرِجْلِ كانْبعَاثِ الصَّبِيِّ قَبْلَ أَنْ يَمْشِيِ) .

(زَحْف) ئەوەیە کە کەسێك بڕواو پێی بە دوای خۆی ڕابکێشێ ، وەك چۆن منداڵ پێش ئەوەی بڕوا بە پێو پێ هەڵبگرێ ، خۆی دەخشێنێ .

(فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ) : (التَوَلِّي : إذَا عُدِّي بِنَفْسِهِ اقتَضَى مَعنَى الوَلايَة ، وإذَا عُدِّي بـ(عَن) لَفظاً أو تَقدِيراً ، إقتَضَى مَعنَى الإعْرَاضِ وتَرْكِ قُرْبِه ...) .

وشەی (تَوَلِّي) ئەگەر تەعەددا بکات بۆ (مَفْعُول) بۆ نەفسی خۆی ، ئەوە مانای دۆستایەتیی دەگەیەنێ ، بەڵام ئەگەر بە وشە (عن) تەعەددا بکات بۆ (مَفْعُول) واتە : (تَوَلَّى عَنهُ) ئەوە چ بە (لفظ) وشەی (عن) بەکاربهێنرێ ، چ بە تەقدیر مەزەندە بکرێ ، مانای پشت هەڵکردنو لامل تێکردن دەگەیەنێ ، وە وازهێنان لە نیزیکبوونەوە ، دەگەیەنێ ، (دُبُرُ الشيءِ : خِلافُ القُبُل ، وَكُنِّي بِهِمَا عَنِ العضوين المخصوصين ، وَجَمْعُهُ أَدْبار) .

وە (دُبُر) واتە : دواوە ، پێچەوانەی (قُبُل)ە ، واتە : پێشەوە ، بەڵام دوایی بە کینایە بۆ دوو ئەندامە تایبەتییەکەی ئینسان بەکارهێنراون ، کە مەبەست عەورەتە ، وە ئینسان پێی ناخۆشە دەریکەوێ .

(مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ) : واتە : لەبەر بەرژەوەندیی جەنگ ، پشت لە دوژمن بکات ، یانی : وەرسووڕێ بۆ جەنگ ، دەگوترێ : (انْحَرَفَ وَتَحَرَّفَ عَنْ كَذَا ، مَالَ وَعَدَلَ) ، واتە : لایدا .

(مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ ) : واتە : پەیوەست بێ بە کۆمەڵێکی دیکەوە ، (الحَوْز : الجَمْعُ ، والحَيِّزُ : مَا انْضَمَّ إلى الدَّارِ مِنْ مَرَافِقِهَا ، وَانْحَازَ عَنْهُ : عَدَلَ ، أَي صارَ إلى حَيِّزٍ) .

(حَوْز :) بە مانای کۆکردنەوە دێ ، وە (حَيِّزُ) ئەو موشتەمەلاتەیە کە خانوویەك دەیانگرێتە خۆیو کۆیان دەکاتەوە ، (انْحَازَ عَنْهُ) واتە : لێی لادا ، وە (تحيَّز : أَي صارَ إلى حَيِّزٍ) واتە : چووە چوار چێوەیەکەوە .

(بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ) : (رَجَعَ بِغَضَبٍ مِنَ اللهِ) .

واتە : گەڕایەوە بە تووڕەیی خواوە ، تووڕەیی خوای لەگەڵ خۆیدا بردەوە .

(وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ) : واتە : بۆ ئەوەی بڕواداران تاقی بکاتەوە ، (بَلاَهُ : جَرَّبَهُ وَاخْتَبَرَهُ ... وهُوَ يَكونُ فِي الخَيْرِ وَالشَّرِّ) .

وشەی (بَلاَهُ) واتە : تاقی کردەوە ، جا هەم بۆ چاکە دێ ، وە هەم بۆ خراپە دێ .

(مُوهِنُ ) : (الوَهْنُ : الضَّعْفُ مِنْ حَيْثُ الخَلْقِ أو الخُلُق) .

(وَهْنُ) بریتیە لە بێهێزیی لە ڕووی جەستەیی بێ ، یان لە ڕووی ڕەوشتەوە ، واتە : لە ڕووی ماددیی ، یان لە ڕووی مەعنەوییی .

( كَيْدِ) : (الكَيْدُ : ضَرْبٌ مِنَ الإحْتِيالِ ، وَقَدْ يَكونُ مَمْدُوحاً وَمَذْمُوماً ، وَفِي المَذْمُوم أَكْثَر ...) .

(كَيْد) جۆرێکە لە فێڵ کردن ، وە دەگونجێ باش بێو دەشگونجێ خراپ بێ ، دەگونجێ ستایشکراو بێ ، وە دەشگونجێ زەمکراو بێ ، بەڵام بە زۆریی لە حاڵەتی خراپییو زەمکراوییدا بەکاردێ .

(تَسْتَفْتِحُواْ ) : (الفَتْحُ : إِزَالَةُ الإِغْلاَقِ وَالإِشْكالِ ، الإِسْتِفتَاحُ : طَلَبُ الفَتْحِ وهو الظّفر) .

(فـتـح) بریتیـــە لــە لابردنــی شــتێك کــە داخرابــێ ، ئیشـکالەکــەی لابــەری ، (إِسْـتِفتَاح) یانــی : داواکردنــی سەرکــەوتن ، هــەروەها بـــە مانــای داواکردنــی دادوەریـــیش دێ ، چونکــە کــاتێك دادوەریــی دەکــرێ ، ئــەو ئیشـکــالو گــرێ کوێرەیەی کە هەیـە لە نێوان دوو لایـەن ، یـان زیـاتردا ، دەکرێتـەوە .

(ٱلدَّوَآبِّ) : واتـە : پێرۆیـەکان ، (جَمْعُ دَابة ، يُسْتَعْمَلُ فِي كُلِّ حَيْوَان) .

(دَوَابّ) کۆی (دَابَّة)یە ، بۆ هـەموو ژیـاندارێك بـەکـاردێ .

(ٱلصُّمُّ) : (جَمْـعُ أَصَـمّ ، والصَّـمَمُ : فُقْدَانُ حَاسـة السَّمْع ، وَبِهِ يُوْصَفُ مَنْ لا يُصْغِي إِلـى الحَقِّ وَلاَ يَقْبَلُـهُ) .

(صُـمّ) کــۆی (أَصَــمّ)ە ، وە (أَصَــم) واتـــە : کـــەڕ ، (صَـــمَم) بریتیـــە لـــە لەدەسـتدانی هەسـتی بیسـتن ، کـە لێـرەدا مەبەسـت کەسێکـە ، گوێـی بـۆ هـەق ناگـرێ ، یـاخود گوێی لـێ دەبـێ ، بـەڵام وەری نـاگـرێ .

(ٱلْبُكْمُ) : (جَمْـعُ أَبْكَـم ، وَهُوَ الَّذِي يُوْلَـدُ أَخْرَس) .

(بُكْـم) کۆی (أَبْكَـمْ)ە ، (أَبْكَمْ) واتـە : لاڵ ، بریتیـە لە کـەسێك کە بـە لاڵـیی لە دایك دەبـێ .

(مُّعْرِضُونَ) : (أَعْـرَضَ : أَظْهَـرَ عُرْضَـهُ ، أَي نَاحِيَتَـهُ ، أَعْـرَضَ لِـي كَـذَا : أَي بَـدَا عُرْضُـهُ وَأَعْرَضَ عَنِّي : وَلّى مُبدِيا عُرْضَـهُ) .

(إِعْرَاض) لە بنچینـەدا لە (عُرْض)ەوە هاتوە ، (عُرْض) واتـە : لاتـەنیشــت ، وە (أَعْرَض) واتـە : لاتـەنیشتی خۆی تێکـرد ، ئەگەر کەسێك ڕووی لە کەسێك بـێ ، مانای وایە ئـامادەیە کـە قسەکـانی لێوەربگـرێ ، بـەڵام کـە لاتـەنیشـــتی تێکـرد ، یـان پشــتی تێکــرد ، مانــای وایـــە ، نایــەوێ لــێی وەربگـــرێ ، بۆیــە گوتـــراوە : (أَعْرَضَ لِي كَذَا) واتـە : ئـەو شـتـەم بـۆ خـرایـە ڕوو ، واتـە : تـەنیشـتـەکـەی ، یــان ڕووەکــەیم بیــنی ، وە (أَعْـرَضَ عَنِّي) واتـــە : لاتـەنیشـــتی تێکــردمو پشــتی تێکـردم .

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە خوا ﷻ تێیدا دەفەرموێ : ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِىَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾﴾ :

أ/ «روى السديُّ : أَنَّهُ ﷺ طَلَبَ مِنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه ، يَوْمَ بَدْرٍ : أَنْ يُعْطِيَهُ حَصَبا مِنَ الأَرْضِ ، فَنَاوَلَهُ حَصَبا عَلَيْهِ تُرابٌ ، فَرَمَى بِهِ فِي وُجُوهِ القَوْمِ ، فَلَمْ يَبْقَ مُشْرِكٌ إِلاَّ دَخَلَ فِي عَيْنِهِ مِنْ ذَلِكَ التُّرَاب شيء ، وَأَنْزَلَ اللهُ : ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴿١٧﴾﴾»[١].

واتە : سوودیی (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ داوای لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب کرد ، کە چەنگێك زیخی زەوی پێبدات ، ئەویش چەنگە زیخێکی پێدا ، کە خۆڵی لەسەر بوو ، پێغەمبەر ﷺ چەنگەکەی بەرەو ڕووی کۆمەڵەکەی بەرانبەریان هاویشت ، هیچ هاوبەش بۆ خوا دانەرێك لەوان نەمابوو ، مەگەر شتێك لە زیخو خۆڵەی چووە نێوە چاوی ، خوای بەرزیش ئەم ئایەتەی ناردەوە خوارەوە : ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴿١٧﴾﴾.

ب/ هەر لەوبارەوە (إبن الجوزي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا ئەم دەقەی هێناوە ، دەڵێ : «وَقِيلَ أَخَذَ رَسولُ اللهِ ﷺ قَبْضَةً مِنْ تُرابٍ ، فَرَمَى بِهَا ، وَقَالَ : (شاهَتِ الوُجُوه) ، فَمَا بَقِيَ مُشْرِكٌ إِلاَّ شُغِلَ بعَيْنِهِ ، يُعَالِجُ التُّرَابَ الَّذي وَقَعَ فِيهَا ، فَنَزَلَتْ : ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴿١٧﴾﴾»[٢].

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ بِرقم: (١٥٨٣٨)، وَالطَّبَرَانِيُّ ، بِرقم: (١١٧٥٠) ، وَهُوَ صَحِيحٌ ، وَقَالَ مُحَقّق : تَفسير القرآن الحكيم : صَحِيح لِغَيْرِهِ ، ج ٩ ، ص٥٣٠ .

٢) زاد المسير، لإبن الجوزي ، ص ٥٤٥.

واتە : گوتراوە : پێغەمبەری خوا ﷺ چەنگە خۆڵێكی دەست داوەتێ ، وە بەرەو ڕووی كافرەكان هاویشتوویەتی ، وە فەرموویەتی : ئەو ڕووانە هەر ناشیرین بن ، (لەبەر ئەوەی كە هەڵگری كوفرن) ، وە هیچ كام لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان نەماوە (لە سوپاكەی ئەبو جەهل) مەگەر سەرگەرمی چاوی خۆی بوو ، بۆ ئەوەی چارەسەرە بكاتو پاكی بكاتەوە ، ئەم ئایەتەش دابەزی :

﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴿١٧﴾﴾ .

كە بێگومان ئەمەش موعجیزەیەكی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، چونكە چەنگە خۆڵێك بایی هەزار نەفەر ناكات ، كە بچێتە چاوی هەموویانەوە ، وە ناشگاتە چاوی هەزار نەفەر ، بەڵام هەر خودی گەیاندنی ئەو چەنگە خۆڵە بە دەموچاوی هەموویان ، ئەوە یەكێك بووە لە موعجیزەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، وەك هەموو موعجیزەكانی دی .

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی كە خوا ﷻ تێیدا دەفەرموێ : ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ وَإِن تَنتَهُوا۟ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُوا۟ نَعُدْ وَلَن تُغْنِىَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾ ﴾ .

﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ بْنِ صُعَيْرٍ الْعُذْرِيِّ ، قَالَ : كَانَ الْمُسْتَفْتِحُ يَوْمَ بَدْرٍ : أَبُو جَهْلٍ ، فإنه قال حين التقى القوم : (اللَّهُمَّ أَيُّنَا كَانَ أَقْطَعَ لِلرَّحِمِ ، وَآتَى لِمَا لا يُعْرَفُ ، فَافْتَحِ الغَدَاةَ) ، وَكَانَ ذَلِكَ اسْتِفْتَاحُهُ ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى : ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ﴾﴾[1].

---

١) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم : (٣٢٦٤) ، وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ ، تعليق الذَّهَبِي فِي التلخيص : صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي وَمُسْلِم ، وَأَخْرَجَهُ ابْنُ أَبي شَيْبَة برقم : (١٨٥٢١)، وَالنَّسَائِيّ في (الكُبرَى) ، برقم : (١١٢٠١) وغيره ، وقال مؤلفا الإستيعاب ، ج ٢ ، ص ٢٢٠ : هَذَا إِسْنَاد صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

واتە : عەبدوڵڵای کوڕی ثەعلەبەی کوڕی صوعەیری عوذریی ، دەڵێ : ئەوەی لە جەنگی بەدر داوای یارمەتیی ، یان دادوەریی‌و سەرخستنی کرد ، بۆ یەکێك لەو دوو کۆمەڵە کە کامیان لەسەر هەقە ، ئەبو جەهل بوو ، ئەویش کاتێك کە پێککەیشتن‌و تێکرژان ، گوتی : (اللَّهُمَ أَيُّنَا كَانَ أَقْطَعَ لِلْرَّحِمِ وَآتَى لِمَا لا يُعْرَفُ ، فَافْتَحِ الغَدَاةَ) .

واتە : ئەی خوایە ! کامەمان زیاتر پەیوەندیی خزمایەتیی پچڕاندوە ، وە کامەمان شتێکی هێناوە کە نەناسراوە ، بەیانی تۆ دادوەریی لە دژ بکە ، یان هاوکاریی بنێرە بۆ تێشکانی ، خوای بەرزیش ئەم ئایەتەی ناردە خوار : ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ﴾ .

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم نۆ ئایەتە موبارەکەدا چەند ئامۆژگارییەك و ، چەند ڕێنماییەکی زۆر گەورەو گرنگ ، ئاراستەی بڕواداران دەکات ، لە بواری جەنگو جیهادو بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانیاندا ، دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴾ ، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! هەر کاتێك بەوانەی بێبڕوان گەیشتن ، لە کاتی هێرشو پەلاماریان دا بۆ لای ئێوە ، پشتیان تێمەکەن ، بۆچی خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا ﴾ چونکە لە کاتێکدا دوژمن هێرش دێنیو پەلامار دەدات بە لێشاو ، دیمەنەکەی وا دێتە بەرچاو کە لەسەر زەوی بخشێ ، ئەوە لە ڕاستییدا دیمەنێکی زۆر سامناکە ، وە دڵێکی بەهێزی دەوێ ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ : لەو کاتەدا ئارام بگرن ، ئەگەرنا دوایی کە ئینسان دەکەوێتە نێو شەڕو تەقەو کەڵلەی گەرم دادێ ، خۆی ڕادەگرێ ، ئەگەر هەر هەندێك غیرەتی هەبێ ، بەڵام لەو کاتەدا کە سەرەتای ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگاربوونەوەی دوژمنە ، ئینسان غیرەت بداتە بەر خۆی ، دوایی ئاگای لە ترسی نامێنیو کەڵلەی گەرم دەبێ ، هەر کەس جەنگو بەرەنگاربوونەوەی دیبێ ، ئەو ڕاستییە دەزانێ ، جەنگ زیاتر لە سەرەتاوە غیرەتی پێویستەو ، دوایی مرۆڤ ڕادێ .

پاشان دەفەرموێ : ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ ﴾ ، وە هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا (واتە : لە ڕۆژی کشانی دوژمنانو بە لێشاو هاتنیاندا) ، پاشیان تێبکات ، مەگەر بۆ وەرسووڕان لە کاتی جەنگ دا ، یان بۆ چوونە لای کۆمەڵێکی دیکە .

لێرەدا پێویستە بزانرێ کە : مەبەست لە (دبر) ئەو ئەندامەی ئینسان نیە کە عەورەتە ، بەڵکو مەبەست پێی پشت تێکردنی مسوڵمانانە لە کافرەکان ، وە

ئەگەر لێرەدا ئەو مانایە بگەیاندبایە ، خوای پاك و تاك بەكاری نەدەهێنا ، چونكە خوای بێ وێنە ، هیچ كاتێك باسی عەوڕەتی ئینسانی بە زەقیی نەكردوە ، تەنانەت كە باسی پێكەوە جووتبوونی ژن و مێرد دەكات ، دەفەرموێ : ﴿لَـٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴿٦﴾﴾المائدة ، واتە : دەستتان گەیاندە هاوسەرەكانتان ، یان دەفەرموێ : ﴿أَفۡضَىٰ بَعۡضُكُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ ﴿٢١﴾﴾النساء ، واتە : هەندێكتان چوونە لای هەندێكتان ، یاخود هەندێكتان پێستتان بە پێستی هەندێكتان كەوت ، واتە : هەمیشە خوای پەروەردگار بە كنارە (كناية) باس دەكات ، بۆیەش وا دەڵێم ، با هیچ كەس بە مانا عورفیی و باوەكەی وشەی (دُبُر) تێنەگات ، بەڵكو (دُبُر) لێرەدا یانی : پاشی ئینسان ، وە (قُبُل) واتە : پێشی ئینسان ، وە هەر ئەو دوو وشەیە لە ئەسڵی زمان دا ، وەك فەرهەنگەكانی زمان هێناویانە[1]، ئەوە ماناكەیانە .

﴿إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ﴾ ، مەگەر بۆ خۆ سووڕاندن لە بەرژەوەندیی جەنگدا ، كە جاری وایە پێویست دەكات تۆ ئێرە چۆڵ بكەی بە شێوەیەكی كاتیی ، بۆئەوەی لێی بسووڕێیەوە ، ئنجا ئەو پشت تێكردنە كاتییە ، بە مەبەستی تاكتیكی جەنگیی ، قەدەغە نیە ، ﴿أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ﴾ ، یان جاری وایە دوژمن هێرش دێنێ لە خاڵێكی بێهێزەوە ، ناگونجێ لەو خاڵەوە بەرهەڵستیی بكرێ ، ئەوانەی كە لەوێن ، ئەگەر لە سەنگەرەكەدا بمێننەوە ، هەموو دەكوژرێن ، وا باشە سەلامەت بن و ئەو شوێنە كە بێهێزە چۆڵ بكەن و ، بچن بۆ شوێنێكی دیكە ، كە لەوێ باشتر بەرهەڵستیی بكرێ ، هەڵبەتە لە كاتێكدا بە هۆی ئەو شوێن چۆڵ كردنەوە ، جەبهەكە نەشكێ و دوژمن كەلێن لە سوپای ئیسلام بكات ، ئەگەرنا ئەو كاتە ، پشت كردنە دوژمن ، قەدەغە دەبێ .

خوا ﷻ دەفەرموێ : هەر كەسێك جگە لەو دوو حاڵەتەدا ، پشت لە دوژمن بكات ، ﴿فَقَدۡ بَآءَ بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ ،

---

١) بڕوانە : المصباح المنير، للفيومي، ص ١٠٠ ، و ص ٢٥٢ ، ٢٥٣.

ئەوە بێگومان تووڕەیی خوای پێبڕاوەو ، تووڕەیی خوای لەگەڵ خۆی هێناوەتەوەو ، جێگای حەوانەوەشی دۆزەخە ، ئەویش خراپترین سەرەنجامە .

کەواتە : دەگونجێ ئینسان ئیمانداریش بێ ، بەڵام بەهۆی پشت لە دوژمن کردنەوە ، شایستەی چوونە دۆزەخ بێ ، ئەوەش بەرپەرچی ئەو کەسانە دەداتەوە ، کە نکووڵیی لەوە دەکەن : مرۆڤی مسوڵمان بەهۆی گوناهانەوە ، بچێتە دۆزەخو پاش سزادانی دەرباز ببێ .

ئنجا خوا ﷻ سەرەتا سەرنجی هاوەڵان ، پاشان ئیمانداران ڕادەکێشێ بۆ شتێکی گرنگ : ئەویش ئەوەیە کە کاتێك خوای باڵادەست سەرکەوتنێکمان بە قسمەت دەکات ، شانازیی پێوە نەکەینو ، پێی لە خۆبایی نەبین ، وە بە بەرهەمی شانو شەوکەتی خۆمانی نەزانین ، دەفەرموێ : ﴿ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴾ ، ئەی مسوڵمانینە ! بە ڕواڵەت ئێوە بوون کافرەکانتان دەکوشت ، بەڵام لە ڕاستییدا ئێوە نەتان دەکوشتنو خوا کوشتنی ، {کێ هۆکارەکانی ئەو کوشتنەو ئەو جەنگەی دروست کرد ؟ کە بریتی بوو لە دڵ بەهێز کردنو ، باران باراندنو ، ناردنی فریشتەکانو ، ترس خستنە دڵی دوژمنەکانەوە ؟ بێگومان : خوا ﷻ} ، وە (ئەی موحەممەد ﷺ !) کە چەنگە خۆڵو زیخەکەت هاویشت ، تۆ نەتهاویشت {بە شێوەیەك کە بگاتە دەمو چاوی هەموو کافرەکان} ، بەڵکو خوا بەو شێوەیە هاویشتی ، بەڵێ تۆ فڕێت دا ، بەڵام کێ گەیاندی بە دەمو چاوی ئەوانە ؟ خوای تۆڵەستێن ، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ نەیدەتوانی چەنگە خۆڵێك بخاتە چاوی هەزار جەنگاوەری کافرەوە .

دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ﴾ ، خوا بۆیە وایکرد : تاکو بڕواداران لە لایەن خۆیەوە ، بە تاقیکردنەوەیەکی باش تاقی بکاتەوە ، وشەی (بَلاَء) دەگونجێ بۆ شەڕو خراپە بێ ، وە دەشگونجێ بۆ چاکەو نیعمەت بێ ، لێرەدا دەفەرموێ : بۆ ئەوەی کە نیعمەتێکی باشیان بە قسمەت بکات ، کە ئەوە تاقیکردنەوەکەی خوا بوو بۆ ئەوان ، چونکە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَنَبْلُوكُم

﴿بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ ٣٥﴾الأنبياء ، واتە : بە خراپەو بە چاکە تاقییتان دەکەینەوە ، جاری وایە خوا خۆشییانت بە قسمەت دەکات ، کەواتە : تاقیکردنەوەکەت لە خۆشیی‌و چاکە دایە ، وە جاری وایە تاقیکردنەوەکەت لە ناخۆشیی دایە ، بۆ خۆشییەکە ، تاکو بزانێ : داخۆ سوپاسگوزارییو ، نیعمەتەکە دەگێڕیەوە بۆ لای خوا ؟ وە بۆ ناخۆشییەکەش ، تاکو بزانێ : داخۆ خۆڕاگری ؟ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ، بێگومان خوا بیسەری زانایە .

﴿ذَٰلِكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيۡدِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ ، ئا ئەوەتان بەو شێوەیە بوو ، وە بە دڵنیایی خوا بێهێزو پێزکەری پیلانی بێبڕوایانە ، نافەرموێ : لایدەبات ، بەڵکو دەفەرموێ : بێهێزو پێزی دەکات ، ئەگەرنا پیلانەکەیان وەك ئەسڵەکەی هەر دەمێنێ ، وەك دوایی باسی دەکەین .

﴿إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُۖ﴾ ، ئەی کافرینە ! ئەگەر پێشتر داوای سەرخستنتان لە خوا دەکرد ، بۆ هەر کام لەو دوو کۆمەڵە کە لەسەر هەقە ، ئەوە سەرخستنتان بۆ هات .

لێرەدا بە ڕای زۆربەی توێژەرەوانی قورئان ، ڕووی دواندن لە کافرانە ، یانی : ئەوە داوایەکەتان جێبەجێ کرا ، بەڵام پێچەوانەی داخوازی ئێوە ، سەرکەوتنەکە بۆ ئیمانداران هات ، ئەمە واتایەکی .

یاخود : (إستفتاح) بە مانای (إن تستحکموا) واتە : ئەگەر داوای ئەوە دەکەن کە خوا دادوەرییتان لە نێواندا بکات ، ئەوە دادوەریی خواتان بۆ هات ، ﴿وَإِن تَعُودُواْ نَعُدۡ وَلَن تُغۡنِيَ عَنكُمۡ فِئَتُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَوۡ كَثُرَتۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ، وە ئەگەر واز بێنن ، باشترە بۆتان ، وە ئەگەر جارێکی دیکە بشگەڕێنەوە بۆ جەنگ لە دژی مسوڵمانان ، ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ هاوکاریی مسوڵمانانو پشتگیریی کردنیان .

﴿ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْئًا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ، وە دڵنیابن کە کۆمەڵەکەتان هەرچەندە ژمارەی زۆرو زەوەند بێ ، سوودتان پێناگەیەنێ ، وە بێگومان خوا لەگەڵ بڕواداران دایە ، هەڵبەتە بڕوادارانی ڕەسەنو ڕاستەقینە خوا لەگەڵیان دایە ، نەك هەرچی گوتی مسوڵمانو ئیماندارم ، خوا لەگەڵی دابێ !
دوایی کەسێك ببینێ : سوپایەك کە لە زڕە مسوڵمانان پێکهاتوە ، لە بەرانبەر جوولەکەدا ، یان لە بەرانبەر نەصرانییەکاندا ، یان لە بەرانبەر هێزی بتپەرستەکاندا ، لە ڕۆژهەڵات ، یان ڕۆژئاوای دنیادا ، تێکدەشکێ ، بڵێ : کوا بەڵێنەکەی خوا ؟ دەبێ بزانێ بەڵێنەکەی خوا بۆ ئیماندارانی ڕاستەقینەیە ، ئیماندارانی ڕاستەقینەش ، ئەوانەن کە هەم پابەندن بە شەریعەتی خواوە ، هەم پەیڕەویی لە یاسا کەونییەکانی خوا (سنن الله الكونية) دەکەن ، ئنجا یەکێك لە یاساکانی خوا ئەوەیە کە ئێمە پێکەوەبین ، بۆیە کاتێك مسوڵمانان پرژو بڵاو دەبن ، دوایی تێکدەشکێن ، ئەوە وەك چۆن پێچەوانەی شەریعەتی خوا ، ڕەفتاریان کردووە ، کە فەرمانی کردوە بە یەکڕیزیی : ﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ... ﴿١٠٣﴾ ﴾ آل عمران ، وێڕای ئەوە : پێچەوانەی یاسای خواش جووڵاونەوە ، بۆ وێنە یەکێك لە یاساکانی خوا ئەوەیە : تۆ دەبێ مەلە بزانی ، ئنجا بچیە نێو ئاوێ ، وە ئەگەر مەلەوانیی نەزانی ، دەخنکێی ، لەبەرئەوەی پێچەوانەی یاسایەکی خوا جووڵاویەوە !!

دوایی خوا بۆ جاری دووەم ، لەم سوورەتەماندا بە نازناوی ئیمان مسوڵمانان دەدوێنێ ، دەفەرموێ : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴾ ، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن ، وە لە حاڵێکدا کە دەبیستن (خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ چییان فەرمووە) پشتی تێمەکەن ، ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾ ، وە وەك ئەوانە مەبن کە گوتیان : ئەوە بیستمان ، کەچی نەشیان

دەبیست ، کافرەکان دەیانگوت : ﴿ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ ۙ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ ﴾الأنفال ، واتە : ئەوە بیستمان ، ئەگەر بمانەوێ ئێمەش قسەی وەك ئەم قورئانە دەكەین ، بەڵام ڕاستیشیان نەدەكرد ، هەر بە گوێ بیستیان ، بە عەقڵ و دڵ نەیانبیست ، ئەگەر بە عەقڵ و دڵ ئەو قورئانە ببیستن ، ئیمانی پێ دێنن .

دوایی دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ مسۆگەر خراپترین پێڕۆ ، خراپترین ژیاندار كە لەم سەر زەوییە دەڕوات ، لە لای خوا ، ئەو كەڕو لاڵانەن كە نافامن .

بۆچی خوا پەروەردگار بێبڕوایەكان بە ئاژەڵ و بە ژیاندار بەگشتیو ، بە كەڕ لاڵ و نەفام ، ناو دەبات ؟ چونكە كەسێك نەزانێ بۆچی هاتۆتە سەر ئەم زەوییە ؟ نەزانێ لە كوێ هاتووە ، بۆچی هاتوە ؟ كێ هێناویەتی ؟ دەبێ چی بكات ؟ بە ڕاستی جیاوازییەكی نیە لەگەڵ هەموو ئەو ئاژەڵ و دڕندەو ژیانەوەرانەدا ، كە دەخۆن و ، دەڕۆن و ، دەڕیـن و ، دوایی ژیانیان كۆتایی پێ دێ ، وە كەسێك ئەو هێزی بیستنە كە خوای پێداوە ، هەقی پێ نەبیستێ و پێی تێنەگات ، ئەو زمانەی خوا پێی داوە ، هەقی پێ نەبێژێ و ، دانی پێ بە هەقدا نەهێنێ ، وە ئەو ئەو عەقڵەی خوا پێی داوە ، ئەگەر دەركی ڕاستییەكانی پێنەكات ، وە خوای پێ نەناسێ و ، خۆی پێ نەناسێ و ، ئەركی خۆی پێ نەناسێ ، وە هەموو ئەو پرسیارانەی كردمانن ، پێی وەڵام نەدرێنەوە ، لە ڕاستییدا ئەو كەسە وەك ئەوە وایە ، كە نە گوێی هەبێ ، نە زمانی هەبێ ، وە نە عەقڵی هەبێ ، هەڵبەتە ئەوە جۆرێكیشە لە هاندان بۆ ئیمانداران ، بۆئەوەی بزانن كە ئەو بێبڕوایانەی لەگەڵیان ڕووبەڕوو دەبنەوەو ، دژیان دەوەستن ، وەك ئاژەڵێكی دڕندە تەماشایان بكەن ، چونكە ئەوانە هەموو ئەو سیفەت و هێزانەی كە مرۆڤیان پێ لە ئاژەڵ جیادەبێتەوە ، لە خۆیانیان دا پەك خستوون .

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴾ ، وە ئەگەر خوا چاکەی پێوە شك بردبان ، خێری پێوە بینیبان ، پێی دەبیستاندن ، وای دەکرد کە ببیستن ، وە ئەگەر پێشی بیستاندبان ، بە زۆریی و لە حاڵێکدا کە نایانەوێ ، ئەوە دەیسان پشتیان هەڵدەکرد ، وە ڕوویان وەردەگێڕا ، واتە : خوا ﷻ ئەوەندە ڕێزی لە مرۆڤ ناوە ، ناچاریی نەکات ، شتێك کە نایەوێ ، زۆری لێ بکات ، تاکو بیەوێ ، تەنانەت لە بەرانبەر بەندایەتیی کردنی بۆ خۆی دا ، خوا نەیویستوە مرۆڤ ناچار بکات ، بیپەرستێ ، ئەوەش ڕێزی خوایە بۆ مرۆڤ ، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾ ﴾الإسراء ، ئنجا کە شەریعەتی خوا ئەوەی نەویستوە ، لە کەسیشی قبووڵ ناکات ، شتێك بەسەر خەڵکدا فەرز بکات ، کە نایانەوێ ، خوا مرۆڤی دروستکردوە کە تاقی بکاتەوە ، بەڵام کەی دەتوانێ تاقیکردنەوە ئەنجام بدات ؟ بێگومان تەنیا کاتێك کە ئازاد بێ و ، دەستی کراوەبێ ، بۆیە ئەگەر ناچار بکرێ ، مانایەك بۆ تاقیکردنەوە نامێنێ .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحۡفٗا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ فَقَدۡ بَآءَ بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾ ، کە پێشتریش لە مانای گشتیی دا تەفسیرمان کردن ، بەلاَم لێرەدا تیشکی باشتری دەخەینەوەسەرو ، مانای چەند وشەیەك زیاتر ڕوون دەکەینەوە :

١ / وشەی ﴿ زَحۡفٗا ﴾ ، دەڵێ : (زَحَفَ الطِّفلُ) منداڵەکە لەسەر زەوی خشا ، منداڵ کە لەسەر زەوی دەخشێ ، پێش ئەوەی پێ بگرێو بەسەر پێ بکەوێ ، وە سەرباز کە مەشق دەکات ، دەبێ خشان (زحف)ی پێ بکرێ ، واتە : دەبێ لەسەر سینگ بخشێ ، تاکو لە کاتی جەنگ کردن دا خۆی بپارێزێ .

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ دیمەنی هێرشکردنی دوژمنان بۆ وێنا دەکات ، کە دوژمن ئەگەر سوپایەکی زۆرو گەورەی پێ بێ ، وەك چۆن شتێك لە زەوی بخشێ ، ئاوا دێتە بەرچاو ، هەڵبەتە لەو کاتەش دا ، دیمەنی سوپای دوژمن سامناکە ، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی : لەو کاتەدا پشتیان تێمەکەن !

٢ / کە دەفەرموێ : ﴿ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ ، وشەی ﴿ لَقِيتُمُ ﴾ ، واتە : پێیان گەیشتن ، بەلاَم وشەکانی : (لِقَاء ، لَقَيتُم ، إلتقى) لە قورئانێ دا ، زیاتر بۆ پێکگەیشتنی دوو سوپا ، کە بۆ جەنگ کردن پێکدەگەن ، بەکارهاتوون .

٣ / وشەی ﴿ ٱلۡأَدۡبَارَ ﴾ ، کۆی (دُبُر)ە ، واتە : پاشی ئینسان ، پێچەوانەی (قُبُل)ە ، واتە : پێشەوەی ئینسان ، بەلاَم وەك پێشتریش گوتمان : ئەگەر لە

عورفو باوی ئێستادا (قُبُل) و (دُبُر) بۆ عەورەتی پێشو پاشی مرۆڤ بەکاردێن ، لە ئەسڵی زمانو بەکارهێنانی قورئان دا ، ئەو مانایەیان نیەو ، هەرگیز لە قورئان دا وشەیەکی وا کە بە زەقیی باسی ئەو ئەندامانەی مرۆڤ بکات ، کە عەورەتنو عادەت نیە باس بکرێن ، نەهاتوە.

کەواتە : خوای پەروەردگار قەدەغەی کردوە لە مسوڵمانان ، پاش لە دوژمن بکەن ، لە کاتی هێرش بردن کشانو پەلاماردانیاندا بە لێشاو ، تەنیا لە دوو حاڵەتدا نەبێ : ﴿إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ﴾ :

أ - وەرسووڕان بۆ جەنگ .

ب - چوونە لای کۆمەڵێکی دیکە .

٤ / ﴿إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ﴾ ، واتە : مەگەر بۆ وەرسووڕان بە مەبەستی جەنگ کردن ، جاری وایە ئینسان لە شوێنێکە کە بە کەڵك نایەت ، لەوێدا بەردەوامیی بە شەڕەکە بدات ، ئنجا ئەگەر بۆ ماوەکی کاتیی بەجێی بهێڵێ ، تاکو وەردەسووڕێ بۆ شوێنێکی باشترو ستراتیجیی تر ، لەو کاتەدا قەیدێناکاتو حەرام نیە ، بەڵکو جاری وایە پێویستیش دەبێ ، پشت بکاتە دوژمن .

٥ / ﴿أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ﴾ ، یاخود لە شوێنێکە ، باش بەرهەڵستیی بۆ ناکرێ ، لەبەر خراپیی شوێنەکە ، ئنجا ئەو کەسە ، یان ئەو کۆمەڵە دەچنە لای کۆمەڵێکی دی لە مسوڵمانان ، بۆ ئەوەی باشتر زەفەر بە دوژمن ببەن ، ئەوەش دیسان هەڵاوێردراوەو گوناح نیە ، لەو کاتەدا پشت لە دوژمن بکات ، بەڵام ئەگەر جەنگاوەر بەبێ هۆکارێك کە پێویست بێ ، یان بەبێ ئەوەی لە بەرژەوەندیی دا جەنگ بێ ، پشت لە دوژمن بکات ، ئەوە چۆن دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ؟ دەفەرموێ : ﴿فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ، ئەوە بێگومان تووڕەیی خوای لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە ، وە جێگای حەوانەوەشی دۆزەخە ، وە خراپترین شوێنیش ئەوێیە .

شایانی باسیشە : ئەم ئایەتە لەگەڵ چەند ئایەتێکی دی لە قورئان دا بەڵگەی ڕوونو ڕاشکاوە ، کە مسوڵمانانی گوناهبار دەچنە دۆزەخ ، وەك فەرمایشتە ڕاستو دروستەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ باسیان کردوە ، چونکە کاتی خۆی خەواریج ، وە ئێستاش هەندێك لە زانایانو ، هەندێك لە وانەی کە بە حیساب تەنیا پشت بە قورئان دەبەستن ، دەڵێن : نەخێر ، مسوڵمان ناچێتە دۆزەخ ، یان یەکسەر دەچێتە بەهەشت ، یان کە چووە دۆزەخ ، بە یەکجاریی دەچیو نایەتەوە بۆ بەهەشت ! بەڵام لە ڕاستییدا ڕایەکەیان پێچەوانەی کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ ، کە ئێمە هیچ شتێك ناچارمان ناکات ئەو فەرموودانە وەلا بنێین ، وە پاشان ئەم ئایەتە موبارەکەو هاووێنەکانیشی ، بەڵگەن لەسەر پێچەوانەی ئەوە ، چونکە لێرەدا خوا زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی ئیمانداران دەدوێنێ ، دەفەرموێ : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾ ، واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! (کەواتە : ئیمانداران) هەر کاتێك بە دوژمن گەیشتن بە لێشاو ، پشتیان تێمەکەن ، مەگەر لەم دوو حاڵەتەدا نەبێ : وەرسووڕانو لەبەر بەرژەوەندیی جەنگ شوێن گواستنەوە ، یاخود بچنە جەبهەی کۆمەڵێکی دیکەی مسوڵمانانەوە ، کە لەوێ باشتر شەڕەکە بکرێ ، ئەگەرنا هەر کەسێك پشت لە دوژمن بکات ، بەبێ بەڵگەو پاساوی شەرعیی ، ئەوە خوا ﷻ لێی تووڕە بووە ، وە جێگاشی دۆزەخە ، یانی : بە ئەندازەی گوناهەکەی دەسووتێ ، کەواتە : مسوڵمانیشەو دەشچێتە دۆزەخ ، بۆچی ؟ چونکە گوناهێکی گەورەی ئەنجام داوە ، ئنجا با تەماشای ئەم فەرموودەیەش بکەین :

﴿اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ ، قِيلَ يَا رَسولَ اللهِ وَمَا هُنَّ ؟ قَالَ : الشِّرْكُ بِاللَّهِ ، وَالسِّحْرُ ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ ، وَأَكْلُ الرِّبَا ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ {رواه

البُخَارِيُّ ، بـرقم : (٢٧٦٦) ، وَمُسْلِمٌ ، بـرقم : (٢٥٨) ، وَأَبُـو دَاوُدَ ، بـرقم : (٢٨٧٤) ، وَالنَّسائِيُّ ، برقم : (٣٦٧٣) ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه} .

واتە : خۆتان لە حەوت (گوناهە) فەوتێنەرەکان بپارێزن ! گوترا : ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : هاوبەش بۆ خوا دانانو ، جادوو کردنو ، بە ناهەق کوشتنی نەفسێك کە خوا قەدەغەی کردووە ، خواردنی ماڵی هەتیوو ، خواردنی سوودو ، لە کاتی هێرشی دوژمن دا ، پشت تێکردنیو ، بوختانکردن بۆ ئافرەتانی پاکی بێئاگای بڕوادار .

هەر کامێك لەو حەوتانە ئینسان دەفەوتێنێ ، واتە : گوناهی گەورەن ، وە ئینسان وا لێدەکەن کە شایستەی سزای دۆزەخ بێ ، کەچی هەر بە ئیمانداریش لە قەڵەم دەدرێ .

وە زۆربەی هەر زۆری زانایانیش گوتوویانە : هەر کەسێك هەر یەکێك لە گوناهە گەورەکان ئەنجام بدات ، ئەگەر تۆبەیەکی ڕاستی لێ نەکات ، وە نەکەوێتە بەر لێبوردنی خوای لێبوردەوە ، ئەوە بە ئەندازەی گوناهەکەی لە دۆزەخ دا سزا دەدرێو ، دوایی دەربازی دەبێ .

## ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی حاڵەتەکانی پشتکردنە دوژمن لە جەنگ دا :

هەڵبەتە کە خوا ﷻ دەفەرموێ : پشت لە دوژمن مەکەن ، تەنیا لە دوو حاڵەتاندا نەبێ ، زانایان دەڵێن : ئەوە لە حاڵێکدایە ، کە سوپای دوژمن لە دوو هێندەی سوپای مسوڵمانان زیاتر نەبێ ، ئەگەر لە دوو هێندەی وان زیاتر بوون خوای پەروەردگار کە بۆ مسوڵمانانی سووك کردوە ، وەك دەفەرموێ : ﴿ ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ﴿٦٦﴾ ﴾ الأنفال ، واتە : ئێستا خوا لەسەری سووك کردنو ، زانی کە بێهێزییتان هەیە ، ئەگەر سەد(١٠٠)ی خۆڕاگرتان هەبێ ، بەسەر دوو سەد(٢٠٠)دا زاڵ دەبن .

ئەدی ئەگەر مسوڵمانان سەد کەسیان ، لەگەڵ سێ سەدو چوار سەدو پێنج سەددا، ڕووبەڕووبوونەوە ؟

أ ) هەندێك لە زانایان دەڵێن : ئەگەر مسوڵمان لەو حاڵەتەدا ، پشت لە دوژمنانیش بکات ، گوناهبار نابێ ، چونکە خوا لەسەر مسوڵمانانی سووك کردوە ، وە لە ئایەتەکەدا ، تەنیا ئاماژە بە دوو ئەوەندە کراوە .

ب ) وە هەندێکیان دەڵێن : ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە ، بەوە کە خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ ﴿٦٦﴾ ﴾الأنفال ، واتە : خوا ئێستا لەسەری سووك کردن .

بەلام لە ڕاستییدا ئەو ڕایەی پێشێشیان جێی تێبینییە ، وە ئەو ڕایەی دوایەشیان جێگای سەرنجو تێبینییەو ، بگرە قسەیەکی بێ بنەمایە ، چونکە ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ئێستا لەسەری سووك کردن ، لەگەڵ ئەوەدا کە دەفەرموێ : پشت لە دوژمن مەکەن ، هیچ تێکگیرانێکیان نیە ، تاکو بڵێین : ئەویان ، ئەمە نەسخ دەکاتەوە ، وە لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە : {قَد روي عَنْ

عُمَر وابنه وابْنُ عَباسٍ وَأَبي هُرَيْرَة وَأبي سَعِيد الخُدْرِيِّ وَأَبِي بصرة وَعِكْرَمَة وَنَافِع وَالحَسن وَقَتَادَة وَزَيْد أبي حَبيب والضّحّاك : أن تحريم الفِرَار فِي هَذِهِ الآية خَاصٌ بيَوْم بَدْر بنَاءً عَلَى قوله : (يَوْمَئِذٍ)}(١).

گوایە ئەو بەڕێزانە کە هەندێکیان هاوەڵ و هەندێکیان شوێنکەوتووان (تابعین)ن ، خوا لە هەموویان ڕازی بێ ، لێیان گێڕدراوەتەوە (کە من پێم وایە سەنەدەکە ڕاست نیە) گوتوویانە : ڕاکردن لە کاتی هێرشی بە لێشاوی دوژمناندا لەم ئایەتەدا ، کە قەدەغەیە ، ئەوە تایبەتە بە جەنگی بەدرەوە ، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی : هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا ، واتە : لە ڕۆژی بەدردا .

بەڵام لە ڕاستییدا ئەمە وانیە ، چونکە (يَوْمَئِذٍ) ، واتە : لە ڕۆژی پێکگەیشتندا ، لە ڕۆژی هێرش و پەلاماریاندا ، نەك لە ڕۆژی بەدردا ، وە خوای پەروەردگار باسی بەدری نەکردوە ، وە ئەو ڕۆژە (يَوْمَئِذٍ ) مەبەست ئەو ڕۆژەیە کە ئەو هێرشە ، بەو شێوەیە لە لایەن دوژمن دەهێنرێ و پەلامار دەدەن ، هەر کەسێك پشتیان تێبکات ، ئەوەی خوای دادگەر لێی تووڕەیە ، وە سزای دۆزەخی پێ دەبڕێ .

ئنجا ئەو فەرموودەیەش کە ئێستا لەوبارەوە دەیهێنین ، مەگەر بە جۆرێکی دیکە مانا بکرێ ، کە لەگەڵ ئایەتەکەدا بگونجێ ، ئەگەرنا ئەویش سەنەدەکەی بێهێزە ، وە مەتنەکەشی لەگەڵ ئایەتەکەدا تێك دەگیرێ ، با تەماشای بکەین :

﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ : كُنْتُ فِي سَرِيَّةٍ مِنْ سَرَايَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَحَاصَ النَّاسُ حَيْصَةً ، وَكُنْتُ فِيمَنْ حَاصَ فَقُلْنَا : كَيْفَ نَصْنَعُ وَقَدْ فَرَرْنَا مِنْ الزَّحْفِ ؟ وَبُؤْنَا بِالْغَضَبِ ، ثُمَّ قُلْنَا : لَوْ دَخَلْنَا الْمَدِينَةَ فَبِتْنَا ، ثُمَّ قُلْنَا : لَوْ عَرَضْنَا أَنْفُسنا عَلَى رَسولِ اللهِ ﷺ ، فَإِنْ كَانَتْ لَهُ تَوْبَة وَإِلاَّ ذَهَبْنَا ، فَأَتَيْنَاهُ قَبْلَ صَلاَةِ الْغَدَاةِ ، فَخَرَجَ فَقَالَ : مَنِ الْفَرَّارُونَ ؟ قَالَ فَقُلْنَا : نَحْنُ الْفَرَّارُونَ ، قَالَ : لا بَلْ أَنْتُمْ الْعَكَّارُونَ أَنَا فِئَتُكُمْ ، وَأَنَا فِئَةُ الْمُسْلِمِينَ ، قَالَ : فَأَتَيْنَاهُ حَتَّى قَبَّلْنَا يَدَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ الحُمَيْدِي ، برقم : (٦٨٧) ، وَأَحْمَد ، برقم : (٤٧٥٠) ، وَأَبُو دَاوُد ، برقم :

---

١) المجموع شرح المهذب، كتاب السير، ص ٢٩٤ .

(٢٦٤٧) ، وَأَبـي يَعْلَـى ، بـرقم : (٥٧٨١) ، وَابْـنُ مَاجَـه ، بـرقم : (٣٧٠٤) ، وَالتِّرمِـذِيُّ ، بـرقم : (١٧١٦) ، وَقَـالَ التِّرمِذي : هَذَا حَدِيثٌ حَسَـن لا نعرفـه إلا مـن حديـث يزيـد بـن أبي زيـاد ، وقال أيمن صـالح شعبـان قلت : ويزيـد هـذا قال عنه الحـافظ : إنه ضَعِيف ، وَضَـعَّفَهُ كُلٌ مِن الألبـاني و شعيب الأرنؤوط وحسين سليم أسد} .

واتـە : عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خـوا لێیـان ڕازی بێ ، دەڵـێ : مـن لـە سـەرییەك دابـووم ، (سەرییـە بـەشـێکە لە سـوپایەك) لـەو سەرییانـەی کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەینـاردن ، خەڵك لە بـەرانبـەر دوژمنـدا ڕایـان کـرد ، منـیش یەکـێك بـووم لـەو کەسانـەی کە ڕایان کـرد ، دوایـی گوتمـان : جـا چـی بکـەین ، لـە کاتێکـدا کـە لـە کـاتی هاتنی لێشاوی دوژمنـدا ڕامـان کـردوە ، وە تـووڕەیی خـوامان پێبـڕاوە ؟ دوایـی گوتمان : بـا بچینـەوە مەدینـە ، شـەوگـار بەرینـەسـەر ، ئنجـا گوتـمان : بـا خۆمـان پێشانی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بـدەین ، ئەگـەر ڕێـی گەڕانـەوەمان هـەبێ ، ئەگـەرنا سـەری خۆمـان هـەڵدەگریـن‌و دەڕۆیـن ، پـێش نوێـژی بـەیـانی چووینـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ، فـەرمووی : ئـەوانـەی ڕایـان کـردوە کێن ؟ گوتمـان : ئێمـەین ڕامان کردوە ، فـەرمووی : بـەڵکو ئێـوە دووبـارەوە گەڕاوانن ، (واتـە : دووبـارە هێرش بـۆ دوژمـن دەبەنـەوە) وە مـن کۆمـەڵی ئێـوەو کۆمەڵـی مسوڵمانـانم[1]، جـا دەڵـێ : ئێمەش چووینـە خزمەتیو دەسـتمان مـاچ کـرد .

وەك پێشـتـر باسـمان کـرد ، ئـەم دەقـە سـەنـەدەکـەی بێهێـزە ، وە ماناکـەشی لەگەڵ ئـایەتـەکـەدا تێکدەگیـرێ ، چونکـە ئەگـەر هـەر کـەسـێك لـە جەنگێـك ڕای کـرد ، بیـانووی ئـەوە بێنێتـەوە ، کـە پەیوەست بووە بـە مسـوڵمانانی دیکەوە ، مانـای وایە مسـوڵمانان بۆیـان هەیە لـە هیـچ جەبهـەو جەنگێك دا بـەرهـەڵستیی نەکەن‌و ، دوایی هـەر کامێکیـان بچـێ بۆ لای کۆمەڵێکی دیکە ! کە بـە تـەئکـید ئـەوە ڕاسـت نیـەو ، پێویست ناکـات هـەر وتـووێژیشـی لەسـەر بکـرێ ، چونکـە فـەرموودەکـە سـەنـەدەکەی ڕاست نیـە ، وە حوکمێکی شـەرعیی وا گـەورە ، کـە ئـایەتێـك زۆر بـە

---

١) (فِئَـةُ) واتـە : ئەو کۆمەڵەی کـاتێك کەسێك پشت لە دوژمـن دەکـات ، بەوانـەوە پەیـوەست دەبێ ، واتـە : مـن ئـەوە کۆمەڵـەم کـە ئێـوە بـە منـەوە پەیوەست بـوون ، کـە ئـەویش یەکێکـە لـەو دوو حاڵەتـە هـەڵاوێـردراوەی کـە ئەگـەر پشت لـە دوژمـن بکـەی گونـاح نیـە، ئـەویش ئەوەیـە یـان وەرسـووڕێـی ، یان پەیوەسـت بـی بە کۆمەڵێکی دیکـەوە .

ڕوونیی فەرموویەتی : نابێ پشت لە دوژمنان بکەن ، وە هەر کەس پشتیان تێبکات ، خوا لێی تووڕە بووەو ، جێگای دۆزەخە .

هەرگیز بە دەقێکی دی کە سەنەدەکەی بێهێزە ، هەڵناوەشێنرێتەوە ، بەڵکو فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ لە ژێر ڕۆشنایی قورئاندا تەماشا بکرێن ، وە بە دڵنیایی پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی نەفەرمووە ، کە لەگەڵ قورئاندا تێکبگیرێ .

بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین : کە مەرج نیە هەموو پشت لە دوژمن کردنێك ، گوناهی گەورە بێ ، بۆچی ؟ چونکە :

یەکەم : خوا ﷻ کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۝١٩٥ ﴾ البقرة ، واتە : بە دەستی خۆتان خۆتان مەفەوتێنن ، تۆ لە کاتێکدا کە لەگەڵ دوژمن دا ڕووبەڕوو دەبیەوەو ، دڵنیای کە هێزەکانتان زۆر نابەرانبەرنو ، لە شکست دڵنیاو مسۆگەری ، یان کۆمەڵێکی کەمی مسوڵمانان ، لێشاوێکی زۆری دوژمنیان بۆ دێو ، دڵنیان کە بەرهەڵستییان بۆ ناکرێو لە بەین دەچنو ، یەکێکیان لێ نامێنێ ، لەو حاڵەتەدا ڕاکردنو پشت هەڵکردن لە دوژمن ، گوناهی گەورە نیە ، چونکە وەك چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی : پشتیان تێمەکەن ، هەروەهاش فەرموویەتی : بە دەستی خۆتان مەفەوتێنن .

دووەم : پاشان بەڵگەیەکی زۆر بەهێزی دی لەوبارەوە ، هەڵوێستەکەی خالیدی کوڕی وەلیدە ، کە پێغەمبەر ﷺ نازناوی شمشێری خوا (سیف الله)ی پێداوە ، ئەویش لە جەنگی (مؤتة)دا ، دوای ئەوەی هەر کام لە جەعفەری کوڕی ئەبی طالیبو ، زەیدی کوڕی حاریسەو ، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ، دەبن بە فەرماندەی ئەو سوپایەی کە نیزیکەی سێ هەزار کەس بووە ، بەڵام لەگەڵ سوپایەکی دوو سەد هەزار کەسی لە ڕۆمەکانو ، لەو عەرەبە مورتەزەقانەی کە پێیانەوە پەیوەست بوو بوون ، ڕووبەڕوو دەبێتەوە ، ئنجا کە هەر سێ فەرماندەکە شەهید بوون ، وە ژمارەیەکی زۆریشیان لە ڕۆمەکان کوشتن ، دوایی ئەوە بوو کەس نەما فەرماندەییان بکات .

پاشان هەموویان لەسەر خالیدی کوڕی وەلید ڕێککەوتن ، وە خالید خوا لێی ڕازی بێ ، تاکتیکی بەکارهێناو چەند هێرش‌و پەلامارێکی باشی کردنە سەر ، دوایی کشایەوەو هاتنەوە بۆ مەدینە ، پێغەمبەر ﷺیش لەو هەلۆیستەیدا نازناوی شمشێری خوا (سیف الله)ی پێدا ، لە کاتێکدا کە فەرماندەکانی دی شەهید دەبوون ، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدەداو دەیفەرموو : ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبی طالیب شەهید بوو ! ئەوە زەیدی کوڕی حاریسە شەهید بوو ! ئەوە عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەش شەهید بوو ! دوایی فەرمووی : ئێستا یەکێك لە شمشێرەکانی خوا ئاڵایەکەی گرتە دەست ، کە مەبەستی خالیدی کوڕی وەلید بوو[1].

بەڵێ ، خالید دوایی ئەو سوپایەی کشاندەوە ، چونکە دەیزانی سەرەنجامی سێ هەزار کەس لە بەرانبەری دوو سەد هەزار کەس دا ، لە شوێنێکی دوور وڵاتی کە هیچ هاوکاریی کۆمەکیان ناگاتێ ، سەر بە فەتارەت چوونە ، بۆیە عەقڵ‌و مەنتیق‌و شەرع وا دەخوازن ، کە تۆ مسوڵمانان بە هیلاك نەدەی‌و ، ئەو سێ هەزار کەسە بمێنن ، بۆ ئەوەی دوایی لەگەڵ هێزێکی دی ڕووبەڕوو ببنەوە ، کە ئەوە بوو دوایی سوپای ئیسلام ڕۆمیشیان شکاندو سەرکەوتن .

**مەسەلەی دووەم** : کە خوا ﷻ دەفەرمویٚ : ﴿ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَاءً حَسَنًا ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ .

(إبن كثير) ئاوا مانای ئەو ئایەتە موبارەکەی لێکداوەتەوە ، دەڵێ :

١ - (أَي : لَيْسَ بِحولِكُمْ وَقُوَّتِكُمْ ، قَتَلْتُمْ أَعْدَاءَكُمْ مَعَ كَثْرَةِ عَدَدِهِم وَقِلَّةِ عَدَدِكُمْ ، أَي : بَلْ هُوَ الَّذِي أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِم ، كَمَا قَالَ تَعَالَى : ﴿ وَلَقَدْ

---

[1]) السيرة النبوّية لابن هشام ، ج ٤ ، ص ٢٠٩-٢١٥ ، بەڵام ئەم تەعبیرە : (لقد أخذ الراية سيف من سيوف الله ففتح الله على يديه) لە سەرچاوەکانی دیکەدا بۆ وێنە : (الأحكام السلطانية)ی الماوردي ، دا هاتوە .

نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾ آل عمـــران) ،
واتە : ئێوە بەهێزو پێزو توانای خۆتان نەبوو کە دوژمنەکانتان کوشت ، لە کاتێکدا کە ئەوان ژمارەیان زۆر بوو ، ئێوەش ژمارەتان کەم بوو ، بەڵام خوا ﷻ ئێوەی بەسەر ئەواندا زاڵ کرد ، وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ :
{وە بێگومان خوا ئێوەی سەرخست لە جەنگی بەدردا ، لە کاتێکدا کە ئێوە زەبوونو کەم بوون ، بۆیە : پارێز لە خوا بکەن ، بەڵکو سوپاسگوزاربن} .

٢ - دەربارەی ئەوە کە دەفەرموێ : ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴾ ، (إبن كثير) گوتوویەتی : (أي : هُوَ الَّذِي بَلَّغَ ذَلِكَ إِلَيْهِم ، وَكَبَتَهُمْ بِهَا لاَ أَنْتَ) .

واتە : خوا بوو ئەو چەنگە زیخو خۆڵەی گەیاندە دەمو چاوی کافرەکان ، وە زەبوونی کردن ، نەك تۆ .

٣ - وە دەربارەی ئەوە کە دەفەرموێ : ﴿وَلِيُبْلِىَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ﴾ ، گوتوویەتی : (أَي : لِيُعَرِّفَ المُؤْمِنِينَ نِعْمَتَهُ عَلَيْهِمِ ، مِنْ إِظْهَارِهِم عَلَى عَدُوِّهِم مَعَ كَثْرَةِ عَدُوِهِم ، وَقِلَّةِ عَدَدِهِم)[1].

واتە : بۆ ئەوەی خوا چاکەی خۆی پێشانی بڕواداران بدات ، لەوەدا کە سەری خستن بەسەر دوژمنیاندا ، وێڕای زۆری ژمارەی دوژمنو ، کەمیی ژمارەی خۆیان .

٤ - ئنجا لە کۆتایی ئەم ئایەتە موبارەکەدا خوا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ ، وە بێگومان خوا بیسەری زانایە ، ئەم ڕستەیە لەگەڵ تۆزێك جیاوازیی ، لە چوار شوێن لە سوورەتی ئەنفالدا ، هاتوە : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير ، ص ٥٣١ .

﴿ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ﴾الأنفال ، ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ ﴾الأنفال ، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾ ﴾الأنفال ، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾ ﴾الأنفال ، دیارە لە هەر چوار شوێنەکەدا بە تۆزێك جیاوازییەوە ، بەڵام هەر هەمووی باسی ئەوە دەکات ، کە خوا بیسەری زانایە ، بۆچی ؟ چونکە لە کاتی جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەدا ، خەڵك هاوار لە خوا دەکەنو ، لە خوا دەپاڕێنەوە ، دیارە خواش بیسەرە بۆ پاڕانەوەکانیان ، وە زاناشە بە کاروبارو حاڵو باڵیان ، وە پێداویستییەکانیان دەزانێ ، بۆیە ئەو ڕستە موبارەکە کە باسی جەنگی بەدر دەکات ، چوار جار لە سووڕەتی ئەنفالدا هاتوە ، چونکە کەشو هەواو سیاقەکە دەیخوازێ .

**مەسەلەی سێیەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ ، واتە : ئا ئەو جەنگی بەدرەتان بەم شێوەیە بوو ، وە بێگومان خوا بێهێزکەری پیلانی کافرەکانە .

(وهن) واتە : بێهێزیی[1] ، بێهێزیی لە ڕووی ڕواڵەتییو لە ڕووی پەنهانییەوە ، کە لێرەدا دەفەرموێ : خوا پیلانو فێڵی کافرەکان بێهێزو پێز دەکات ، بۆچی نەیفەرمووە : لابەری پیلانی کافرەکانە (مُزِيلُ كَيدَ الكافرين) ؟ چونکە فێڵو پیلانی کافرەکان بوونی دەمێنێ ، بەڵام دەبێ بێهێزو پێز بکرێ ، وەك جاری دیکەش گوتوومانە ، ئەگەر تەماشای قورئان بکەین ، هەرگیز قسەیەکی عاطیفیی لە قورئاندا نابینی ، چونکە خوای کاربەجێ ئەم فەرمایشتانەی فەرمووە ، ئەگەر ئێمە ئەو قسەیەمان گوتبایە ، دەمانگوت : خوا داری بەسەر بەردیەوە ناهێڵێ ! بەڵام خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ : پیلانی کافران بێهێز دەکات ، یان لە شوێنێکی دی خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾البقـرة ، واتە : زۆربەیان بڕوا ناهێنن . نافەرموێ : هەموویان ، هەروەها کە دەربارەی جوولەکەو ،

---

١) وهَنَ : ضَعُفَ في الأمر والعَمَلِ والبَدَنِ . المعجم الوسيط ، ص ، ١٠٦٠ .

نەصرانیی ، هاوبەش بۆ خوادانەرەکان ، یان خەڵك بە گشتی دەدوێ ، دەفەرموێ : هەندێکیان ، یان زۆربەیان ، یان کەمێکیان نابێ ، هەرگیز تەعبیرێك بەکارناهێنێ کە لەگەڵ واقیعدا دژ بوەستێ ، وە ئەوە جیاوازیی فەرمایشتی خوایە ، لەگەڵ فەرمایشتی مرۆڤەکان دا ، مرۆڤ کە قسە دەکات زۆر جاران عاطیفە ڕەگەڵ قسەکانیان دەخەن ، زێدەڕۆیی تێدا دەکەن ، وە سەرەنجام لەگەڵ واقیعدا تێکدەگیرێ ، بەڵام هەرگیز وشەیەکی وا لە قورئاندا نابینی .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيۡدِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ ، لێرەدا خوا بە گشتی دەربارەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانی قوڕەیش فەرمایشتی فەرمووە ، بەڵام تەماشا بکەن ! یەکێك لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان ئەوەیە کە لێرەدا ناوی قوڕەیشی نەهێناوە ، واتە : نە ناوی خەڵکی مەککە ، ناوی قوڕەیش ، وە نە ناوی سەرکردە کافرەکانی قوڕەیش ناهێنێ ، بۆچی ؟ چونکە ئەگەر ئەو تەعبیرانەی بەکارهێنابان ، کە تایبەت بوون بە ژینگەو کاتێکی دیارییکراوەوە ، هەر بە کەڵکی ئەو کاتە دەهات ، وەك هەندێ لە کۆلکە عەلمانییەکان دەڵێن : قورئان لە مێژوودا بووەو پەیوەندیی بە مێژووو کاتێکی دیارییکراوەوە هەیە ، نابێ بە تەمابین ژیانی ئێستامان بۆ ڕێك بخات ! بەڵام نەخێر ، ئەو خوایەی قورئانی فەرمووە ، ئەو کاتەی دیوەو ، ئێستاشی لەبەرچاو بووەو ، دوای ئێستاشی لەبەرچاو بووە ، بەڵێ تەعبیرەکانی قورئان زۆر وردو جێی سەرنجن ، بۆ وێنە : لێرەدا دەفەرموێ :

﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيۡدِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ ، کەواتە : بە درێژایی مێژوو ، وە هەتا دنیا کۆتایی دێ ، ئەهلی کوفر پیلان بگێڕن ، بەرانبەر ئەهلی ئیمان ، خوا سەرپەرشتیی ئیمانداران دەکات ، بە ئەندازەی ئەوە کە ئیمانیان لە دڵدایە ، وە پیلانەکانیان بێهێزو پێز دەکات ، ئەوە یاسایەکی خوایە لە ژیانی بەشەردا ، بەڵام بێگومان خوای دادگەر بە ئەندازەی ڕاستیی و ڕەسەنیی ئیمانی ئیمانداران ، سەرپەرشتییان دەکاو سەریان دەخات ، نەك لە گۆترەوە هەر کەسێك گوتی : مسوڵمانم ، خوا بۆی بکەوێتە کار ، وە پاشان لە سیاق و لە کاتی خۆیدا ، وە بە مەرجی خۆی ، خوای پەروەردگار لەگەڵ ئیمانداراندا دەبێ و ، پیلان و فێڵی دوژمنەکانیان بۆ دەکاتە نەخشی سەر ئاوو هەڵیدەوەشێنێتەوە .

**مەسەلەی چوارەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُواْ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ، پێشتریش باسمان کرد : دەگونجێ مەبەست لە (فتح) یارمەتیدانو سەرخستن بێ ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی دادوەریی کردن بێ ، بۆیە هەندێك گوتوویان کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُواْ ﴾ ، یانی : (إذ تستنصروا) ئەگەر داوای سەرکەوتنو یارمەتیی دەکەن ، ئەوە سەرکەوتنو یارمەتییتان بۆ هات ، دیارە لێرەدا ڕووی دواندن لە کافرەکانە ، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان ، وەك پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا باسمان کرد ، ئەبو جەهل بوو ، کە گوتی : (اللَّهُمَ أَيُّنَا كانَ أَقْطَعَ لِلرَّحِمِ ، وَآتى لِمَا لا يُعْرَفُ ، فَافْتَحِ الغدَاةَ).

واتە : ئەی خوایە ! کاممان زیاتر پەیوەندیی خزمایەتیی پچڕاندوە ، وە کاممان شتێکی هێناوە کە زیاتر نەناسراوە ، بەیانی تۆ دادوەریی لە دژ بکە ، {یان : هاوکاریی بنێرە بۆ تێشکانی !}

خواش ﷻ لە وەڵامی ئەوەدا فەرمووی : ئەگەر داوای یارمەتیی دەکەن ، {یاخود داوای سەرخستنو دادوەریی} دەکەن ، ئەوە سەرخستن ، {یاخود دادوەریی کردن} تان بۆ هات ، وە دەشگونجێ ڕووی دواندن لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بێ ، چونکە وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد : پێغەمبەر ﷺ هاواری کردە خواو پاڕایەوە ، وەك خوای پەروەردگار بیریان دەخاتەوە ، دەفەرموێ : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّى مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴾ ، وە یاد بکەنەوە ! کاتێك هاوارتان لە پەروەردگارتان دەبەست ، ئەویش وەڵامی دانەوە : کە من پشتیگرییتان دەکەم ، بە هەزار لە فریشتانی بە دوای خۆخەر .

بەلاّم زیاتر وا پێدەچێ ڕووی دواندن لە کافرەکان بێ ، چونکە دوایش دەفەرموێ : ﴿ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾ ، ئەگەر دەست هەڵبگرن ، بۆ ئێوە باشترە ، واتە : جارێکی دیکە بەربەرەکانێی ئیسلام‌و مسوڵمانان نەکەن .

وە هەندێك لە زانایان وشەی ﴿ تَسۡتَفۡتِحُواْ ﴾ ، بە (تستقضوا) لێکدەدەنەوە ، واتە : ئەگەر داوای دادوەریی دەکەن ، کە لە سووڕەتی (الأعراف)دا لەسەر زاری پێغەمبەر شوعەیب سەلامی خوای لێ بێ ، وشەی (فتح) بەو مانایە هاتوە ، وەك دەفەرموێ : ﴿ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ٨٩ ﴾، واتە : پەروەردگارمان ! بە هەق دادوەریی لە نێوان ئێمەو گەلەکەمان دا بکە ، وە تۆ چاکترین دادوەریی .

کە مەبەست لە (فتح) لێرەدا بە تەئکید دادوەریی یە ، چونکە شوعەیب‌و ئەو ئیماندارانەی لەگەڵی بوون ، ڕووبەڕووی ئەو کافرانەی سەردەمی خۆیان بوونەوەو ئەو پاڕانەوەیان کردوە ، کەواتە : (فاتح) یان (فتّاح) بە مانای قازیی‌و دادوەر دێ ، وە دەشگونجێ مەبەست لە﴿ إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُ ﴾، توانج بێ ، واتە : ئەی کافرەکان ! ئێوە داوای سەرخستن‌و یارمەتییتان دەکرد ، ئەوە هات .

وە دەشگونجێ مانایەکەی هەر ئەوە بێ ، کە ئەوە یارمەتی هات ، بەلاّم بۆ بەرانبەرەکەتان ، نەك بۆ ئێوە ، چونکە ئەوان لەسەر هەقن‌و ، ئێوە لەسەر ناهەقن .

کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾ ، واتە : وە ئەگەر وازبێنن ، بۆ ئێوە باشترە ، هەڵبەتە هەر خوا ئاوایە ، ئەگەرنا بەشەر هەرگیز ناتوانێ بەو شێوەیە بێ ، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوان بەو سەرسەختییە دژایەتیی مسوڵمانانیان کردوە ، کەچی دوای ئەوەش خوای بە بەزەیی پێیان دەفەرموێ : وە ئەگەر واز بێنن ، ئەوە بۆ ئێوە باشترە ، وە دەرگای پاڕانەوەو تۆبەیان بۆ دەکاتەوە .

بەڵام دوایی هەڕەشەیان لێدەکات ، ئەگەر هەر بەردەوام بن ، لەسەر ئەو سەرسەختییو دژایەتیکردنەی مسوڵمانان ، دەفەرموێ : ﴿ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدْ ﴾ ، واتە : ئەگەر جارێکی دی بگەڕێنەوە بۆ دژایەتیی ئیسلامو مسوڵمانانو سەنگەریان لێ بگرن ، ئەوە ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ هاوکاریی مسوڵمانانو یارمەتی دانیان ، دوایی خوای پەروەردگار نائومێدیان دەکات ، دەفەرموێ : ﴿ وَلَن تُغۡنِيَ عَنكُمۡ فِئَتُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَوۡ كَثُرَتۡ ﴾ ، وە کۆمەڵەکەتان هەرچەندە زۆربێ ، هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ ، کەواتە : بە زۆرییتان فریو مەخۆن ، زۆرییتان دادتان نادات ، مادام لە بەرانبەر هێزێکدا ، کە پشتی بە خوا بەستوە ، وەستاون .

لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ ، وە بێگومان خوا لەگەڵ بڕواداران دایە ، ئەمەش یاسایەکی گشتییە ، خوا دەیخاتە ڕوو ، کە خوای کارزان تەنیا لەگەڵ هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺدا نەبووە لە جەنگی بەدردا ، بەڵکو خوا ﷻ بە گشتی لەگەڵ بڕواداران دایە ، وەك گوتم : بە ئەندازەی ئەوەی بڕواداران پابەندی شەریعەتی خوا دەبنو ، ملکەچ دەبن بۆ خوا ، خوای پەروەردگار لەگەڵیاندا دەبێ .

ئنجا ئەگەر سەرنج بدەین خوای زاناو توانا ، پێنج ڕاستیی گرنگی لەم ئایەتەدا خستوونە ڕوو :

١) ئەگەر داوای سەرخستن دەکەن ، یان داوای یارمەتی دەکەن ، ئەوە خوا بۆی ناردن .

٢) ئەگەر واز بێنن ، بۆ ئێوە باشترە .

٣) ئەگەر گەڕانەوە بۆ دژایەتیی مسوڵمانان ، ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ هاوکاریی مسوڵمانان .

٤) ئەگەر هێزیشتان زۆر بێ ، دڵنیابن هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ .

٥) وە دڵنیابن ، کە خوا لەگەڵ بڕواداران دایە .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَأَنتُمۡ تَسۡمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ ، خوا ﷻ بۆ جاری دووەم لەم سوورەتەدا بانگی بڕواداران دەکات ، دەفەرموێ : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ، وە پشتی تێمەکەن ، لە حاڵێکدا کە ئێوە دەبیستن ، {واتە : دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ چیتان پێ دەفەرموێ ، کە فەرمانی دەبیستن ، خۆتانی لێ کەڕ مەکەن} ، وە وەك ئەوانە مەبن ، کە گوتیان : ئەوە بیستمان ، کەچی نەشیان دەبیست .

توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە : ئایا لێرەدا مەبەست : جوولەکەکانن ، یان مەبەست : مونافیقەکانن ؟ یان موشریکەکانن ؟

لە ڕاستییدا دەگونجێ مەبەست پێی هەموویان بێ ، وە مەبەست هەر کەسێکی دیکەش بێ ، کە دەزانێ خوا ﷻ چی فەرمووەو شەریعەتی خوا چی دەڵێ ، کەچی پشتیشی تێدەکاتو گوێڕایەڵی نابێ .

دیارە وشەی : ﴿ سَمِعۡنَا ﴾ ، واتە : (اسْتَجَبْنَا) ، واتە : وەڵاممان دایەوە ، یاخود (سَمِعْنَا سَمْعَ قُبُولٍ) ، واتە : بیستمان بە بیستنێك کە قبووڵمان کرد ، لە حاڵێکیشدا کە قبووڵیان نەکردووە ، پێوەی پابەند نەبوون ، وەك ئەو زۆرە مسوڵمانانەی کە دەڵێن : بەڵێ ، ئێمەش مسوڵمانین ، قبووڵ ناکەین کەس خۆی لە ئێمە بە مسوڵمانتر بزانێ ! بەڵام تەماشا دەکەی هیچ شتێکی پێوە نابینرێ کە بیسەلمێنێ ئەوە مسوڵمانە ، وا دەزانێ مسوڵمانەتیی تەنیا بە لاف لێدانی ڕووتە ، بەڵام مسوڵمانەتیی بەرلەوەی قسە بێ ، کردەوەو ئاکارە ، وەك حەسەنی بەسرایی لەوبارەوە قسەیەکی جوانی هەیە ، دەڵێ : (لَيْسَ الإِيْمَانُ بِالتَّمَنِّي ولاَ بِالتَّحَلِّي ، ولَكِن هُوَ مَا وَقَرَ فِي القَلْبِ وَصَدَّقَهُ العَمَل) .

واتە : ئیمان بە خۆزگە خواستنو بە قسەی شیرین نیە ، بەڵکو ئەوەیە کە لە دڵ دا جێگیر دەبێو کردەوەش ئینسان دەیچەسپێنێ .

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : ﴿الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلاَةُ ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ ، برقم : (٣٠٣٩٦) ، وَأَحْمَد ، برقم : (٢٢٩٨٧) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (٢٦٢١) ، وَقَالَ : حَسَن صَحِيحٌ ، وَالنَّسائِيُّ ، برقم : (٤٦٣) ، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (١٠٧٩) ، وَابْنُ حِبانَ ، برقم : (١٤٥٤) ، وَالحَاكِمُ ، برقم : (١١) ، وَقَالَ : صَحِيحُ الإِسناد ، وَالبَيْهَقِيُّ ، برقم : (٦٢٩١) ، وَالدَّيْلَمِيُّ ، برقم : (٤٢٥٧) ، وَعَبْدُ الله بْن أَحْمَد في (السنة) برقم : (٧٦٩) ، قَالَ المَنَّاوِيّ ، قال العراقي في أماليه : حَدِيثٌ صَحِيحٌ ، وَصَحَّحَهُ الأَلباني} .

واتە : ئەو پەیمانەی لە نێوانی ئێمەو کافرەکاندا هەیە ، نوێژە ، هەر کەسێك نوێژ نەکات ، ئەوە بێبڕوایە .

بەڵگەت چییە کە تۆ خوات لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ ؟ لێی دەترسی ؟ شەرمی لێ دەکەی ؟ پشتی پێ دەبەستی ؟ لە حاڵێکدا کە بانگ بێژ لە ڕۆژو شەوێکدا پێنج جاران بانگت دەکات ، جارێك وەڵامی نادەیتەوە ، چ بەڵگەیەکت بە دەستەوەیە کە تۆ خوات زۆر لەلا بەرێزەو ، خۆشت دەوێ و ، شەرمی لێ دەکەی و ، لێی دەترسێی ؟ لە ڕاستییدا کەسێك نوێژ نەکات ، هیچ بەڵگایەکی بە دەستەوە نیە ، بۆ ئەوەی ئەو بانگەشانە بکات .

**مەسەلەی شەشەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٢٢﴾﴾ ، بێگومان خراپترین پێڕۆ ، خراپترین ژیاندار کە لەسەر زەوی دەڕۆن ، ئەو کەڕو لاڵانەن کە نافامن .

کە دیارە مەبەست پێی بێبڕوایانە ، لە شوێنی دیکە ــ وەك باسی دەکەین ــ بە کەڕو کوێر وەسف کردوون ، وە بەوە کە نافامن .

وشەی (دابة) دەڵێ : (كُلّ مَاش عَلَى الأَرْض) هەر شتێك کە پێڕۆبێ و لەسەر زەوی بڕوات ، دەگوترێ : (دبّ يدبُّ) واتە : پێی بە زەوی دادا ، عەرەب پەندێکیان هەیە ، دەڵێن : (فُلانٌ أَكْذَبُ مَنْ دبَّ وَدَرَج : أي أَكْذَبُ الأَحْياء وَالأَمْوَات)[1] .

---

١) مختار الصحّاح ، ص ، ١٩٧ .

واتە : فلان کەس درۆزنترین کەسێکە کە پێی بە زەویدا کوتاوەو ، لە زەوی خراوە ، (دَرَجَ) واتە : خراوەتە نێو زەوییەوە ، کەواتە : (دَبَّ) واتە : هەر کەسێك کە بە زەویدا دەڕوات ، هەر شتێك کە پێی لە زەوی دەنێ ، ئنجا مرۆڤە ، ئاژەڵە ، دڕندەیە ، هەرچی هەیە .

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ ، بڵێ : بۆچی خوای کاربەجێ ، بێبڕوایان بە کەڕو لاڵو نەفام وەسف دەکات ، دوایش بە خراپترین ژیاندار وەسفیان دەکات ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە ، ئەوانە ئەو هێزانەی خوا پێی داون ، کە بریتین لە هێزی بیستنو بینینو عەقڵ ، لە کاریان خستوون ، هەقیان پێ نابیستنو ، نابینن و ، نافامن ، پاشان ئەوانە شێوە ژیانێك دەبەنە سەر ، وەك ژیانی ئاژەڵ وایە ، وەك خوای ڕاستبێژ دەربارەیان دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾﴾ محمد ، واتە : ئەوانەی بێبڕوان ، ڕادەبوێرنو دەخۆن ، وەك چۆن ئاژەڵ دەخواو دەلەوەڕێ ، وە ئاگریش جێگاو ڕێگای حەوانەوەیانە .

وە لە سوورەتی (الأعراف)دا بۆمان ڕوون دەکاتەوە ، کە بۆچی بێبڕوایان ، بە خراپتر لە ئاژەڵ دادەنرێن ؟ دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾﴾ ، واتە : وە بە دڵنیایی زۆرێك لە جندو مرۆڤمان بۆ دۆزەخ ئامادە کردووە دروستمان کردوە ، دیارە لە سۆنگەی ئەوەوە کە بۆ خۆیان ئەو ڕێیەیان هەڵبژاردوە ، دوایی خوای زاناو شارەزا ڕوونی دەکاتەوە ، دەفەرموێ : ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ﴾ ، ئەوانە دڵیان هەن ، بە دڵەکانیان تێناگەن ، چاویان هەن بە چاوەکانیان نابینن ، گوێیان هەن بە

گوێیەکانیان نابیستن ، کە ئەمە ڕوونکردنەوەی هۆکاری گوناهو گومڕابوونو ، دواتر سزادرانیانە .

کەواتە : بۆیە خوای کارزان بۆ دۆزەخی دروست کردوون ، چونکە بە دڵەکانیان لە هەق تێنەگەیشتوون ، وە بە چاوەکانیان هەقیان نەبینیوە ، وە بە گوێیەکانیان هەقیان نەبیستوە ، بەڵکو ، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ﴾، ئەوانە وەك ئاژەڵن ، نا ، بەڵکو لە ئاژەڵیش گومڕاترن ، چونکە کەسێك خۆی وەك ئاژەڵ لێبکات ، لە حاڵێکدا کە بشتوانێ ئاژەڵ نەبێ ، دووچاری سزای خوا دەبێ ، ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ئاژەڵ نەبێ ، بۆیەش دەفەرمویٚ :

﴿بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ﴾ ، بەڵکو لە ئاژەڵ گومڕاتریشن ، چونکە وەك گوتم : مەڕو بزن ناتوانن مەڕو بزن نەبن ، گاو مانگا ناتوانن گاو مانگا نەبن ، حوشتر ، بە هەمان شێوە ، هەروەها دڕندەکان : شێرو گورگو پڵنگو چەقەڵو ڕێوی ، ناتوانن وەك ئەو سیفەتانەی خوا ﷻ پێیداون ، ئاوا نەبن ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ وەك گورگو چەقەڵو بەرازو مەیموونو گوێدرێژو ... هتد نەبێ ، دەتوانێ مرۆڤ بێ ، کەواتە : کاتێك بە ویستی خۆی سیفەتی ئاژەڵەکان لە خۆیدا پەیدا بکات ، سیفەتی دڕندان لە خۆی پەیدا بکات ، مانای وایە : لەوان خراپترە !

ئنجا بەڕاستی کاتێك ئینسان لە بەرنامەی خوا لادەداتو لە خوا دوور دەکەوێتەوە ، خراپی بەسەر دێ ، چونکە هەر ئەوەندە نیە کە تەنیا سیفەتی وەك دڕندەیەكو ئاژەڵێك بێ ، بەڵکو سیفەتی خراپی کۆمەڵێك دڕندەو ئاژەڵ لە خۆیدا دێنێتە دی :

لە ئارەزوو پەرستیی دا ، وەك بەرازی لێدێ ، لە لاساییکردنەوەی خەڵك دا ، وەك مەیموونی لێدێ ، لە نەفامیی دا ، وەك کەری لێدێ ، لە پیسیی دا ، وەك سەگی لێدێ ، لە خۆ ڕازاندنەوەدا ، کە هەر خەریکی ڕواڵەتی خۆی دەبێ ، وەك تاوسی لێدێ ، لە زۆر خۆرییدا ، وەك گاو مانگای لێدێ ، مانای وایە مرۆڤ کاتێك لە بەرنامەی خوادا لادەدات ، لە یەك کاتدا سیفەتی کۆمەڵێك دڕندەو ئاژەڵ لە خۆیدا دێنێتە دی ، کە بێگومان بۆ ئەوان سیفەتی خراپ نینو ،

سیفەتێکی سروشتیی خۆیانن ، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ : ئەوانە وەك ئاژەڵن ، بەڵکو گومراتریشن لەوان .

دوایی کە دەفەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾ ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ، کە : بێئاگایی ، کە بەرهەمی پەکخستنی عەقڵو گوێو چاویانە ، مایەی ماڵ وێرانییانەو ، بێئاگاییەکەیان ، بۆتە هۆی ئەو سەرەنجامە شوومەیان ، کە دیارە خۆیان بە ویستی ئازادانەی خۆیان ، خۆیان بێئاگا کردوە ، لەو شتانەی کە دەبوو لێیان بێئاگا نەبن : لەوە بێئاگا نەبن ، کە کێ دروستی کردوون ؟ بۆچی دروستی کردوون ؟ لە کوێوە هاتوونو ، بۆ کوێ دەچن ؟ دەبێ چۆن بژین ؟ مەبەست لە : ﴿ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾ ، ئەوەیە ، ئەگەرنا خوای زانای توانا لەبارەی کافرانەوە ، دەفەرموێ : ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ۝٧ ﴾ الروم ، ڕواڵەتێ لە ژیانی دنیا دەزانن ، بەڵام لە دوارۆژ بێئاگان ، لەو چارەنووسەی چاوەڕێیان دەکات ، بێئاگان ، لەو ئەرکەی کە پێیان سپێردراوە ، بێئاگان ، لەو حیکمەتەی کە بۆی دروست کراون ، بێ خەبەرن .

وە کاتێك ئینسان نەزانێ لە کوێیەوە هاتوە ؟ کێ هێناویەتەدی ؟ بۆچی هاتوە ؟ بۆ کوێ دەچێ ؟ هەرچەندە زانیاریی جوزئیشی هەبێ بە شتەکانی دەوروبەر ، ئەوە قەرەبووی ئەو نەفامییو بێئاگاییەی لە دوارۆژی ، بۆ ناکاتەوە .

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی** : کە خوا ﷻ هەر باسی بێبڕوایەکان دەکات ، دەفەرموێ : ﴿ وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ﴾ ، وە ئەگەر خوا چاکەی تێدا زانیبان {واتە : چاکەی پێوە شك بردبان} ، پێی دەبیستاندن ، وە ئەگەر بە زۆریش پێی بیستاندبان {لەبەر ئەوەی کە خۆیان نایانەوێ ، وە خوای دادگەریش یاسای وایە لەسەر زەوی ، کە زۆر لە مرۆڤەکان نەکاتو ، ناچاریان نەکات} سەرەنجام بەو ویستە جوزئییەی

كە پێیان دراوە ، هەر دەیانتوانی ئەوەی كە خوا بە زۆریش پێی بیستاندوون ، دیسان ڕەفزی بكەن .

چونكە خوا ئەو ئیرادەی پێداون ، بۆیە دەفەرموێ : ﴿وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوْا وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ ، ئەگەر پێی بیستاندبان ، ئەوە وەك حاڵەتی جەستەیی ، پشتیان تێدەكرد ، وە بە دڵیش ، لایان دەدا ، چونكە (تولّي) زیاتر بۆ حاڵەتی جەستەییە ، وە (إعراض) بۆ حاڵەتی فیكریی‌و دەروونییە ، واتە : هەم بە ڕواڵەت‌و هەم لە ڕووی دەروونییەوە ، پشتیان لە هەق دەكرد .

جاری وایە مرۆڤ : بەرنامەیەك ، كەسێك بە ڕاستیش دەزانێ ، بەڵام هەزری خۆی ناخاتە سەر ، خوا توانای پێداوە كە : ئەو بەرنامەیە وەرنەگرێ ، وە ئەو كەسە چاكە ببوغزێنێ ، وە ئەو هەقە قبووڵ نەكات ، بۆچی خوا ئەو توانایەی داوەتێ ؟ تاكو بگونجێ تاقیبكرێتەوە ، تاكو بتوانێ ڕاست بڕواو چەوت بڕوا ، تاكو بتوانێ هەق وەربگرێ‌و وەرنەگرێ .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئـەم دەرسـەمان لە شـەش (٦) ئـایەت پێكدێ ، ئـایەتـەكـانی : (٢٤ تـا ٢٩) لـەم شـەش ئـایەتـەدا خـوای پەروەردگـار سێ جـاران ڕستـەی : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ ، ئـەی ئـەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! دووبـارە دەكـاتـەوە ، كـە لـە كۆی ئـەم سـووڕەتـەدا شـەش جار ڕستـەی : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، هـاتوە ، لە دوای جاری یەكـەمیـان ، ـ لەم دەرسـەمان دا ـ خـوا فـەرمان بـە بـڕواداران دەكـات : كـە بـە دەم بـانگی خـوا ﷻ ، وە پێغـەمبـەرەكـەیەوە ﷺ بچـن ، كاتێــك بـۆ شـتێك بـانگیـان دەكـەن ، كـە مایـەی ژیـانیـانـە ، وە بشـزانن كـە جاری وایە ، خـوا پـەردە دەخاتـە نێوان مرۆڤ و دڵیـەوە !

پاشـان پێیـان دەفـەرموێ : خۆیـان لـە بـەڵایەك بپـارێزن ، كـە تـەنیـا تووشـی ستـەمكاران نایـەت .

وە دواییش ئـەوەیـان دەخاتـەوە یـاد ، كـە كـاتی خـۆی كـەم بـوونو ترسـیـان هـەبوو كـافران بیـانرفێنـن ! بـەڵام خـوا پەنـای دانو پشـتی گرتنو ڕۆزیی بـاشـی پێدان .

پاشـان لـە دوای جـاری دووەم ، پێیـان دەفـەرموێ : كـە ناپاكـیی بـەرانبـەر خـواو پێغـەمبـەری خـوا ﷺ و سـپاردەكـانیـان نـەكـەن ، وە بشـزانن كـە سامانو منداڵەكـانیـان مایەی تاقیكردنـەوەیـانن .

وە لـە دوای جـاری سـێیەمیش ، هـەواڵیـان پێـدەدا كـە بـە هـۆی پارێزكـاریی یـەوە ، فورقـانیـان بۆ پەیدا دەبیو ، خراپەو گوناهـەكـانیـان دەسڕێنـەوە .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ
وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾
وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ
شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٥﴾ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ
أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ
تَشۡكُرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ
تَعۡلَمُونَ ﴿٢٧﴾ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ
عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ
عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾ .

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی ئـەوانــەی بڕواتـان هێنـاوە ! وەڵامـی خــواو پێغـەمبــەر بدەنــەوە ، هـەر کـات بـانگیـان کردن ، بۆ ئـەوەی کـە مایـەی ژیـان (ی ڕاسـتـەقینـە)تانــە ، وە بـزانن کـە خـوا پەردە دەخاتـە نێوان مرۆڤ و دڵـیەوە ، وە (بزانــن) کـە بـۆ لای وی کـۆدەکرێنــەوە (٢٤) وە خۆتــان لــە بــەڵایەك بپــارێزن ، کــە تـەنیــا تووشـی ستـەمکارەکـانتان نایــەت ، وە بـزانن کـە خـوا سـزای تـونـدە (٢٥) وە (یـاد بکـەنــەوە) کاتێـك کـەمو چـەوسێنـراوە بـوون ، لە زەویـدا ، دەترسـان کە خەڵك بتانڕفێنـێ ، بـەڵام حـاواندنیەوەو بـە یـارمەتی خـۆی بـەهێــزی کـردنو ، لـە خـواردنــە خـۆشو بــە سـوودەکـان بـژیوی دان ، بـەڵکـو سـوپاسـگوزاریـی بکـەن (٢٦) ئـەی ئـەوانــەی بڕواتـان هێنـاوە ! ناپاکـیی (پەیمانشـکـێنی) لەگــەڵ خـــواو پێغـەمبــەردا مەکــەنو ، ناپــاکیی لــە سپاردەکانتــاندا مەکــەن ، کــە دەشـــزانن (ئــەوە ناپاکییــەو چــەند خراپــە) ! (٢٧) وە بــزانن کــە سامانـەکانتــانو منداڵـەکـانتـان مایـەی تاقیـکردنـەوەتـانن ، وە (بشـــزانن) کــە خـــوا پاداشـــتی مەزنــی لــەلایــە (٢٨) ئـــەی ئەوانــەی بڕواتــان هێنـــاوە ! ئـــەگەر پارێـــز لــە خـــوا بکــەن جیـاکـەرەوە (ی هـەقو نـاهـەق)تــان پــێ دەدات ، وە خراپەکـانتــان لــێ دەسڕێتــەوەو لێتـان دەبـووری ، وە خـوا خـاوەنی بـەخشـشـی مەزنـە (٢٩)) .

# شیکردنـەوەی هـەندێك لە وشــەكان

(لِمَا يُحْيِيكُمْ) : واتــه : بـۆ شـتێك كـه پێـی زینـدوو دەبنـەوە ، شـتێك كـه پێـی دەژیـن ، وە مەبـەست ژیـانی مەعنەوییـە ، ژیـانێك كـه بـه هۆشیـاریی‌و پارێزكـارییەوە ، مرۆڤـ دەیباتـه سـەر ، (الحَيَـاةُ : ضِـدُّ الـمَوْت) ، وە (حَيَـاة) دژی (مَوْت)ە ، (حَيَاة) واتـه : ژیـان ، وە (مَـوْت) واتـه : مردن .

(يَحُولُ) : واتـه : دەبێتـه پەردە ، (أَصْـلُ الحَـوْلِ : تَغَـيُّـرُ الشيءِ وَانْفِصالُهُ عَنْ غَيْرِهِ ، وَبـاعْتِبـارِ الإِنْفِصالِ ، قِيلَ : حَـالَ بَيْنِي وَبَيْنَـكَ كَذَا) .

(حَـوْل) له ئـەسڵدا واتـه : گۆڕانی شـتێك ، وە جیابوونـەوەی له شـتێكی دیكـه ، جا لـەو ڕووەوە كـه بریتیـه له جیابوونـەوەی شـتێك لـه شـتێك ، گوتراوە : (حَـالَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ كَذَا) ، واتـه : ئـەو شـتـه بووە پـەردە له نێوانی مـن‌و تـۆدا .

(فِتْـنَةً) : واتـه : تاقیكردنــەوە ، (أَصْـلُ الفَـتْنِ : إِدْخَالُ الذَّهَـبِ النَّـار لِتَظْهَرَ جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَاءَتِهِ ، والفِتَنة بِمَعْنَى الإختبارِ وَ البَـلاءِ و العَـذَابِ لأَنَّهَا سَبَبُهُ) .

واتــه : ئـەسڵی وشــەی (فِتنـة) لـه (فَـتْن)ەوە هـاتوە (فَـتْن)یـش ئـەوەیـه زێـڕ بخـەیە نێـو ئـاگر ، بۆ ئـەوەی چاك‌و خراپـی لـه یـەك جیابێتـەوە ، وە هـەروەهـا وشەی (فِتْـنة) بـه مانای تاقیكردنـەوە دێ ، وە بـه مانـای بـەڵاو ، بـه مانـای ئـازارو ئـەشكـەنجـەش دێ ، چونكـه بـەهـۆی ئـەوەوە پەیـدا دەبـێ ، واتــه : ئـەو ئـازارو ئـەشـكـەنجـەیە ، بـەهـۆی ئـەو تاقی كرانـەوەوە پەیدا دەبـێ .

(يَتَخَطَّفَكُمْ) : (الخَطْفُ وَالإختِطافُ : هُوَ الإخْتِلاَسُ بِسُرْعَةٍ) .

دەگـوترێ : (خَطِفَ يَخْطَفُ) وە دەگـوترێ : (خَطَفَ يَخْطَفُ) ، واتــه : شـتێك بـه خێرایی بڕفێنـی ، یـان بیـدزیـی .

(فَـَٔاوَىٰكُمۡ ) : (أوَى إِلَى كَذَا : انْضَمَّ إِلَيْهِ) ، لە زمانی عەرەبی دا دەگوترێ : (أوَى إِلَى كَذَا) واتە : پاڵیدایە لای .

(وَأَيَّدَكُم ) : (قوَّاكُمْ وَشَدَّدَكُمْ وَأَكْثَرَ تَأييدَكُمْ) .

واتە : بەهێزی کردن ، توندی کردن ، وە زۆر پشتی گرتن .

(لَا تَخُونُواْ ) : (الخيانة والنِّفَاقُ : وَاحِدٌ ، إِلاَّ أنَّ الخيانة تُقَالُ اعْتِبَاراً بالعَهْدِ وَالأمَانة ، وَالنِّفَاقُ يُقَالُ اعْتِبَاراً بالدِّين ، ثُمَّ يَتَدَاخَلاَن ، فَالخِيانة مُخَالَفة الحَقِّ بنَقْضِ العَهْدِ فِي السِّرِّ ، وَنَقِيضُ الخِيانة : الأَمَانة) .

واتە : وشەی (خِيانة و نِفَاق) وەك یەكن و یەك شتن ، ئەوەندە هەیە خیانەت لە بواری پەیمان و سپاردەدا بەكاردێ ، (وەك ئەوەی كەسێك ناپاكی دەكات لەگەڵ پەیمان و ئەمانەتدا) بەڵام نیفاق ، لە ڕووی دینداریی‌یەوە دەگوترێ ، (وەك كەسێك خۆی بە مسوڵمان پێشان بداو مسوڵمانیش نەبێ) ، دوایی دەچنە نێو یەكدیش ، چونكە (خِيانة) بریتیە لە پێچەوانەی هەق ، بەوە كە پەیمان بشكێنی ، ئنجا بە ئاشكرا ، یان بە پەنهانیی ، وە پێچەوانەی (خِيانة) بریتیە لە (أَمَانة) .

(أَمَـٰنَـٰتِكُمۡ ) : (أَمَانَات) كۆی (أَمَانة)یە ، (الأَمْنُ وَالأَمَانُ وَالأَمَانة : اسْمٌ لِلْحَالَةِ أَوْ لِمَا يُؤْمَنُ عَلَيْهِ الإنْسان) .

وشەی (أَمْن ، أَمَان ، أَمَانة) ناوە بۆ حاڵەتێك ، یاخود ناوە بۆ هەر شتێك ، كە ئینسان لەسەری دەكرێتە ئەمیندارو پێی دەسپێردرێ .

(إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ ) : زۆرجار وشەی (تقوى)مان پێناسە كردوە ، لە ئەسڵدا وشەی (تقوى) لە (وقاية)وە هاتوە ، دەڵێ : (الوِقَايَةُ : حِفْظُ الشيء مِمَّا يُؤْذيه ويضرّه) .

(وقـاية) بريتيه لەوەی شـتێك بپارێزی له شـتێكی دی ، كه ئازاری پێدەگەیەنـێ ، يـان زیـانی پێدەگـەیەنـێ .

(فُرۡقَانٗا ) : واتـه : جیاكـەرەوە ، ئـەویش لـه (فَرْق)ەوە هـاتوە ، (الفَـرْقُ يُقـارِبُ الفلْـقَ ، والفُرْقَان : أَبـلَـغَ مِنَ الفرْقِ ، لأنـهُ يُسْـتَعملُ فِي الفَـرْق بَيْـنَ الحـَقِّ والبـاطِـل) .

واتـه : (فُرْقَـان) له (فَرْق)ەوە هـاتوە ، ئـەویش وەك (فَلْـق) وایـه ، بـەڵام (فَلْـق) واتــه : قڵـیشـاندنی شــتێكی ڕەق ، یــاخود دوو پارچـه كردنــی ، بــەڵام (فُرْقَـان) زێـدەیی زیــاتری تێدایــه ، چونكــه بـۆ لـه یـەك جیاكردنــەوەی هــەقو ناهــەق بـەكـاردێ .

(وَيُكَفِّرۡ) : (التَّكْفيـر لـشـيء: سَتْرُهُ وَتَغْطِيَتُهُ) .

(تَكْفيـر) بريتيــه لەوەی كـه شـتێك دابپـۆشـرێو پۆشـاكێكی بـەسـەردا بـدرێ .

(ذُو ٱلۡفَضۡـلِ ) : واتـه : خـاوەن بـەخشـش ، (الفَضْـلُ : الزِّيـادَةُ عَنِ الإقتِصـادِ) .

واتـه : بريتيـه له زێـده لـەو ئـەندازەيەی كـه بـەش دەكـات .

# هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە خوا ﷻ تێیدا دەفەرمووێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ ، ﴿قَالَ السدِيّ : أَنَّ قَوْمَاً كَانُوا يَسْمَعُونَ الحَدِيثَ مِنْ رَسولِ اللهِ ﷺ فَيُفْشونَهُ ، حَتَّى يَبْلُغَ المُشْرِكِين ، فَنَزَلَت هَذهِ الآيَة : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ﴿٢٧﴾ ﴾﴾[1].

واتە : سوددیی دەڵێ : کۆمەڵێك لە مسوڵمانان کە فەرمایشتێکیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبیست ، دوایی بڵاویان دەکردەوە ، تاکو دەگەیشتە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان (واتە : لەو جۆرە قسانەی کە نەدەبوو بگەنەوە بە بێبڕوایان ، لە بوارەکانی سیاسیی و ئابووریی و ئاساییش و شەڕو ئاشتیی و ... هتددا) ، لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوار .

شایانی باسە لە زۆربەی تەفسیرەکاندا لێرەدا باسی ڕووداوی (أبو لُبابة) کراوە ، کە یەکێکە لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی بەدردا ئەوی کردبووە سەرپەرشتیار لەجیاتی خۆی لە مەدینە ، وە لەگەڵ بەنی قوڕەیزەدا هاوپەیمان بووە ، ئنجا (بني قريظة) دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئابڵووقەی دان ، ئامادەبوون کە تەسلیم بن و خۆبەدەستەوە بدەن ، بە پێی حەکەمایەتیی سەعدی کوڕی موعاز خوا لێی ڕازی بێ ، بەنی قوڕەیزەش بە ئەبو لوبابەیان گوت : چی دەڵێی ؟ دەبێ چیمان بۆ بڕیار بدرێ ؟ دوای ئەوەی هەڵۆێستەکەیان دەربڕیبوو ، ئەویش ئاماژەی کرد بۆ گەردنی ، گوتی : سزاتان ئەوەیە لە گەردنتان دەدرێ ، کە ئەوەش نهێنییەك بوو ، چونکە ، دیار نەبوو جارێ سەعد چی دەڵێ ؟ وە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بڕیار دەدات ؟ وە نەدەبوووایە وا بڵێ ، ئنجا ئەبو لوبابە لە کەفارەتی ئەوەدا ، خۆی بە

[1]) زاد المسير في علم التفسير ، ص ٥٤٩ ، والطبري ، ج ١٣، ص ٤٨٣ .

کۆڵەگەیەکی مزگەوتەوە دەبەستێتەوەو ، دەڵێ : تاکو خوا لێم خۆشنەبێ ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆی نەمکاتەوە ، نە خواردن دەخۆم ، نە ئاوێ دەخۆمەوە ، نە دەخەوم .

بەڵام من پێم وایە نەدەبوو لێرەدا بیهێنن ، چونکە بە تەئکید ئەم ئایەتە بەو بۆنەوە نەهاتۆتە خوارێ ، وە ئەو ڕوودواوە ، دوو سێ ساڵ دوای جەنگی بەدر بووە ، جا هەندێ لە زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ، تەماشایان کردوە هەر هۆی هاتنە خوارەوەیەك ، لەگەڵ چ ئایەتێك دا گونجاوە ، لەگەڵ ئەو پەیوەستیان کردوە ، بێئەوەی ورد تەماشای بکەن ، ئاخر جارێ ئەو ڕوودواوە ڕووی نەدابوو ، تاکو ئەم ئایەتەی دەربارە بێتە خوار ، بەڵکو ئەو ڕوودواوە چەند ساڵێك دوای دابەزینی ئەو ئایەتانە ، ڕوویداوە ! ، بەڵێ جاری وایە ئایەتەکە ئەو ڕوودواوەش دەگرێتەوە ، بەڵام ئایەتەکە بەو بۆنەوە نەهاتۆتە خوارێ .

وە مەرجیش نیە هەموو جاری هاتنە خوارەوەی ئایەت ، هۆی تایبەتی هەبووبێ ، بۆ وێنە : ئەوەی ئێرە : دەگونجێ هەر خوای پەروەردگار ویستبی ئامۆژگاریی مسوڵمانان بکات ، بێئەوەی شتێك ڕوویدابێ ، کە دەفەرموێ : ناپاکیی مەکەن ، بەرانبەر خواو پێغەمبەری خوا ، وەك دوایی چەمكو واتاکەی ڕوون دەکەینەوە ، وە ئەو سپاردانەی کە لەلاتانن ناپاکییان پێ مەکەنو خیانەتیان لێ مەکەن ، واتە : بۆ تێگەیشتنمان لە هەر ئایەتێك ، پەکمان لەسەر ئەوە نەکەوتوە ، کە هۆی هاتنە خوارەوەی هەبێ ، وە دەبێ باش سەرنجی هۆی هاتنە خوارەوەکان بدرێ ، وەك گوتم : نابێ ئایەتێك کە لە ساڵی دووەمی کۆچییدا هاتۆتە خوار ، ببەسترێتەوە بە ڕووداوێکەوە ، کە لە جەنگی خەیبەر ، یان لە جەنگی بەنی قورەیزەدا ، کە سێ ساڵ دوای جەنگی بەدر ، ڕوویداوە ، واتە : ساڵی پێنجەمی کۆچیی !

# مانـای گشـتـی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ لەم سوورەتـەدا بۆ جـاری سـێیەم ، بـانگی بـڕواداران دەکـاتو دەفـەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ ، ئـەی ئـەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! وەڵامـی خـواو پێغـەمبـەر ﷺ بدەنـەوە ، هـەر کـاتێك بـانگیان کردن ، بۆ شتێك کە مایەی ژیانتانـە ، ﴿ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾ ، وە بزانـن کـە خـوا پـەردە دەخاتـە نێـوان مرۆڤ و دڵـیەوە ، وە بشزانن کـە ئێوە بۆ لای خـوا کۆدەکرێنـەوە .

لێرەدا خـوای بـە بـەزەیی ئـامۆژگـاریی بـڕواداران دەکـات ، سـەرەتاش هـاوەڵان ، لـە پێش هەموو بڕوادارانـدا ، چونکە لە ڕووی زەمەنییـەوە ، لە پێش هەمووانـدا بـوون ، وە پاشـان هـەموو جیلەکـانی مسـوڵمانان ، دەفـەرموێ : بـە دەم بـانگی خـوا ﷻ و پێغـەمبـەر ﷺەوە بچن ، هەر کاتێك بـانگیان کردن ، چونکە خوا ﷻ و پێغـەمبەری خوا ﷺ بۆچی بـانگمان دەکەن ؟ بـە تـەئکید بۆ شتێك کە ئێمە بەهۆیەوە ، ژیـانی ڕاستـەقینـەمان دەستبکـەوێ ، لە ڕۆژی دوایی دا ، چونکە خـوا دەفـەرموێ : ﴿ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ العنكبـوت .

واتـە : وە بێگومـان مەنزڵگای دوارِۆژ ، ژیـانی ڕاسـتـەقینـەیە ، ئـەگـەر بـزانن ، کە دەگونجێ مەبـەست پێی ئـەوەشیـان بـێ ، هەرچـەندە مـن نـەمبینیـوە توێژەرەوانـی قورِئـان ئـەو مانایەی بـۆ لێکبدەنـەوە ، بـەڵام ئـەوەش دەگرێتـەوە ، واتـە : لـە دنیـادا بـەهۆی بـە دەم بـانگی خـواو پێغەمبـەری خـواوە ﷺ چوون ، ژیـانی ڕاسـتـەقینـەی دوارِۆژمان دەست دەکەوێ .

وە کە دەفەرموێ : بزانن کـە خـوا پـەردە دەخاتـە نێوان مرۆڤ و دڵـیەوە ، واتـە : شتێکی وا مەکەن ، کە خوا دڵـتان لابـدات ، بـەهۆی ئـەوەوە کە خوا یـاسـایەکی خۆی بـەسـەر ئێوەدا دەچەسپێنـێو ، دادگـەرانـە مامەڵـەتان لەگـەڵـدا دەکـات ، وە بشـزانن

کە بۆ لای خوا کۆدەکرێنەوە ، کەواتە : بزانن بە چ چاوو ڕوویێکەوە دەچنەوە خزمەت خوای بالأدەست !

بەڕاستی ئەگەر کەسێك بڕوای بە دیداری خوا بێ ، بزانێ دەچێتەوە خزمەت خوا ، دەبێ هەوڵبدات ، بزانێ بە چ ڕوویێکەوە بچێتەوە خزمەت خوای بە بەزەیی !

دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ ﴾ ، وە خۆتان لە بەلأیەك بپارێزن ، کە تەنیا تووشی ستەمکارەکانتان نایەت ، کوردەواریی خۆمان دەڵێن : (ئەگەر ئاگر بەربووە لێڕەوار ، تەڕو ئیشکی پێکەوە دەسووتێنێ) ، ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ ، وە بزانن کە خوا سزای توندە ، کەواتە : خۆتان لەو گوناهو تاوانو لادانانە بپارێزن ، کە دەبنە هۆکاری پەیداکردنی بەلأو گرفتاریی ، وە بەلأو گرفتارییەکەش ، تەنیا خراپەکارەکانتان ناگرێتەوە ، بۆیە مسوڵمانان دەبێ لە نێوان خۆیاندا دەستی یەکدی بگرن ، ڕێگا نەدەن کەس خراپە بکات ، چونکە ئەگەر چەند کەسێك خراپە بکەن ، ڕەنگە دوایی هەموویان باجەکەی بدەن ، ئنجا دەفەرموێ ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ ، وە یاد بکەنەوە ! کاتێك کەمو چەوسێنراوە بوون لە زەویدا ، دەترسان کە خەڵك بتانرفێنێ ، بەلأم خوا ئێوەی حەواندەوەو جێو ڕێی لە مەدینەدا بۆ ساز کردن ، وە بە یارمەتی خۆی بەهێزی کردنو ، لە خواردنە خۆشو بەسوودەکان بژیوی دان ، لە کاتێك دا هەژارو نەدار بوون ، موحتاجی لەتە نانێك بوون ، {ئەوەتان دەخاتەوە بیر} بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن .

دوایی دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ ، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! ناپاکیی و پەیمانشکێنیی بەرانبەر خواو پێغەمبەر مەکەن ، وە ناپاکیی لە سپاردەکانتاندا مەکەن ، لە

حاڵێکدا کە دەشزانن {ناپاکیی کردنو ئەمانەت زایە کردن ، چەند گوناهێکی گەورەیە} ، ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾ ، وە بزانن کە بێگومان سامانەکانتانو منداڵەکانتان مایەی تاقیکردنەوەتانن ، یانی : ئەگەر لە خۆتان وریا نەبن ، تووشی ناشەرعییتان بکەن ، بۆتان دەبنە بەڵاو گرفتاریی ، یاخود تاقیکردنەوەن بۆ ئێوە ، وە بشزانن کە خوا پاداشتی مەزنی لەلایە .

کەواتە : با خوازیارییتان بۆ پاداشتی مەزنی خوا ، زاڵ بێ بەسەر خۆشەویستیتان دا ، بۆ ماڵو سامانو منداڵەکانتان ، با ئەوانە تووشی ناپاکییو خیانەتتان نەکەن .

لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ ﴾ ، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! ئەگەر پارێز لە خوا بکەن ، جیاکەرەوەی هەقو ناهەقتان پێ دەدات ، (واتە : دڵتان ڕۆشن دەکاتو عەقڵتان فراوان دەکات ، بەرچاو ڕۆشنییتان پێدەبەخشێ) وە خراپەکانیشتان لێ دەسڕێتەوەو لێتان دەبوورێ ، ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ ، وە خوا خاوەن بەخششو پاداشتی مەزنە ، کەواتە : کارێکی وا بکەن ، کە شایستەی بەخششی مەزنی خوای پەروەردگار بن .

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم :**

**ڕوونكردنەوەی چەمكی بەدەم بانگی خواو پێغەمبەرەوە چوونو، دەستكەوتنی ژیانی ڕاستەقینە بەو هۆیەوە :**

كە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ ، شارەزایانی زمانەوانی گوتوویانە : (الإستَجابة : الإجابة بعِنَايَة واستِعْدَاد) ، (إستَجابة) ئەوەیە كە ئینسان بە گرنگیی پێدانو بە خۆ ئامادەكردنەوە ، وەڵام بداتەوە .

لێرەدا خوا ﷻ فەرمان دەكات بە بڕواداران ، كە هەر كاتێك خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگیان كردن بۆ شتێك ، كە مایەی ژیانی ڕاستەقینەیانە ، لە ڕۆژی دوایی دا ، یاخود مایەی ژیانی مەعنەویی دنیایانە ، وەڵام بدەنەوە ، وە دەست لەسەر سینگ بن ، وە دەست لەسەر چاو بن ، لە خزمەت خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دابن .

كە دەفەرموێ : ﴿ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ ، ڕاستە مانایەكەی واتە : بۆ شتێك كە دەتانژیەنێو ، ژیانتان پێدەبەخشێ ، یاخود زیندووتان دەكاتەوە ، كە بە تەئكید مەبەست لەم ژیانە ژیانی ئاسایی نیە ، ئەگەرنا ئینسان زیندووە ، كە ئەم ئامۆژگارییە كراوەو ئەو بەڵێنەی پێدراوە ، بەڵكو مەبەست پێی :

١) ژیانی مەعنەوییە .

٢) وە هەندێكیش گوتوویانە : مەبەست پێی زانیاریی بە خواو بە دروستكراوەكانو بە یاساكانی شەریعەتە .

٣) هەندێكی دی گوتوویانە : مەبەست پێی جەنگو جیهادە ، كە بە هۆی جەنگو جیهادەوە كۆمەڵگای مسوڵمان زیندوویەتیی تێدا دەبێ ، وە هەر كۆمەڵگایەك ئامادە نەبێ ، بەرگریی لە خۆی بكاتو ، جەنگو جیهاد بكات لە كاتو شوێنی پێویستدا ، ئەوە بە مردوو ئەژمار دەكرێ ، وە دوژمنان سەروەتو سامانی بە تالآن دەبەنو ، هەرزان فرۆشی دەكەن ، وەك ئێستا دەیبینین ، حالی زۆربەی مسوڵمانان بەو شێوەیە .

٤) وە دەشگونجێ مەبەست لە ﴿ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ ﴾ ، ئەوەبێ كە خوا ئەو ژیانەتان پێدەبەخشێ كە ژیانی ڕاستەقینەیە ، وەك خوای بەرزو مەزن لە كۆتایی سووڕەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٦٤ ﴾ ، واتە : ئەم ژیانی دنیایە ، تەنیا كات بەسەربردنو گەمەو گاڵتەیە ، بەلآم مەنزڵگای دوارۆژ ، ژیانی ڕاستەقینەیە ، ئەگەر بزانن .

٥) وە دەشگونجێ لە یەك كاتدا مەبەست پێی هەموویان بێ .

(مُحَمَّد رَشيد رضا) لە تەفسیرەكەی خۆی هەندێ قسەی جوانی كردوون دەربارەی گوێڕایەڵیی كردنی خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ ، دەڵێ : (طاعَةُ الرَّسول ﷺ واجِبة فِي حَياتِهِ وَبَعْدَ مَماتِهِ ، فِيمَا عُلِمَ أَنَّهُ دَعا إِلَيْهِ دَعْوَةً عامَّةً فِي أَمْرِ الدِّينِ الَّذِي بَعَثَهُ اللهُ تَعالى بِهِ ، كَبَيانِهِ لِصِفَةِ الصَّلَوَاتِ وَعَدَدِها ، والْمَنَاسِك ، وَلَو بالفِعْلِ مَعَ قَوْلِهِ : ﴿ صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي ﴾[1] وَقَوْلِهِ : ﴿خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ﴾[2] وَمَقَادِيرِ الزَّكَاةِ ، وَغَيْرِ ذَلِكَ مِنْ السننِ العَمَلِيةِ الدّينيّةِ المتَوَاتِرَةِ ، وَكَذَا أَقْوَالُهُ المتَوَاتِرَةِ الَّتِي أَمَرَ بِتَبْلِيغِهَا ، فِيما

---

١) رَوَاهُ البُخَارِيُّ ، بـرقم : (٦٠٠٨)، وَابْنُ حِبَّانَ ، بـرقم : (١٦٥٨)، وَالبَيْهَقِيّ فِي (الكُبْرَى) ، بـرقم : (٣٦٧٢).

٢) رَوَاهُ مُسْلِمٌ ، بـرقم : (٣١٢٤)، وَالنَّسَائِيُّ ، بـرقم : (٣٠٦٢)، وَأَبُو دَاوُدَ ، بـرقم : (١٩٧٠)، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (٣٠٢٣).

تَـدُلُّ عَلَيْـهِ دِلالَـةً قَطْعِيَّـةً ، وَأَمَّـا غَيْـرُ القَطْعِـي رِوَايَـةً وَدَلالَـةً مِـنْ سـننِهِ ، فَهُـوَ مَحَـل الإِجْتِهَادِ)[١] .

واتـە : فـەرمانبـەریی کردن بۆ پێغـەمبـەر ﷺ ، پێویستـە چ کاتێك کە لـە ژیـاندا بووە ، وە چ دوای مردنی ، لە هـەر شـتێکدا کـە زانرابـێ ، پێغـەمبـەر ﷺ ، بـەگشتی خەڵکی بۆ بـانگ کردوە ، لە کاروبـاری دینـداریی دا ، کـە خەڵکی بۆ بـانگ کـردوە ، وە خـوای بـەرز ئـەوی پـێ ڕەوانـە کـردوە ، وەك ئـەوە کـە پێـنج نوێـژە فـەرزەکـانی ڕوون کردۆتـەوە ، وە ژمارەیـان ، وە مەناسیکـەکـانی حـەج ، ئـەگـەر بـە کـردەوەش بـێ لەگـەڵ قسـەی دا ، بـۆ وێنـە فـەرموویەتی : ﴿صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي﴾ واتـە : نوێـژ بکـەن وەك چـۆن منتـان بینـی نوێـژم کـرد ، وە فـەرموویەتی : ﴿خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ﴾ خـواپەرستییەکانی حەجـم لـێ فێـربـن ، هـەروەها ئـەندازەکانی زەکات ، وە جگە لەوانـەش لە سوننـەتە کردەییەکانی ، کـە بـە تـەواتور بـە ئێمـە گەیشـتوون ، هـەروەها فەرمایشـتەکـانی کـە بـە تـەواتور بـە ئێمـە گەیشـتوون ، ئـەوانـەی کـە پێغـەمبـەر ﷺ فـەرمانی پێکـراوە ڕایـانبگەیەنـێ ، لـەوەدا کـە بـە شێوەیەکی ڕوون ئـەوە دەگەیـەنن ، بـەڵام ئـەوەی کـە بـە شـێوەیەکی ڕوونـی وا کـە مشـتومڕ هەڵنـەگرێ ، نـەیگـەیەنن ، یـان لـە ڕووی سـەنـەدەکـەیەوە ، ئێمـە دڵنیـا نـەبین کـە ئـەوە فەرمایشـتی پێغـەمبـەرە ﷺ ، یـان لـە ڕووی دەلالـەتو واتاکـەیانـەوە ، ئـەوە جێگـای کۆششـی زانایـانـە .

واتە : ئەوەی کە ئێمە دڵنیـابین کە پێغـەمبەر ﷺ فەرموویەتیو مەبـەستیشـی زانـراوو ڕوونـە ، ئـەوەیە ئـەوە پابـەندکـەرە بـۆ هـەموو لایـەك ، بـەڵام ئـەوەی لـێی دڵنیـا نـەبین ، ئـەوە جێی ئـەوەیە زانـایـان کۆششی تێـدا بکـەنو لێـی وردبنـەوە .

پاشان دەڵێ : (فَكُلُّ مَنْ ثَبَتَ عِنْدَهُ شَـيءٌ مِنْهـا ببَحْثِهِ ، أَو بَحْث العُلَمَاءِ الَّذِينَ يَثِقُ بهم ، عَلَى أَنَّهُ مِنْ أَمْرِ الدِّين ، فَيَنْبَغِـي لَـهُ الإهتـداء بـهِ ، فِيمَـا دَلَّ عَلَيْهِ مِنْ الأَحْكَـامِ الخَمْسَـةِ بحسَبهَا : الوُجُـوب والنـدب والحرمَـة والكَرَاهـة والإِبـاحَةِ ، لأَنَّ الأُمُور العَمَلِيـة الإِجتِهَادِية ، يُكْتَفى فيهـا بـالظنّ الـرَّاجح فِي الـدّليل وَفِي دلالتـهِ ، وَلَكِن لا يملكُ أحَد مِنَ الـمُسْلِمِين أن يَجْعَل اجتهاده تَشْرِيعاً عَامَـاً يُلْـزِمُهُ غيـرَهُ ،

---
١) تفسير القرآن الكريم ، ج ٩ ، ص ٥٤٠ ـ ٥٤١ .

أَو يُنْكرُ عَلَيْـهِ مُخَالَفَتَهُ أو مُخالفة مَنْ قلّدهُ هُوَ فِيهِ ، إلاَّ الأَئِمَّة أولي الأمر ، فَتَجِب طـاعتهُم فـي اجتِهادِهم فِي أَحْكام الـمعَامَلاَت القضائية والسياسيةِ ، إذَا حَكَمُوا بِهَا ، لإقَامَةِ الشَّرْعِ وَصِيانة النّظام العَام ، وَعَلَى هَذَا كُلِّهِ جَرَى السَّلَفُ الصالِحُ وَجَمِيع أئِمّة الأَمْصار، وأما من يَقولون : أن النبيُّ ﷺ إنّما كانت تجب طاعته فـي عَهدِهِ ولا يجِبُ العَمَلُ بَعدَه الاّ بالقرآن وحدَهُ ، فَهُمْ زنادقة ضالّون مُضِلُّون يُريدونَ هَدْمَ الإسلام بدعوى الإسلام ... .)[1] .

واتــە: هــەر زانایــەك هــەر شــتێك بەهــۆی لێكۆڵینــەوەی خۆیــەوە ، یــاخود لێكۆڵینــەوەی زانایــانی دیكــەوە كــە ئــەو كەســە متمانەیــان پێدەكــات ، بــۆی دەركــەوت ، كــە ئــەوە پێغــەمبەر ﷺ كردوویەتــی ، یــان فەرموویەتــی ، وە بــەشێكە لە كاروباری ئـاییـن ، پێویستــە پەیڕەویی لــێ بكــات لــەوەدا كــە پێنج حوكمەكــان دەیگەیەنن ، هــەر كامێكیــان بــە پێــی خــۆی ، پێنــج حوكمەكــانیش بریتیــن لــە : پێویســـت بــوون ، ســوننــەت بــوون ، قەدەغــە بــوون ، ناپەســـند بــوون ، وە ڕێ پێــدران ، چونكە كاروباری كردەیی كــە جێگــای كــۆشش تێدا كردنــە ، ئــەوەندە بەســە كــە ئینســان تێیــدا گومانێكــی زاڵــی هەبــێ ، چ لــە بەڵگەكــەدا ، چ لــە واتاكــەیدا ، (واتــە : ئــەگــەر گومــانی زاڵمــان وا بــوو كــە ئــەو دەقە فەرمایشــتی پێغەمبــەرە ﷺ ، وە گومانمــان وابــێ ئــەمە واتایەكەیەتی) ، ئــەوە پێویســتــە كــاری پــێ بكــەین ، بــەڵام هیچ كــام لــە (زانایــانی) مســوڵمانان بــۆی نیــە كــە بــەرهــەمی كۆشــش‌و ئیجتیهــادی خــۆی بكاتــە شــەرعێكی گشــتی پابەندكــەر ، بــۆ جگــە لــە خــۆی ، یــاخود ئــەگــەر جگــە لە خــۆی پێچەوانــەی بۆچــوون‌و ئیجتیهــادێكــی ئــەو جووڵایــەوە ، یــان پێچەوانــەی پێشەوایەك كــە ئــەو بــە دوایدا ڕۆیشـتووەو تــەقلیــدی كــردوە ، بۆی نیــە نكووڵیی لــێ بكات ، جگــە لە پێشــەوایانی كاربەدەســت ، (واتــە : بەرپرس و حوكمڕانــان) ئەوانــە پێویســتە فەرمانبــەرییــان بــۆ بكــرێ ، لــەو شــتــەدا كــە ئــەوان كۆشــشــی تێدا دەكــەن ، ئــەویش لــە بــواری هەڵسوكــەوتدا ، وە لــەو یــاسایــانــەدا كــە پەیوەندییــان بــە دادوەرییــەوە هــەیە ، وە لــەو یــاسایــانــەدا كــە پەیوەندییــان بــە كــاروبــاری ســیاســییەوە هــەیە ، مــادام بــابەتــەكــە جێگــای كۆشش تێدا كردنــە ، هــەر كــات كۆششیــان كردو بڕیــارێكیــانداو لــە چــوار چێوەی شــەریعەت

---

١) تفسير القرآن الحكيم ، ج ٩ ، ص٥٤٠ ، ٥٤١ .

دەرنەچوون ، پێویستە بە قسەیان بکرێ ، بۆ ئەوەی شەریعەت پیادە بکرێ ، وە سیستەمی گشتیو کاروباری وڵات پارێزراوبێ ، هەروەها هەموو ئەوانەی پێشەوا بوون لە شارەکان دا لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون ، بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن : پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا کاتێك کە لە ژیاندا بووە ، پێویست بووە بە قسەی بکرێو ، فەرمانبەریی بۆ بکرێ ، وە لە دوای خۆی تەنیا پێویستە کار بە قورئان بکرێ ، ئەوانە : بێ دینن ، گومڕان ، وە گومڕاکەرن ، وە دەیانەوێ هەر لە ژێر پەردەی ئیسلامدا ، ئیسلام برووخێنن .

﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ ﴾ ، بوونە پەردە لە نێوان مرۆڤ و دڵەکەیدا ، ئەوەش دیارە یەکێکە لە یاسا دەروونییەکانی خوا کە لە ژیانی مرۆڤ دا دایناوە ، کە هەر کەسێك بەردەوام بوو لەسەر شتێك ، دوایی وای لێ دێ ، ڕێی گەڕانەوەی نابێ ، کەسێك بەردەوام بێ لەسەر شەڕاب خواردنەوە ، یان جگەرە کێشان ، یان قومار کردن ، یان زینا کردن ، دوایی بە زەحمەت دەستی بۆ لەو کردەوە خراپانە هەڵدەگیرێ ، وەك خوا ڕێگا نەدات بگەڕێتەوەو دەست هەڵبگرێ ، ئەمە یاسایەکی خوایە ، کە لە ئەنجامی زۆر ڕۆچوون لە گوناهان دا ، مرۆڤ ناتوانێ بە ئاسانیی بڕیاری وازهێنان لە گوناهان بدات ، چونکە وای لێهاتوە ، پەردەیەك کەوتۆتە نێوان ئەو کەسەو دڵەکەیەوەو ، ئیرادەی خۆی لە دەست داوە ، وەك چۆن کەسێك لە شوێنێکی بەرزو لێژایی وەستاوە ، پێش ئەوەی خلۆر بێتەوە بە دەست خۆیەتی ، چۆن دەڕوات ، بەڵام دوای ئەوەی خلیسکا ، خۆی بۆ ناگیرێتەوە ، لە ڕاستییدا خلۆربوونەوەو ڕۆچوون بە زەلکاوی گوناهو تاوانانەدا ، ئاوایە ، هەتا دەچیە سەر سوێی ، بەدەست خۆتە ، بەڵام دوایی کە هەڵخلیسکای ، بەدەست خۆت نامێنی .

ئەم تەعبیرە قورئانییە مەبەست پێی ئەوەیە ، دیارە لە شوێنی دیکەش خوای بێ نیاز بە شێوازی دیکە ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە ، بۆ وێنە فەرموویەتی : ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ ﴿٧﴾ ﴾البقرة ، ﴿ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾محمد ، ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففین .

کەواتە : لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی گوناهبارییدا ، مرۆڤ ژەنگی لەسەر دڵ پەیدا دەبێ ، دوایی دەبێتە خەتم ، دوایی دەبێتە قوفڵو ، توانای دەربازبوونی نابێ بە یەکجاریی ، وە دیارە مرۆڤ خۆی ، خۆی بەو مەرەدە بردوە .

ئوممو سەلەمە دایکی مسوڵمانان خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ زۆرجار دەیفەرموو : ﴿یا مُقَلِّبَ القُلُوب ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِك﴾ {رَوَاهُ ابْنُ أَبي حَاتِم برقم : (٣٢٢٢) ، وَالطَّبَرِي في (تفسيره) برقم : (٦٦٥٠) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (٢١٤٠) ، وَالطَّبَرَانِيُّ في (الكَبير) برقم : (٧٧٢) ، وَرَوَتْ عَائشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا نَحوَهُ ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم : (٢٠٩١)}.

واتە : ئەی هەڵگێڕەوەی دڵان ! دڵم لەسەر دینەکەت بچەسپێنە ، دوایی ئەوەی دەخوێندەوە : ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا ﴾ ، پەروەردگارمان ! دوای ئەوەی ڕێنماییت کردووین ، دڵمان لامەدە .

وە کە دەفەرموێ : ﴿ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾ ، وە بزانن کە بەرەو لای خوا کۆدەکرێنەوە ، ئەوەش جۆرێکە لە هەڕەشەو ترساندن ، واتە : بزانن بە چ چاوو ڕوویێکەوە دەچنەوە خزمەت خوا ، چۆن دەچنەوە لای خوا ، ئاگاتان لە گوناهو خراپەکانتان بێ ، با لە ڕۆژی دوایی دا شەرمەزار نەبن ، بەڵکو سەربەرز بن .

خوای بە بەزەیی لەو کەسانەمان بگێڕێ ، کە بە سەربەرزیی و بە ڕووسووریی دەچنەوە خزمەتی .

**مەسەلەی دووەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾ ، خۆتان لە بەڵایەك بپارێزن کە بە تەنیا ، وە بە تایبەت تووشی ئەوانەتان نابێ کە ستەمیان کردوە .

لێرەدا مەبەست لە (ظَلَمُواْ) دەست درێژییە بۆ سەر مافەکانی خەڵك ، دەشگونجێ مەبەست پێی موتڵەقی گوناهکردن بێ ، واتە : خۆتان بپارێزن لەو

بەڵایەی کە تەنیا تووشی گوناهکارەکان نابێ ، بەڵکو وەك پێشینان گوتوویانە : (ئەگەر ئاگر بەربووە ، لێرەوار[1] تەڕو وشکی پێکەوە دەسووتێنێ) ، لەوبارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە :

﴿إِنَّ اللهَ عزوجل لا يُعَذِّبُ الْعَامَّةَ بِعَمَلِ الْخَاصَّةِ ، حَتَّى يَرَوُا الْمُنْكَرَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ ، وَهُمْ قَادِرُونَ عَلَى أَنْ يُنْكِرُوهُ ، فَلا يُنْكِرُوهُ ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ ، عَذَّبَ اللَّهُ الْعَامَّةَ وَالْخَاصَّةَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (١٧٧٥٦) ، وَالطَّبَرَانِيُّ ، برقم : (٣٤٤) ، قَالَ شُعَيْب الأرنؤوط : حَسن لِغَيْرِهِ} .

واتە : بێگومان خوای زاڵی پایەبەرز خەڵك بە گشتی بەهۆی کردەوەی خراپی خەڵکێکی تایبەتەوە سزا نادات ، هەتا خەڵکەکە بە گشتی خراپە لە نێوان خۆیاندا نەبینن ، کە بشتوانن بیگۆڕن ، بەڵام هەڵوێستیان نەبێ لە بەرانبەریدا ، ئەگەر وایان کرد ، خوا ﷻ، خەڵکە تایبەتییەکەو خەڵکە گشتییەکە ، سزا دەدات .

خەڵکە تایبەتییەکە ئەوانەن کە گوناهەکانیان کردوە ، خەڵکە گشتییەکەش ئەوانەن کە تێیانەوە ڕاماون و بێ هەڵوێست بوون ، هەموویان پێکەوە سزا دەدرێن ، بە دڵنیایی کۆمەڵگایەك هەڵوێستی نەبێ لە بەرانبەر خراپەکاراندا دەستیان نەگرێ ، شایستەی سزای خوای دادگەرن ، بەڵام سوننەتی خوا وایە هەر کۆمەڵگایەك لە نێوان خۆی دا ، ڕێ لە خراپەکارن بگرێ ، خوا سزایان نادات ، وەك دەفەرموێ : ﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ۝٥٩﴾ القصص ، واتە : ئێمە خەڵکی ئاوەدانییەکان سزا نادەین ، مەگەر ستەمکاربن .

کە دەفەرموێ : ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ ، وە بشزانن کە خوا سزاو تۆڵەی توندە .

لە دنیادا لە میانەی جێبەجێکردنی سوننەتو یاساکانی دا ، دێتە دی وە لە دواڕۆژیشدا ، دیارە خوای زاڵی مەزن ، لە دۆزەخدا سزای سەختو توندە ، کەواتە :

---

١) لێرەوار : دارستانو جەنگەڵ .

سزاو تۆڵەی خوا مەرج نیە هەر لە دواڕۆژدا بێ ، چونکە جاری وایە خوا ﷻ هەر لە دنیادا کەسانێك ، یان کۆمەڵگایەك سزا دەدات ، پێش سزای قیامەتیان .

**مەسەلەی سێیەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٢٦﴾ ، لێرەدا خوا ﷻ ئەو ڕاستییە دەخاتەوە بیری مسوڵمانان ، کە پێش هەمووان مەبەست پێی مسوڵمانانی یەکەمە ، مسوڵمانانی کۆچکەرو پشتیوان ، دەفەرموێ : یاد بکەنەوە ! کاتێك ئێوە کەم بوون ، وە لە زەویدا چەوسێنراوە بوونو بێدەستەڵات بوون ، بیمی ئەوەتان هەبوو خەڵك بتانڕفێنێ ، سێ وەسفیان لێ هەڵدەدات ، دەفەرموێ :

١ - ﴿إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ﴾ ، ژمارەتان کەم بوو .

٢ - ﴿مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ، بێ دەستەڵاتو بێهێز بوون لە زەویدا .

٣ - ﴿تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ﴾ ، وە دەترسان خەڵك بتانڕفێنێ .

هەڵبەتە کەمیی ژمارەیان (قلّة العدد) و چەوسێنراوەیی یان لە زەویدا (مُستَضعفین) ئاشکرایە ، بەڵام ئایا ڕفێنران (إختطاف) یان چۆن بوو ؟

دەڵێین : کافرەکانی قوڕەیش کە هەندێ لە هاوەڵانیان بۆ هەڵدەکەوتن ، دەیانڕفاندن ، یان کە بە ئیش دەچوونەوە بۆ مەککە ، دەیانڕفاندنو ، سزاو ئەشکەنجەیان دەدان ، هەروەها مسوڵمانان دەترسان کە بڕفێنرێن لەلایەن ڕۆمو فارسەوە ، واتە : لە حاڵێکی ئاوا دابوون ، بەڵام ئایا خوا ﷻ چی بۆ کردن ؟ ئەوەش بە سێ تەعبیر بەکاردێنێ :

١ - ﴿فَـَٔاوَىٰكُمۡ﴾ ، خوا پەنای دانو ئێوەی حەواندەوە .

٢ - ﴿وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ﴾ ، وە بە یارمەتی خۆی ئێوەی بەهێز کرد .

٣ - ﴿ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ ، وە لـە ڕزقو ڕۆزییـە پـاكو چـاكو ، بـە تـامو خۆشو بە سوودەکانی پێ بەخشین .

بۆچی خـوای پەروەردگـار ئـەمەی کـرد ؟ ﴿ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ ، ئـەمە دوو واتـای هـەن :

أ ) واتە : خـوا ئەم ڕاسـتییەتـان بۆیـە دێنێتـەوە یـاد ، بەڵـکو سـوپاسگوزاریی بکـەن .

ب) یـاخود واتـە : خـوای بە بەزەیـی بۆیە ئـەمـەی بـۆ کـردن ، تاکـو سـوپاسگـوزاریـی بکـەن .

کـەواتـە : ئیسـلام هـەمووی خێرو بـەرەکـەتـە بۆ دنیـا پێش قیامـەت ، وە گەلـێك کە ئـەو ڕاسـتییەی تێـدا بـەرجەسـتـە بـووە ، بـە جوانتـرین شـێوە ، گەلـی عـەرەب بووە ، کە بـەر لە ئیسـلام ، وەك نـەتـەوەیەکیش نـەناسراون ، نـەك هـەر قـەوارەی سیـاسییـان نـەبووە ، وە زمـانێکی یەکگرتووشیـان نـەبووە ، بـەڵکـو وەك چـەند تیـرەو هۆزێکی پێکـەوە ناکـۆکی شـەڕ بـە یەکدی فرۆشو ، دواکـەوتوو لـە هـەموو ڕووەکـانی فیکـریی‌و عەقیـدەیی‌و ئـابـووریی‌و کۆمەڵایـەتیی‌و سیـاسی‌و .... هتـدەوە، هـەتا بڵێـی بـێ سەروبـەر بـوون ، بـەڵام ئیسلام لـە هـەموو ڕووێکـەوە بردنیـە پێشـەوەو گەشـەی پێدان ، کردنیـە سـەرقافڵەی میللـەتـان .

وە هـەروەها لـە دوای وانیش گەلـی تـورك دەسـتیـان بـە ئیسلامەوە گرتـوە ، وەك عوسـمانییەکان .

وە گەلـی کـورد وەك ئـەییووبییەکـان ، وە گەلـی ئێـرانو ئەفغـان، وەك غـەزنـەوییـەکان ، بگـرە تـەنانـەت کۆیلـەکان ، (ممالیـك)یش لە سـایەی ئیسلامدا بوونە حوکمڕان ، کە ماوەیەکی زۆر لە میصرِ حوکمڕانیـان کرد هـەر کـام لە (سـیف الدین قُطُز) و (الظاهر بیبرس) کە تەتـەرو مەغۆلیـان شکاندن ، لـەوان بوون .

هـەر کـەسـێك دەسـتی بـە ئیسـلامەوە گرتبـێ ، سـەربـەرزو بـەختـەوەر بـووە ، کـەواتـە : وەك گـوتـم : ئیسـلام هـەر هـەمووی خێـرو بـەرەکـەتـە .

ڕاستییەکی دیکـە کـە لـەم ئـایەتـە وەردەگیـرێ ، ئـەوەیە کـە لەبـەرچـاو بـوونی ڕابـردوو شـتێکی گرنگـە ، تـەماشـا بکـەن خـوا لـە سـوورەتی (إبراهـیم)دا چـی

دەخاتـــەوە بیـــر بـــەنی ئیســـڕائیل ؟ دەفـــەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾ ﴾ ، واتـــە : بێگومـــان ئێمە مووسامان بە نیشانەکانمانەوە نارد ، کە گەلەکەت لە تاریکاییان بەرەو ڕۆشنایی دەربێنەو ، ڕۆژەکانی خوایان بخەوە یاد ، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن ، بۆ هەر خۆڕاگرێکی شوکرانەبژێر .

ڕۆژەکانی خوا (أيام الله)ش ئەو ڕۆژانە بوون ، کە دەستەڵاتی خوای زاڵو بەرز بەرجەستە بوو بۆ پشتیوانی کردن لە بەنی ئیسڕائیل ، کە فیرعەون سۆغرەو بێگاری پێ دەکردن ، وە نێرینەکانی سەردەبڕینو مێینەکانی دەهێشتنەوە ، بەلام خوا دەربازی کردن ، هەوری بۆ کردنە سێبەر ، گەزۆی بۆ باراندن ، بالندەی سەمانیی بۆ دەستەمۆ کردن ، زۆر نازو نیعمەتی خۆی بۆ ڕشتن ، ئنجا خوای زانا ئەو نازو نیعمەتانە دەخاتەوە یادیان .

ئێمەش وەك گەلی کورد ، بە ڕاستی پێویستە ڕۆژانی سەختو تالی ڕابردوومان لە بیر نەکەین ، لە بیرمان نەچێ کە لەم ولاتەدا هیچ کەس خاوەنی خۆی نەبوو ، وە خاوەنی هیچ شتێکی خۆشی نەبوو ، پۆستالّ ڕەشەکانی ڕژێمی شۆڤینی بەعس هیچ مافێکیان بۆ هیچ کەس نەهێشتبۆوە ، کورد لەو کاتەدا خاوەنی هیچ شتێك نەبوو ، وەك هاوولاتیی تەماشا نەدەکرا ، هەموو جۆرە دەست درێژییەکی دەکرایە سەر ، ئەو پرۆسەیەی کە ڕژێمی بەعس ناوی لێنا ئەنفال ، کە گەلی کوردی بە کافر داناوە ، وە سەرو مالّی بە دەستکەوت داناوە ، وە ڕاگوێزرانو کیمیایی بارانو کۆچڕەویی پێ کران ، ئەوانە هەموویان ڕۆژانێکی تالّو سەخت بوون ، کە بەسەر ئێمەدا هاتوون ، پێویستە ئەو ڕۆژانە لە بیر نەکەین .

وە پاشان یادکردنەوەی ڕووداوە مێژوویەکان لە بازنەی موباح دایە ، چونکە هەندێ کەس هەیە پێی وایە ، کە مرۆڤ هەر لە کەولّی خۆی دا بجوولّێ بیدعەتە ! کە لە ڕاستییدا ئەمە وانیە ، وەك من لە کتێبی : (جەژنو بۆنەو

یادەكان) دا بە تەفصیلێ باسم كردوە ، كە ڕووداوە مێژووییەكان لە بازنەی هەڵسوكەوتەكان دان ، بناغەش لە هەڵسوكەوتەكاندا ڕەواییە ، مادام دەقێك نەبێ لەسەر قەدەغە كردنی : (الأَصْلُ فِي العَادَاتِ الإباحة ، مَا لَمْ يَدُلُّ دَلِيلٌ عَلَى التَحْرِيم) .

كەواتە : نابێ دنیا لە خەڵك بكەینە چەرمی چۆلەكە ، ئەگەر یادی بۆنەیەكی خۆش دەكاتەوە ، یادی بۆنەیەكی ناخۆش دەكاتەوە ، یان هەر یادێك دەكاتەوە ، چونكە لە ئەسڵدا یادكردنەوەی ڕۆژانی خوا ، شتێكی ڕەوایە ، دەمێنێتەوە ئەوەی ئامانجت چییە لەو یاد كردنەوەیە ؟ وە چۆن ئەو یادە دەكەیەوە ؟ ئەگەر ناشەرعیی تێكەڵ بێ ، بۆ وێنە : بە بۆنەی ئەوەوە كە كاتی خۆی گەلی ئێمە دەربازی بووە ، یان یەكەم حكوومەتمان پێكهێناوەو پەرلەمان هەڵبژێردراوە ، خەڵك ڕەش بەڵەك بكات ، ڕەش بەڵەكە ناشەرعیی یە ، بەڵام ئەسڵی یاد كردنەوەكە ڕەوایە .

هەروەها ئەگەر خەڵك یادی كارەساتەكان بكاتەوە ، بۆ وێنە كارەساتی ئەنفال ، كە دیارە ڕژێمی بەعس وای ناو لێنا ، یان یادی كیمایی باران دەكاتەوە ، ئەگەر وای یاد بكاتەوە ، تاكو پەندی لێوەربگرێ‌و دەرسی لێوەربگرێ ، ئەوە شتێكی باشە ، بەڵام ئەگەر وای یاد بكاتەوە كە لە پەنای ئەو یادانەدا ، قسە بە ئیسلام بگوترێ‌و ، خەڵك بەدبین بكرێ بەرانبەر بە ئیسلام ، وەك هەندێ كتێب‌و نامیلكەی نەزانانەی كینە لە دڵانە ، لەوبارەوە دەردەچن ، ئەوە لە ڕاستییدا شتە ناشەرعییەكە ، ناشەرعییەو ، ئەسڵی بابەتەكەش كە ڕەوایە ، لە شوێنی خۆیەتی‌و ڕەوایە .

**مەسەلەی چوارەم** : كە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ ، خوا ﷻ لەم دەرسەماندا بۆ جاری دووەم ، ـ ئەگەرنا لەم سوورەتەدا بۆ جاری چوارەم ـ بانگی مسوڵمانان دەكات بە نازناوی ئیمان ، دەفەرموێ : ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! خیانەت بە خواو ، وە بە پێغەمبەری خوا ، مەكەن ، وە خیانەت بە سپاردەكانتان

مەکەن ، لە حاڵێکدا کە دەزانن ، واتە : دەزانن خیانەتو ناپاکیی کردن بەرانبەر بە خواو پێغەمبەری خواو سپاردەکان ، چەند تاوانێکی گەورەیە ، وە بشزانن کە ماڵو سامانو منداڵەکانتان بۆ ئێوە جێگای تاقیکردنەوەن ، وە ئاگاداریش بنو بزانن : کە خوا پاداشتی مەزنی لەلایە .

(محمد رشید رضا) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[١] ئەم ڕستانە ئاوا تەفسیر دەکات :

﴿ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ ﴾ : (بتَعْطِيلِ فَرَائِضِهِ ، أَو تَعَدِّي حُدُودِهِ ، وَانْتِهَاكِ مَحَارِمِهِ الَّتِي بَيَّنَهَا لَكُم فِي كِتَابِهِ) .

واتە : ناپاکیی بەرانبەر بە خوا مەکەن ، بە پەکخستنی ئەو شتانەی کە پێویستی کردوون ، یاخود بەزاندنی سنوورەکانی ، یاخود شکاندنی قەدەغەکانی ، کە لە کتێبی خۆیدا بۆی ڕوون کردوونەوە .

﴿ وَٱلرَّسُولَ ﴾ : (بالرَّغْبَةِ عَنْ بَيَانِهِ لِكِتَابِ اللهِ تَعَالَى ، إِلَى أَهْوَائِكُمْ ، أَو أَرَاءِ مَشَائِخِكُمْ ، أَو آبَائِكُمْ أَو المُخَالَفَةِ عَنْ أَمْرِهِ إِلَى أَوَامِرِ أُمَرَائِكُمْ ، وَتَرْكِ سنتهِ إِلى سنة أَولِيَائِكُمْ) .

واتە : ئەو ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ چۆنیەتی جێبەجێکردنی کتێبی خوای بەرز ، کە ڕوونی کردۆتەوە ، وازی لێ مەهێننو بەرەو ئارەزووەکانی خۆتان بچن ، یاخود بیرو بۆچوونی گەورەکانی خۆتان ، یاخود عادەتو نەریتی بابو باپیرانی خۆتان ، هەروەها ناپاکیی بەرانبەر پێغەمبەری خوا مەکەن ، کە سەرپێچیی لە فەرمانەکانی بکەن ، بە هۆی ئەوەوە کە فەرمانبەریی کاربەدەستانی خۆتان دەکەن ، وە واز لە ڕێبازەکەی مەهێنن ، بەهۆی ڕێبازی کەسانێکی دیکە ، کە دەیانکەن بە سەرپەرشتیاری خۆتان ، لە حاڵێکدا کە پێچەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێتان پێشان دەدەن .

---

١) تفسير القرآن الحكيم، ج ٩ ، ص ٥٥٠.

﴿ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ ﴾ : (أي لا تَخُونُوا أمَانَاتِكُمْ فِيمَا بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ أَوْلِيَاءِ أُمُورِكُمْ مِنَ الشؤونِ السياسِيَّةِ ، وَلاَ سِيَّمَا الحَرْبِيَةِ ، وَفِيمَا بَيْنَكُمْ بَعْضَكُمْ مَعَ بَعْضٍ مِنَ المعَامَلاَتِ المَالِيةِ وَغَيرِهَا حَتَّى الإِجْتِمَاعِيةِ والأَدَبِيةِ) .

واتە : ئەو سپاردانەی کە لە نێوان خۆتان دان ، وە لە نێوانی ئێوەو کاربەدەستانتان دان ، لە کاروباری سیاسیی ، وە بە تایبەتیش جەنگ ، (نەچن نهێنییەك بدرکێنن‌و زانیارییەك بدەن بە دوژمن ، کە لە ڕووی سیاسییەوە زیان بگات بە مسوڵمانان) ، هەروەها لە هەڵسوکەوتەکانی نێوان خۆتاندا ، جا چ پەیوەندیی بە لایەنی دارییەوە هەبێ ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ئەدەبییەوە هەبێ ، کە سپاردەیەك لە لای یەکدی دادەنێن ، ناپاکیی بەرانبەر مەکەن .

# کورتە باسێک لەبارەی ئەمانەت پارێزییەوە

پێشتــر ئـاماژەمان پێـدا کـە وشـەی (خِيانـة) لـە زمـانی کـوردیی دا ، ئــەگەر پەیوەنـدیی بــە سـپاردەوە هەبــێ ، واتــە : ناپاکـیی ، بــەڵام ئـەگەر پەیوەنـدیی بـە پەیمانــەوە هەبــێ ، واتــە : پەیمــان شکــێنیی ، بــەڵام لــە زمـانی عەرەبییـدا بـۆ هەردووك حـاڵەت ، پێـی دەگـوترێ : (خِيانة) .

لەوبــارەوەش چـەند فەرمایشــتێکی پێغـەمبــەری خــوا ﷺ هــەن ، ئــاماژە بــە هەندێکیـان دەکـەیـن :

١ / ﴿الـمَجـالِسُ بـالأَمَـانـةِ إلاَّ ثَلاثَـةَ : مَجـالِسَ سَفْكُ دَمٍ حَرَامٍ ، أَوْ فَـرْجٌ حَـرَامٌ ، أَوِ اقْتِطـاعُ مَـالٍ بِغَيْـرِ حَقّ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ ، بـرقم : (٤٨٦٩) ، وَالبَيْهَقِـيُّ ، بـرقم : (٢٠٩٥١) ، وَأَحْمَـد ، بـرقم : (١٤٧٣٤) ، وَقَـالَ شُـعيب الأرنـؤوط : إسـناده ضـعيف لجهالة ابن أخي جابر بن عبد الله} .

واتـە : کۆڕو دانیشـتـەکـان دەبــێ ناپاکییــان پــێ نـەکـرێ ، جگـە لـە ســێ کـۆڕو مەجلــیس : کۆڕێـك کــە دەگیــرێ بـۆ ئــەوەی خوێنــی حــەڕام بڕێــژرێ (قەیناکـات ئەگەر تۆ ئەو زانیارییـە بدەیە ئەو کەسەی کە دەویسـترێ بـە ناهەق بکـوژرێ ، پێـی بڵێـی : ئـاگاداربـە !)[١] ، یاخـود کۆڕێـك کـە دەبـەسـترێ بـۆ زینـاکـردن ، یـان دەسـتدرێژیی کردنـە سـەر کەسـێك (تـۆش زانیـاریی لـەو کـۆڕە ببـەیە دەرێ ، بـۆ ئـەوەی ئـەو گوناهـە نـەکـرێ)[٢] ، یـان کۆڕێك دەبـەسـترێ بـۆ ئـەوەی ماڵێـك لـە کەسـێك زەوت بکرێ بـە ناهەق (دیسان ئـەگـەر تۆ ئـەو کەسـە ئـاگـادار بکـەیەوە ، کە خەڵکێـك دەیانـەوێ سـتـەمی لـێ بکـەن ، ئـەوە گوناهـت ناگـات)[٣] .

---

١ و ٢ و ٣) ئـەوەی نێـوان کەوانەکـان زیـادەی خۆمـە ، بۆ زیـاتر ڕوونبـوونەوەی مەبەسـت .

دیارە بە قیاس لەسەر ئەمانەش هەر کۆڕو مەجلیسێکی دیکە ببەستری ، بۆ هەر کارێکی ناشەرعیی ، کەسێك ئاگای لە نهێنییەکانی ئەو کۆڕو مەجلیسە بێ ، قەیناکات ئەگەر بێتو ئەو زانیارییە بلاو بکاتەوە ، یان بیگەیەنێ بەو کەسەی کە زیانی پێدەگەیەنن ، جا زیانەکە هەر زیانێك بێ ، بەلاّم دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو سێیەی باس کردوون ، وەك نموونە .

٢ / ﴿لاَ إِيمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَهُ ، وَلاَ دِينَ لِمَنْ لاَ عَهْدَ لَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (١٢٤٠٦) ، وَعَبْد بْنُ حُمَيْد ، برقم : (١١٩٨) ، وَأَبُو يَعْلَى ، برقم : (٢٨٦٣) ، وَابْنُ حِبانَ برقم : (١٩٤) قال شعيب الأرنؤوط : إسناده حسن في الشواهد} .

واتە : هەر کەسێك سپاردە نەپارێزێ ، ئیمانی نیە ، وە هەر کەسێك بەڵێنو پەیمان نەباتە سەرو نەیپارێزێ ، ئایینی نیە .

واتە : ئیمانو ئایینێکی چاكو ڕێکی نیە ، کە ڕێی لێ بگرێ لە کردنی ئەو دوو گوناهە گەورەیە ، کە ناپاکییە لە سپاردەو ، بەڵێنو پەیمان .

٣ / ﴿إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِالْحَدِيثِ ، ثُمَّ الْتَفَتَ فَهِيَ أَمَانَةٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ ، برقم : (٤٨٧٠) ، وَحَسَنهُ الألباني في (الصحيحة) رقم : (١٠٩٠)} .

واتە : ئەگەر پیاوێك قسەی کرد بۆ کەسێك ، پاشان ئاوڕی دایەوە ، ئەوە سپاردەیە .

یانی : دوو نەفەر یان زیاتر ، پێکەوە دادەنیشن قسە دەکەن ، یەکێکیان دەیەوێ قسەیەك بکاتو ئاوڕ دەداتەوە ، بۆ ئەوەی بزانێ کەسی دیکەی لێیە قسەکەی ببیستێ ؟ مانای وایە : من ئەو قسەیە تەنیا بۆ ئێوە دەکەمو ، نامەوێ لە ئێوە بچێتە دەر ، یان دەڵێ : دەرگا دابخەن ، مەرج نیە هەر ئاوڕ بداتەوە ، یان جاری وایە کەسێك کەسێکی دی بانگ دەکات ، پێی دەڵێ : دوو سێ قسەی بۆت تایبەتییم هەبوون ، دەڵێ : فەرموو ، ئەویش دەڵێ : زەحمەت نەبێ دەرگاکە دابخە ، جا ئەوەی بە سادەیی تەماشای ڕواڵەتی فەرموودەکە بکات ، ڕەنگە بڵێ : دەبێ کەسەکە ئاوڕ بداتەوە ، ئنجا دەبێتە سپاردە ! نەخێر ، وەك گوتم : گرنگ ئەوەیە مەبەستی کەسەکە ئەوە بێ ،

کەسی دی گوێبیستی ئەو قسەیە نەبێ ، یان بۆ وێنە : کۆبوونەوەیەك دەکرێ ، دە ، پازدە کەس دانیشتوون ، یەکێك قسەیەك دەکات ، دەڵێ : ئەم قسە ئەمانەت بێ ، دیارە بردنە دەری ئەو قسەیە ، خیانەتو ناپاکییە .

٤ / ﴿أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً ، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ ، كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا : إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ ، برقم : (٣٤) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (٢٠٧) ، وَالتِّرمِذِيّ ، برقم : (٢٦٣٢) ، وَالنَّسائِيُّ ، برقم : (٥٠٣٥)}.

واتە : چوار سیفەت لە هەر کەسێکدا هەبن ، ئەوە مونافیقێکی ڕووتە (مونافیقێکی تەواو عەیارە) وە هەر کەسێك یەکێك لەو چوار سیفەتەی تێدا هەبێ ، ئەوە یەکێك لە سیفەتەکانی نیفاقی تێدایە ، تاکو دەستی لێ هەڵدەگرێ :

**یەکەم** : هەر کاتێك بە ئەمیندار دانرا ، خیانەت بکات ، واتە : خیانەت لە سپاردە بکات .

**دووەم** : هەمیشە لە کاتی قسەکردن دا درۆ بکات ، واتە : قسەی ناڕاستی زیاتر بێ لە قسەی ڕاست .

**سێیەم** : هەردەم لەکاتی پەیمان دان دا ، غەدر بکات ، (غەدر ، واتە : پەیمان شکاندن) ، لە کوردەواریی خۆماندا ، غەدر بە مانای زوڵم دێت ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا ، وە لە بەکارهێنانی قورئانو سوننەتدا ، غەدر بە مانای پەیمان شکاندن دێت .

**چوارەم** : هەرکاتێ دەمەقاڵێیو مشتومڕی بوو لەگەڵ کەسێك دا ، خۆی تووشی گوناح و تاوان بکات (سوێندی بە درۆ بخوات ، غەیبەتی کابرا بکات ، بوختانی پێ بکات ... بەو شێوەیە) .

ئنجا ئایا کەسێك هەرکام لەو چوارانەی تێدا بن ، مانای وایە (نیفاق)ی گەورەی تێدا هاتۆتە دی ؟ دیارە هەندێك لە زانایان دەڵێن : نەخێر ، چونکە لێرەدا مەبەستی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ : (مُنافِقاً خَالِصاً) ، واتە

(نیفاق)ی گچکەی بە تەواویی تیادا هاتۆتە دی ، چونکە (نیفاق)ی گچکەش بەش بەشە ، منیش وای تێدەگەم کە ئینسان مەگەر ببێتە مونافیقێکی تەواو عەیار واتە : بە مانای (نیفاق)ی گەورە ، ئەگەرنا ئەو هەموو سیفەتە نزمانەی تێدا نایەنەدی ، چونکە حەدیسەکە دەفەرموێ : کاتێك کە ئەمانەتی پێ سپێردرا ، خیانەتی لێ بکات ، واتە : پیشەی خیانەت کردن بێ بە ئەمانەت ، وە پیشەی درۆ کردن بێت لە قسەکردندا ، وە پیشەی پەیمان شکاندن بێت ، وە پیشەی گوناهکردن (فجُور) کردن بێت لە دەمەقاڵیی دا ، هەرکاتێ ئینسان ئەو چوار سیفەتەی تێدا بوونە عادەتو پیشە ، ئەوە بەدڵنیاییی یەوە ، ئیمانی لە دڵدا نیە ، بەڵێ دەگونجێ مسوڵمان جارێ خیانەتێ بکا ، جارێ درۆ وەعدە خیلافی هەبێ ، جارێك لە دەمەقاڵێ دا تووشی گوناه ببێ ، بەڵام ناگونجێ ئەوانەی تێدا ببنە عادەت ، چونکە فەرموودەکە ئاماژە بەوە دەکات ، کە هەر کاتێ قسەی کرد ، درۆ دەکات ، وە هەر کاتێ ئەمانەتی پێدرا ، خیانەتی پێ دەکات ... هتد ، واتە : ئەو سیفەتانەی تێدا ڕیشەدار بوون ، دیارە ئەگەر ئەسڵی ئیمانو تەوحیدی لە دڵدا هەبێ ، ئەو سیفەتە خراپانە ، ئاوا تێیدا نابنە عادەتو خەسڵەتی ڕیشەدار .

وە لە ڕیوایەتی موسلیم دا فەرموویەتی : ﴿ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ فَهُوَ مُنَافِقٌ وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى وَزَعَمَ أَنَّهُ مُسْلِمٌ : مَنْ إِذَا حَدَّثَ كَذِبَ ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (٣٤) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (٢٠٧)} ،

واتە : سێ سیفەت لە هەر کەسێکدا هەبن ، ئەوە مونافیقە ، ئەگەر نوێژیش بکاو ڕۆژیش بگرێو خۆشی بە مسوڵمان دابنێ : هەر کات قسەی کرد درۆ بکات ، وە ئەگەر سپاردەی لەلا دانرا ، ناپاکیی پێ بکات ، وە ئەگەر بەڵێنی دا ، بیشکێنێ .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ، واتە : لە حاڵێکدا کە ئێوە دەزانن ، ناپاکیی کردن بەرانبەر بە خواو پێغەمبەری خوا ، وە بەرانبەر بە سپاردەکان ، چەندە زیانی هەیە ، هەم لە دنیادا زیانی هەیە ، وە هەم لە دواڕۆژدا سزای هەیە ، مادام ئەوە دەزانن ، وا مەکەن .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ٢٨ ﴾ ، وە بزانن کە سامانتانو منداڵەکانتان ، تاقیکردنەوەن بۆ ئێوە ، وە خوا پاداشتی مەزنی لە لایە .

واتە : سامانو منداڵ ، مرۆڤ تووشی خیانەتو لادان دەکەن ، ئەگەر وریا نەبێ .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿إنَّ الْوَلَدَ مَجْبَنَةٌ مَبْخَلَةٌ﴾ {أَخْرَجَهُ عَبْدُالرّزاق في (المصنف) (٢٠١٤٣) ، وَابْنُ أَبي شَيْبَة ، برقم : (٨٠٩) وَصَحَّحَه الألباني في (صحيح الجامع) رقم : ٧١٦٠} .

واتە : منداڵ دەبێتە هۆی ترساندنی مرۆڤ ، وە دەبێتە چرووککردنی مرۆڤ .

لە شوێنی دیکە خوا دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ ١٤ ﴾التغابن ، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! لە هاوسەرانتانو لە منداڵەکانتاندا ، دوژمن هەیە بۆ ئێوە ، وریایان بن .

چ هاوسەرو منداڵێك دوژمنە بۆ ئینسان ؟ ئەو هاوسەرەی کە پیاوەکەی تووشی بێ فەرمانیی خوا دەکات ، وە ئەو منداڵەی کە بابی تووشی ڕزقی حەڕام دەکاتو ، تووشی لادان لە شەریعەتی دەکات ، ئەوە دوژمنە ، چونکە کارێك بە مرۆڤ دەکەن کە دوژمنیش هەر ئەوەی پێدەکەن ، کە بریتیە لە گیرۆدەکردنی بە سزاو تۆڵەی خواوە ، بەهۆی گوناهبارییەوە .

﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾ ، واتە : وە دڵنیابن ! خوا پاداشتی مەزنی لەلایە ، یانی بە نرخێکی کەمو ، بۆ تۆزە تەماعێكو مەتاعێکی دنیا ، لە دەست خۆتانی مەدەن ، ئەو پاداشتە گەورەیەی خوا ، دیارە پاداشتی خواش بە دەستگرتن بە شەریعەتی خواوە ، دەست دەکەوێ .

**مەسەلەی شەشەمو کۆتایی** : کە خوا ﷻ دەفەرمویَ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾ .

پێشتر تەفسیرمان کرد ، بەلاَم (محمد رشيد رضا) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] مانای ئەم ئایەتەمان بۆ دەکات ، بە تایبەت ڕستەی : ﴿إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ﴾ ، دەڵێ : (مَعْنَاهُ : أَنْ تَتَّقُوا اللهَ فِي كُلِّ مَا يَجِبُ أَنْ يُتَّقَى ، بِمُقْتَضَى دِينِهِ وَشَرْعِهِ وَبِمُقْتَضَى سننِهِ فِي نِظَامِ خَلْقِهِ ، يَجْعَلْ لَكُمْ بِمُقْتَضَى هَذِهِ التَّقْوَى ، مَلَكة مِنَ العِلْمِ وَالحِكْمَةِ تُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الحَقّ وَالباطِلِ ، وَتُفَصِّلُونَ بَيْنَ الضار وَالنَّافِع ، وَتُمَيِّزُونَ بَيْنَ النُّورِ وَالظُّلْمَةِ ، وَتُزِيلُونَ بَيْنَ الحُجَّةِ وَالشُّبْهَة) .

واتە : ئەگەر ئێوە پارێز لە خوا بکەن ، لە هەر شتێکدا کە پێویست بێ پارێزی لێ بکرێ ، بە پێی دین‌و شەرعەکەی ، وە بە پێی ئەو یاسایانەی کە لە دروستکراوەکانی خۆیدا داینـاون {جا ئەوە تەعبیرێکی وردە ! ئێمە وەك چۆن لەسەرمان پێویستە ، پارێزکار بین بۆ خواو ، لە یاساکانی شەریعەتی خوا لانەدەین ، لەسەریشمان پێویستە لە یاساکانی خوا لانەدەین کە لە دروستکراوەکانیدا داینـاون ، بۆ وێنە یەکێك لە یاساکانی خوا بۆ دروستکراوەکانی ، ئەوەیە کە هەر کۆمەڵگایەك ئەگەر پێکەوەبن‌و لەگەڵ یەکدی توندو تۆڵ بن ، سەرکەوتوو دەبن ، بەلاَم ئەگەر دژی یەك بن ، پەرتەوازە دەبن}[2] ئنجا ئەگەر وا بوون ، ئەو کاتە بە پێی ئەو تەقوایە : خوا حاڵەتێکتان پێدەدات لە زانیاریی‌و حیکمەتدا ، کە هەق‌و ناهەقی پێ لە یەکدی جیادەکەنەوە ، وە زیانبەخش‌و سوودبەخشی پێ لە یەکدی

---

١) تفسير القرآن الحكيم ، ج ٩ ، ص ٥٥٤.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە ، بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست .

جیادەکەنەوە ، وە ڕووناکیی و تاریکیی پێ لە یەکدی جیادەکەنەوە ، وە بەڵگەو شوبهەی پێ لە یەکدی جیادەکەنەوە .

وە کە دەشفەرموێ : ﴿ وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ﴾ ، ئەوەش سەرباره ، واته : لە ئەنجامی پارێزکاربووندا ، خوا خراپەکانتان لێ دەسڕێتەوە ، وە گوناهەکانیشتان دەبوورێ ، هەندێك لە زانایان گوتوویانە : (سیئات) واته : وردە گوناهەکان ، وە (ذنوب) واتە : گوناهە گەورەکان ، بە بەڵگەی چی ؟ بە بەڵگەی ئەوەی خوای لێبوردە دەفەرموێ : ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾النساء ، واتە : ئەگەر خۆتان لەو گوناهە گەورانە کە لێتان قەدەغە کراون ، بپارێزن ، ئەوە ئێمە خراپەکانتان لێ دەسڕینەوە ، (واتە : وردە گوناهەکان) .

کەواتە : مسوڵمان تەنیا بەوە کە خۆی لە گوناهە گەورەکان دەپارێزی ، گوناهە گچکەو وردەکانی لێ دەسڕدرێنەوە .

وە کە دەفەرموێ : ﴿ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴾ ، واتە : خوا خاوەن بەخششی مەزنە ، کەواتە : بەهۆی تەقواوە ، بەڵام بەو چەمك و واتایە گشتییەی کە باسمان کرد ، بەرچاو ڕوونییمان بۆ پەیدا دەبێ ، کە چاك و خراپ ، حەڵاڵ و حەرام ، هەق و ناهەقمان بۆ دەردەکەوێ ، وە خراپەکانمان لێ دەسڕدرێنەوە ، وە لێبوردنمان بەرانبەر دەکرێ ، وە بەخششی مەزنی خواش چنگ هەموو کەس ناکەوێ و ڕەنجی دەوێ ، ئەوانە هەموو بەخششی خوان ، وە خوا ﷻ زیاتریشی لەلایە ، بەڵام ئایا خوا بەخششی خۆی بە کێ دەدات ؟

بێگومان خوای کارزان هەرکەسە لە قەدەر خۆی پێی دەبەخشێ ، بۆیە دەبێ خۆمان وا لێ بکەین ، شایستەی ئەوەبین کە خوای پەروەردگار بەخششی خۆیمان پێ ببەخشێ ، ئەگەرنا خوا لە گۆترە بە کەس نابەخشێ ، هەروەك لە گۆترەش بەخششی خۆی لە کەس ناگرێتەوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە یازدە (١١) ئایەت پێکهاتوە ، ئایەتەکانی : (٣٠ تا ٤٠) لەو یازدە ئایەتەدا ، سەرەتا خوای بەخشندە ڕوو دەکاتە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ ، وە ئەو کاتەی دەخاتەوە یاد کە بێبڕوایەکان پیلانیان لە دژ گێڕا ، کە : یان بیگرن ، یان بیکوژن ، یان دەری بکەن ، خواش پیلانەکەی هەڵوەشاندنەوەو کردی بە نەخشی سەر ئاو .

پاشان خوا باسی هەڵوێستی نەفامانەی کافرەکان دەکات لە بەرانبەر قورئاندا ، کە لافی ئەوەیان لێداوە ، وەك وی دێنن ، واتە : وەك قورئان ، کە درۆشیان کرد ، ئەدی بۆ نەیانهێنا ؟ وە بە ئەفسانەیان لە قەڵەم داوە .

ئنجا خوا ﷻ باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات ، کە گوتوویانە : ئەی خوایە ! ئەگەر قورئان هەقە ، لە ئاسمانەوە بەردبارانمان بکە ، یان سزایەکی بەئێشمان بدە ! تەماشای ئەو نەفامییە بکەن ! لە جیاتی ئەوەی بڵێن : ئەگەر هەقە هیدایەتمان بدە بۆی ! خوای دادگەریش ڕایدەگەیەنێ کە : هەتا پێغەمبەری خوایان لەنێودا بێ ، سزایان نادات ، هەروەها هەتا داوای لێبوردن لە خوا بکەن ، یا پێغەمبەریشیان ﷺ لە نێو نەمابێ ، سزایان نادات ، ئەگەرنا بەهۆی خەڵك مەنع کردنیانەوە لە مزگەوتی حەڕام ، شایستەی سزان ، هەرچەندە لافی دۆستایەتیی مزگەوتی حەڕامە لێدەدەن ، بەڵام ڕاست ناکەنو ، بەس پارێزکاران دۆستی خواو مزگەوتەکەینی .

پاشان دەیخاتە ڕوو کە نوێژو خواپەرستیی ئەوان ، لە لای مزگەوتی حەڕام ، تەنیا فیکەکێشانو چەپڵە لێدان بوو !

دوایی ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو : کە سامان خەرج کردنی کافرەکان ، بۆ دژایەتیی کردنی ئایینی خوا لە دنیادا ، جگە لە پەشیمانییو تێشکان ، هیچ ئەنجامێکی نیەو ، لە دواڕۆژیش دا بەرەو دۆزەخ خڕ دەکرێنەوە ، تاکو سەرەنجام ، خوا پیس لە پاك جیابکاتەوە ، وە لەسەر یەك کەڵەکەی بکات بەرەو دۆزەخ .

پاشان بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : کە بە کافرەکان بڵێ : ئەگەر واز بێنن ، لەوەی پێشوویان دەبوردرێنو ، ئەگەر بشگەڕێنەوە بۆ دژایەتیی ئیسلام ، ئەوە یاسای خوا دیارە لە ژیانی پێشووەکاندا ، کە هەر کەس دژایەتیی بەرنامەی خوای کردبێ ، سەرەنجامی چۆن بووە ؟!

وە لە کۆتایی دا : خوا فەرمان بە بڕواداران دەکات ، کە هەتا ئازاردانی مسوڵمانان نامێنێو ، ملکەچیی تەنیا بۆ خوا دەبێ ، لە دژی کافرەکان بجەنگن ، ئنجا ئەگەر وازیان هێنا ، ئەوە خوا بینەری کردەوەکانیانە ، وە ئەگەر هەر لەسەر هەڵوێستی خۆیشیان سوور بوون ، ئەوە با بڕواداران دڵنیابن ، کە خوای باڵادەستو زاڵ ، باشترین دۆستو سەرخەرو مشوورخۆریانە .

﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ
وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ (٣٠) وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُنَا قَالُوا۟ قَدْ
سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَـٰذَآ ۙ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ (٣١) وَإِذْ
قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣٢) وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ
فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ (٣٣) وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ
وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓا۟ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا
ٱلْمُتَّقُونَ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (٣٤) وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا
مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ (٣٥) إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ
حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ (٣٦) لِيَمِيزَ ٱللَّهُ
ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا
فَيَجْعَلَهُۥ فِى جَهَنَّمَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ (٣٧) قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِن
يَنتَهُوا۟ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُوا۟ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ (٣٨)
وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟
فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٣٩) وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ ۚ
نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ (٤٠) ﴾ .

# مانای وشــه به وشـەی ئـایـەتـەکـان

{وە (یاد بکەوە) کاتێك ئەوانەی بێبڕوان ، پیلانیان لە دژ دەگێڕای کە : یان حەپست بکەن ، یان بتکوژن ، یان دەرت بکەن ، وە ئەوان پیلانیان دەگێڕاو خواش تەگبیری دەکرد ، وە خوا باشترین تەگبیرکارە ﴿٣٠﴾ وە کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە ، گوتیان : ئەوە بیستمان ، ئەگەر بمانەوێ ئێمەش وێنەی ئەوە دەڵێین ، ئەوە تەنیا ئەفسانەکانی پێشینانن ﴿٣١﴾ وە (یاد بکەوە) کە گوتیان : ئەی خوایە ! ئەگەر ئەم (قورئان)ە هەقە ، لەلایەن تۆوەیە ، لە ئاسمانەوە بەردبارانمان بکە ، یان ئازارێکی بەئێشمان بۆ بێنە ﴿٣٢﴾ بەڵام بڕیاری خوایە کە هەتا تۆیان (ئەی موحەممەد !) لە نێودابێ ، ئازاریان نادات ، وە هەتا داوای لێبوردن (لە خوا) بکەن ئازاردەریان نابێ ﴿٣٣﴾ وە (ئەگەر لەبەر ئەو دوو هۆکارە نەبێ) بۆچی خوا ئازاریان نادات ، لە حاڵێکدا کە (خەڵکی بڕوادار) لە مزگەوتی حەرام قەدەغە دەکەن ؟ وە (هەرچەندە لافی ئەوەش لێدەدەن) بەڵام ئەوان دۆستو دڵسۆزی (مزگەوتی حەرام) نین ، بەڵکو دۆستانی وی بەس پارێزکارانن ، بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٣٤﴾ وە نوێژو خواپەرستییان لە لای ماڵ (ی خوا) تەنیا فیکە کێشانو چەپڵە لێدان بوو ، دەجا ئازار بچێژن بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون ﴿٣٥﴾ بە دڵنیاییەوە : ئەوانەی بێبڕوا بوون ، سامانەکانیان خەرج دەکەن ، تاکو (خەڵك) لە ڕێی خوا لابدەن ، ئنجا سامانەکانیان خەرج دەکەن ، دوایی تێدەشکێن ، وە ئەوانەی بێبڕوان ، بەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنەوە ﴿٣٦﴾ تاکو (سەرەنجام) خوا پیس لە پاك جیابکاتەوەو ، هەمووی لەسەر یەك کەڵەکە بکاتو ، بیخاتە دۆزەخەوە ، ئا ئەوانەن زیانباران ﴿٣٧﴾ بەوانەی کە بێبڕوان بڵێ : ئەگەر وازبێنن (لە دژایەتیی کردنی ئیسلامو مسوڵمانان) ئەوەی ڕابردوویان دەبووردرێ ،

وە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ (دژایەتیی ئیسلامو مسوڵمانان) ئەوە یاسای (خوا لە مامەڵەکردنی لەگەڵ) ڕابردووان ، تێپەڕیوە ﴿٣٨﴾ وە لە دژیان بجەنگن ، هەتا ئازاردان (ی کافران بۆ بڕواداران بە مەبەستی ڕێ لێگرتن یان هەڵگێڕانەوەیان) نامێنێو ملکەچیی (مرۆڤەکان) تەنیا بۆ خوا دەبێ (و کەس ناتوانێ خەڵك بچەوسێنێتەوە) ، ئنجا ئەگەر (بێبڕوایەکان) وازیان هێنا ، ئەوە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن ﴿٣٩﴾ وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد ، ئەوە بزانن کە خوا سەرپەرشتیارتانە (ئەویش) باشترین سەرپەرشتیارو چاکترین سەرخەرە ﴿٤٠﴾)).

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(يَمْكُرُ بِكَ ) : (الْمَكْرُ : صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يَقْصِدُهُ بِحِيلَةٍ ، وَذَلِكَ ضَرْبَانِ : مَكْرٌ مَحْمُودٌ ، وَهُوَ أَنْ يَتَحَرَّى بِذَلِكَ فِعْلَ جَمِيلٍ ، وَمَذْمُومٌ ، وَهُوَ أَنْ يَتَحَرَّى بِهِ فِعْلَ قَبِيحٍ) .

واتە : لە زمانی عەرەبیی دا وشەی : (مَكْر) بریتیە لە لادانی بەرانبەرەكەت لەو ئامانجەی دەیەوێ ، وە بە فێڵێك لایبدەی بە شێوەیەك كە بۆ خۆی هەستی پێنەكات ، جا ئەویش دوو جۆرە :

أ - فێڵی باش : كە ئەوەیە مەبەست پێی هێنانەدی كردەوەیەكی باش بێ .

ب - فێڵی خراپ : ئەویش ئەوەیە كەسێك بەهۆی ئەو فێڵەوە ، بیەوێ كردەوەیەكی خراپ ، یان ئامانجێكی خراپ بێنێتە دی ،

(لِيُثْبِتُوكَ ) : (أَي يَجْرَحُوكَ جِرَاحَةً لاَ تَقُومُ مَعَهَا ، يَسْجنُوك) .

واتە : بۆ ئەوەی بریندارت بكەن بە شێوەیەك كە نەتوانێ هەڵسیو بڕۆی ، یاخود بە مانای ئەوە دێ : كە دەیانەوێ حەپست بكەن .

(أَسَاطِيرُ ) : (جَمْعُ أُسْطُورَة نَحْو أَرْجُوحَة وَأَرَاجِيح ، وَأَثْفِيَة وَأَثَافِي ، أي شَيءٌ كَتَبُوهُ كَذِبا وَمَيْنَاً) .

واتە : (أَساطِير) كۆی (أُسْطُورَة)یە ، وەك (أَرْجُوحَة) واتە : جۆلانە ، كە بە (أَرَاجيح) كۆدەكرێتەوە ، وە (أَثْفِيَة) واتە : سێكوچكەی قابلەمەو مەنجەڵ ، كە بە (أَثَافِي) كۆدەكرێتەوە ، مەبەستیان ئەوە بووە ، كە ئەوە شتێكە بە درۆو بێ بناغە نووسراوە .

(يَصُدُّونَ ) : (الصُّدُودُ وَالصَّدُّ : قَدْ يَكُونُ إنْصِرَافاً عَنِ الشَّيءِ وَامْتِنَاعَاً ، وَقَدْ يَكُونُ صَرْفَاً وَمَنْعَاً) .

وشەی (صُدود) و (صَدّ) : بە مانای نەکردنو لادان دێ ، هەروەها بە مانای گێڕانەوە ، یان بەرپەرچ دانەوە دێ ، جا دەگونجێ خۆیان لابدەن ، یاخود خەڵك لابدەنو بیانگێڕنەوە .

(أَوۡلِيَآءَهُۥٓ) : (الوَلاءُ : القُرْبُ مَكاناً وَنسْبَةً وَدِيْناً وَصَدَاقَةً وَنُصْرَةً وَاعْتِقَاداً) .

واتە : (ولاء) بە مانای نیزیکیی دێ ، لە (وَلِي)ەوە هاتوە ، (وَلِيَ يَلِي) واتە : (قَرُبَ يَقْرُبُ) ، جا ئەو نیزیکییە لە ڕووی شوێنەوە بێ ، شتێك لە شتێکەوە نیزیکتر بێ ، یان لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە بێ ، یان لە ڕووی دینداریی‌و بردەرایەتییەوە بێ ، یان لە ڕووی یارمەتییدانەوە بێ ، یاخود لە ڕووی بیروبڕواوە بێ .

(ٱلۡبَيۡتِ ) : دیارە لە قورئاندا (بَيْت) یانی : (بَيْتُ الله الحَرَام) واتە : کەعبە ، (أَصْلُ البَيْتِ : مَأْوى الإنْسان باللَّيْلِ ، لأنَّهُ يُقَالُ : باتَ : أَقَامَ باللَّيْلِ ، وَالبَيْتُ : بَيْتُ الله) ، لە بناغەدا وشەی (بَيْت) بە مانای شوێنە حەوانەوەی ئینسان دێ بە شەو ، چونکە (بات) واتە : بە شەو مایەوە ، کەواتە : (بَيْت) ئەو شوێنەیە کە ئینسان تێیدا دەخەوێ ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی کەعبەیە .

(مُكَآءٗ ) : واتە : فیکە کێشان ، (مكأَ الطَّيْرُ ، يَمْكو مُكاءً : صَفَرَ ، وَالمُكاء ، طائِرٌ) ، باڵندە کە دەجریوێنێ ، ئەوە پێی دەگوترێ : (مُكاءُ) ، وە (مُكاء) جۆرێکە لە باڵندە ، کە دەنگێکی تیژی هەیە ، کە دیارە لێرەدا مەبەست لە (مُكاء) فیکە کێشانە ، کە چوێنراوە بە دەنگی ئەو باڵندەیە .

(وَتَصۡدِيَةٗ ) : واتە : چەپڵە لێدان ، (الصَّدَى : صَوْتٌ يَرْجِعُ إِلَيْكَ مِنْ كُلِّ مَكانٍ صَقِيل) .

(صَدَى) بریتییە لە دەنگێك کە قسە دەکەی ، بۆت دەگەڕێتەوە ، ئەو ماددانەی کە لووسو صافن ، دەنگەکە دەگێڕنەوە ، (وَالتَّصْدِية كُلّ صَوْتٍ يَجْرِي مَجْرَى الصَّدَى فِي أَن لا غِنَاء فِيهِ) .

(تَصْدِيَة) هەر دەنگێکە کە وەك (صدى) وا بێ ، وەك دەگوترێ : ئەم دەنگە (صدى)ی هەیە ، قسەیەك دەکەی دوایی دەنگەکە بۆت دەگەڕێتەوە ، لەو ڕووەوە کە هیچ سوودێکی نیە .

( حَسۡرَةً ) : (الحسْرَةُ : الغَمُّ عَلَى مَا فَاتَهُ وَالنَّدَمُ عَلَيْهِ ، كَأَنَّهُ انْحَسَرَ عَنْهُ الجَهْلُ الَّذِي حَمَلَهُ عَلَى مَا ارْتَكَبَهُ) .

(حَسْرَة) بریتیە لە غەمو خەفەت خواردن ، بەهۆی شتێکەوە کە لە دەستی چووە ، دەڵێ : (حَسْرَة) لەوەوە ناوی لێنراوە ، چونکە (حسر) واتە : قوڵی هەڵکرد ، واتە : ئەو کەسەی کە خەمی دەخوا ، قوڵی هەڵدەکاتو بەرچاوی ڕۆشن بۆتەوەو ، ئەو نەزانییەی پێشتری نەماوە .

(ٱلۡخَبِيثَ ) : (الخُبْثُ والخَبِيثُ : ما يُكْرَهُ رَدَاءَةً وَخَساسة ، مَحْسوسا كانَ أَو مَعْقُولاً).

(خُبْث) و (خَبِيثُ) : هەر شتێکە کە لەبەر خراپیی‌و بێ کەڵکیی ، نەویسترێ ، جا شتێکی بەرهەست بێ ، یاخود لە ڕووی مەعنەوییەوە بەکەڵك نەهاتووبێ ، (الخَبائِثُ جَمْعُ الخَبيث : مَا لاَ يُوَافِقُ النَّفسِ مِنَ المَحْظُورات) .

واتە : (خَبائِث) کۆی (خَبِيث)ەو هەر شتێکە کە موافقی سروشتی ئینسان نەبێو ، ئینسان پێی خۆش نەبێ ، وە پێی چاك نەبێ .

(ٱلطَّيِّبِ ) : (أَصلُ الطيِّبِ : مَا تَسْتَلِذُّهُ الحَوَاسُّ ، وَمَا تَسْتَلِذُّهُ النَّفسُ ، وَفِي الشَّرْعِ : مَا كانَ مُتَنَاوَلاً مِنْ حَيْثُ مَا يَجُوزُ) .

واتە : ئەسڵی (طَيِّب) هەر شتێکە کە هەستەوەرەکان چێژی لێوەربگرن ، وە نەفسی ئینسان چێژی لێوەربگرێ ، (طَيِّب) لە ڕووی شەرعەوە ، هەر شتێکە کە شەرع ڕێیدابێ ، ئەو شتە وەربگیرێو بەکاربهێنرێ .

(فَيَرۡكُمَهُۥ) : (الرُّكامُ : مَا يُلْقى بَعْضُهُ عَلَى بَعْض).

(رُكام) هەر شتێکە کەڵەکە کرابێو کۆکرابێتەوە سەریەك .

(سُنَّتُ ) : (سنة الله : قَدْ تُقَالُ لِطَرِيقَة تعامله مع عبادِهِ) .

(سنة الله) واتە : ئەو ڕێبازو یاسایانەی کە خوا لێیانەوە ، مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات .

(ٱلْمَوْلَىٰ ) : (الولي) هەردووکیان بە مانای نیزیكو دۆستو پشتیوانو سەرخەر ، دێن .

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١ / هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ .

ئێمە دوو بەسەرهات دەگێڕینەوە بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ، هەڵبەتە هۆی هاتنە خوار بەو واتایەی کە شتێك ڕابردوە لە قۆناغی مەککە ، لە دوای جەنگی بەدر ، خوای پەروەردگار دەیخاتەوە بیری پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان ، تاکو بزانن کە ئەو خوایەی لە جەنگی بەدردا سەری خستن ، پێشتریش لە قۆناغی مەککەدا ، هەر ئەو خوایە بوو ، پیلانی کافرەکانی لە دژی پێغەمبەر ﷺ پووچەڵ کردەوەو لە دەستی کافرەکانی دەرباز کرد :

أ) ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ : تَشَاوَرَتْ قُرَيْشٌ لَيْلَةً بِمَكَّةَ ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ : إِذَا أَصْبَحَ ، فَأَثْبِتُوهُ بِالْوِثَاقِ يُرِيدُونَ النَّبِيَّ ﷺ ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ : أُقْتُلُوهُ ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ : بَلْ أَخْرِجُوهُ ، فَأَطْلَعَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ ﷺ عَلَى ذَلِكَ ، فَبَاتَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ عَلَى فِرَاشِ رَسُولِ اللهِ ﷺ تِلْكَ اللَّيْلَةَ ، وَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى لَحِقَ بِالْغَارِ ، وَبَاتَ الْمُشْرِكُونَ يَحْرُسُونَ عَلِيًا يَحْسَبُونَ أَنَّهُ النَّبِيُّ ﷺ ، فَلَمَّا أَصْبَحُوا ثَارُوا إِلَيْهِ ، فَلَمَّا رَأَوْا عَلِيًّا ، رَدَّ اللهُ مَكْرَهُمْ ، قَالُوا : أَيْنَ صَاحِبُكَ هذا ؟ قَالَ : لاَ أَدْرِي ، فَاقْتَفُوا أَثَرَهُ ، فَلَمَّا بَلَغُوا الْجَبَلَ ، اخْتَلَطَ عَلَيْهِمْ ، فَصَعِدُوا فِي الْجَبَلِ فَمَرُّوا بِالْغَارِ ، فَرَأَوْا عَلَى بَابِهِ نَسْجَ الْعَنْكَبُوتِ ، فَقَالُوا : لَوْ دَخَلَ هُنَا لَمْ يَكُنْ نَسْجُ الْعَنْكَبُوتِ عَلَى بَابِهِ ، فَمَكَثَ فِيهِ ثَلاَثاً﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، بِرقم : (٣٢٥١) تعليق شعيب الأرنؤوط : إِسنادُهُ ضَعِيف ، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الكَبير) برقم : (١٢١٥٥) ، وَعَبْدالرَّزَاق فِي (المصَنَّف) برقم : (٩٧٤٣) ، وَحَسَنهُ الحَافظ ابْنُ حَجَر فِي (فتح الباري) ج ٧ ، ص ١٦٨} .

واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : قورەیشییەکان شەوێك لە مەککە ڕاوێژیان کرد ، دەربارەی پێغەمبەر ﷺ ، هەندێکیان گوتیان : ئەگەر بەیانی ڕۆژ بۆوە ، بە کەلەپچەوە بیبەستنەوە (واتە : حەپسی بکەن) ، وە هەندێکیان گوتیان : بیکوژن ، وە هەندێکیان گوتیان : بەڵکو دەری بکەن ، خوای پەنهانزانیش پێغەمبەری خۆی ﷺ لەوە ئاگادار کردەوە ، بۆیە عەلی کوڕی ئەبی طالیب لە جێگای پێغەمبەری خوادا خەوت ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ چووە دەر ، هەتاکو چووە نێو ئەشکەوتەکە ، وە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش ئێشکەیان لە عەلی دەگرت ، وایانزانی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، کاتێك ڕۆژیان کردەوەو بەرەو ڕووی چوون ، تەماشایان کرد (عەلی)یە خوا لێی ڕازی بێ ، خوا پیلانەکەی ئەوانی پووچەڵ کردەوە ، گوتیان : کوا ئەو برادەرەت ؟ گوتی : نازانم ، ئەوانیش بە شوێن پێیدا ڕۆیشتن ، تاکو گەیشتنە چیایەکە ، لەوێ لێیان تێکەڵ بوو ، هەندێك بەملاو هەندێك بەولادا چوون ، دوایی تەماشای ئەشکەوتەکەیان کرد ، تەونی جاڵجاڵۆکەی بە دەرگای ئەشکەوتەکە چنرابوو ، گوتیان : ئەگەر چووبایە نێو ئەم ئەشکەوتە ، ئەم تەونی جاڵجاڵۆکەیە لێرە نەدەبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ شەوان لە ئەشکەوتەکەدا مایەوە .

هەڵبەتە دوایی چوو بۆ مەدینە ، ئەمە ڕیوایەتێکی کورتە .

ب/ ئیبنو هیشام ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە (السيرة النبوية)دا ، کە دیارە هەم لە ئیبنو ئیسحاقەوە دێنێ ، وە هەم خۆشی زیادەی ڕەگەڵ دەخات ، لە لاپەڕە (٢٤٩ تا ٢٥١) بە درێژیی باسی ئەو پیلانگێڕانەی کافرەکانی مەککە ، وە باسی پووچەڵکردنەوەی پیلانەکەیان لەلایەن خوای پەنهانزانەوە ، دەکات ، کە لە چوار بڕگەدا دەیهێنین ، لە ژێر ناوونیشانی :

## كۆبوونەوەی قسەڕۆیشتووانی قورەیش و ڕاوێژكردنیان دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دا

## اجْتِمَاعُ الْمَلأِ مِنْ قُرَيْشٍ وَتَشَاوُرُهُمْ فِي أَمْرِ الرّسولِ ﷺ :

١) {قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : وَلَمّا رَأَتْ قُرَيْشٌ أَنّ رَسولَ اللّهِ ﷺ قَدْ صارَتْ لَهُ شِيعَةٌ وَأَصْحَابٌ مِنْ غَيْرِهِمْ بِغَيْرِ بَلَدِهِمْ ، وَرَأَوْا خُرُوجَ أَصْحَابِهِ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ إلَيْهِمْ ، عَرَفُوا أَنّهُمْ قَدْ نَزَلُوا دَارًا ، وَأَصَابُوا مِنْهُمْ مَنَعَةً ، فَحَذِرُوا خُرُوجَ رَسولِ اللّهِ ﷺ إلَيْهِمْ ، وَعَرَفُوا أَنّهُمْ قَدْ أَجْمَعَ لِحَرْبِهِمْ ، اجْتَمَعُوا لَهُ فِي دَارِ النّدْوَةِ (وَهِيَ دَارُ قُصَيّ بْنِ كِلَابٍ الّتِي كَانَتْ قُرَيْشٌ لا تَقْضِي أَمْرًا إلاَّ فِيهَا) يَتَشَاوَرُونَ فِيهَا مَا يَصْنَعُونَ فِي أَمْرِ رَسولِ اللّهِ ﷺ حَيْنَ خَافُوهُ} .

واتە : ئیبنو ئیسحاق دەڵێ : كاتێك قورەیشییەكان بینییان كە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵو لایەنگری بۆ پەیدابوون ، لە خەڵكی دیكەی جیا لەوان ، وە لە وڵاتی دیكەی جیا لە وڵاتی ئەوان ، (مەبەست پێی كۆچ كردنی هاوەڵانە بۆ مەدینە ، وە پەیمان پێدانی خەڵكی مەدینەیە بە پێغەمبەر ﷺ ، لە پەیمانی یەكەمو دووەمی عەقەبەدا) وە بینییان كە هاوەڵەكانی لە كۆچكەران بەرەو ئەوانە دەچن ، كە پشتیوانی پێغەمبەر دەكەن ، وە زانییان كە مەنزڵگایان بۆ پەیدا بووە ، وە لەوێ هێزو پێو پشتیوانێكیان بۆ پەیدا بووە ، لەبەر ئەوە مەترسییان هەبووە لە دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لایان ، وە دەیانزانی ، كە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ دەربچێ ، جەنگیان لە دژ دەكات ، بۆیە لە (دَار النَّدْوَة) كۆبوونەوە ، كە خانووی قوصەی كوڕی كیلاب بوو ، كە قورەیشییەكان هیچ كارێكیان نەدەكرد ، مەگەر لەو خانووەی قوصەی كوڕی كیلاب دا ، كە ناویان نابوو (دَار النَّدْوَة) واتە : مەنزڵگای ڕاوێژو پرسو ڕا پێكردنو توێژینەوە ، ڕاوێژو تەگبیریان لەبارەوە كردبایە، لەوێدا كۆبوونەوەو ڕاوێژیان كرد ، كە ئایا دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بكەن ؟ كاتێك مەترسییان لێی هەبوو كە بڕوات .

٢) {عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ : لَمّا أَجمَعُوا لِذَلِكَ وَاتّعَدُوا أَنْ يَدْخُلُوا فِي دَارِ النّدْوَةِ لِيَتَشاوَرُوا فِيهَا فِي أَمْرِ رَسولِ اللهِ ﷺ غَدَوْا فِي الْيَوْمِ الّذِي اتّعَدُوا لَهُ وَكَانَ ذَلِكَ الْيَوْمُ يُسَمّى يَوْمَ الزّحْمَةِ ، فَاعْتَرَضَهُمْ إبْلِيسُ فِي هَيْئَةِ شَيْخٍ جَلِيلٍ ، عَليه بَتٌّ [١] له فَوَقَفَ عَلَى بَابِ الدّارِ ، فَلَمّا رَأَوْهُ وَاقِفًا عَلَى بابِهَا ، قَالُوا : مَنِ الشّيْخُ ؟ قَالَ شَيْخٌ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ سَمِعَ بِالّذِي اتّعَدْتُمْ لَهُ فَحَضَرَ مَعَكُمْ ، لِيَسْمَعَ مَا تَقُولُونَ ، وَعَسَى أَنْ لا يُعْدِمَكُمْ مِنْهُ رَأْيًا وَنُصْحًا ، قَالُوا : أَجَلْ فَادْخُلْ ، فَدَخَلَ مَعَهُمْ}.

واتە : عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : کاتێك یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوە ، وە کاتیان دیاری کردو بەڵێنیاندا بچنە (دَار النَّدْوَة)وە ، بۆ ئەوەی دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەوە قسە بکەن ، وە ئەو ڕۆژەی کە بڕیاریان دابوو ، بەیانیەکەی چوون ، ئەویش ئەو ڕۆژە بوو کە لەلای قوڕەیشییەکان پێی دەگوترا : (يَوْمَ الزّحْمَةِ) ، ئیبلیس لە شێوەی پیاوێکی بە تەمەنی بە ویقاردا ، کە بەرگێکی ئەستووری لەبەردا بوو ، چووە پێشیانو لەبەر دەرگای خانووەکە ڕاوەستا ، کاتێك کە لەبەر دەگا بینییان ، گوتیان : ئەو پیاوە بە تەمەنە کێیە ؟

ئەویش گوتی : من پیاوێکی بە تەمەنم خەڵکی ناوچەی نەجدم ، بیستوومە ئەوەی کە ئێوە بۆی کۆبوونەوە ، دەمەوێ لەگەڵتان ئامادە بم ، تاکو بزانم چی دەڵێن ؟ بەڵکو دڵسۆزیو ڕایەکی سوود بەخشم بۆ ئێوە هەبێ ، گوتیان : فەرموو وەرە ژوورێ ، چووە ژوورێ .

٣) {وَقَدْ اجْتَمَعَ فِيهَا أَشْرَافُ قُرَيْشٍ ، مِنْ بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ : عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ ، وَمِنْ بَنِي نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ : طُعَيْمَةُ بْنُ عَدِيّ ، وَجُبَيْرُ بْنُ مُطْعَمٍ ، وَالْحَارِثُ بْنُ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلٍ ، وَمِنْ بَنِي عَبْدِ الدّارِ بْنِ قُصَيّ : النّضْرُ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ كِلْدَةَ ، وَمِنْ بَنِي أَسدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزّى : أَبُو الْبَخْتَرِيّ بْنُ هِشامٍ ، وَزَمْعَةُ بْنُ الأَسودِ بْنِ الْمُطّلِبِ ، وَحَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ ، وَمِنْ بَنِي مَخْزُومٍ : أَبُو جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ ، وَمِنْ بَنِي سَهْمٍ : نُبَيْهٌ وَمُنَبّهٌ ابْنَا الْحَجاجِ ، وَمِنْ بَنِي جُمَحٍ : أُمَيّةُ

١) البَتُّ : كِساءٌ غليظ من صوفٍ أو وَبَرٍ، المعجم الوسيط ، ص ٣٧.

بْنُ خَلَفٍ ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُمْ وَغَيْرُهُمْ مِمَّنْ لا يُعَدّ مِنْ قُرَيْشٍ . فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ : إنّ هَذَا الرّجُلَ قَدْ كَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا قَدْ رَأَيْتُمْ ، فَإِنَّا وَاللّهِ مَا نَأْمَنُهُ عَلَى الْوُثُوبِ عَلَيْنَا فِيمَنْ قَدْ اتّبَعَهُ مِنْ غَيْرِنَا ، فَأَجْمِعُوا فِيهِ رَأْيا ، قَالَ فَتَشَاوَرُوا ، ثُمّ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ : احْبِسُوهُ فِي الْحَدِيدِ وَأَغْلِقُوا عَلَيْهِ بَابًا ، ثُمّ تَرَبّصُوا بِهِ مَا أَصَابَ أَشْبَاهَهُ مِنْ الشّعَرَاءِ الّذِينَ كَانُوا قَبْلَهُ : زُهَيْرًا وَالنّابِغَةَ ، وَمَنْ مَضَى مِنْهُمْ مِنْ هَذَا الْمَوْتِ ، حَتّى يُصِيبَهُ مَا أَصَابَهُمْ ، فَقَالَ الشّيْخُ النّجْدِيّ : لا وَاللّهِ مَا هَذَا لَكُمْ بِرَأْيٍ ، وَاللّهِ لَئِنْ حَبَسْتُمُوهُ كَمَا تَقُولُونَ ، لَيَخْرُجَنّ أَمْرُهُ مِنْ وَرَاءِ الْبَابِ الّذِي أَغْلَقْتُمْ ، يُكَاثِرُوكُمْ بِهِ حَتّى يَغْلِبُوكُمْ عَلَى أَمْرِكُمْ مَا هَذَا لَكُمْ بِرَأْيٍ ، فَانْظُرُوا فِي غَيْرِهِ .

فَتَشَاوَرُوا ، ثُمّ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ : نُخْرِجُهُ مِنْ بَيْنِ أَظْهُرِنَا ، فَنَنْفِيهِ مِنْ بِلادِنَا ، فَإِذَا أُخْرِجَ عَنّا ، فَوَاللّهِ مَا نُبَالِي أَيْنَ ذَهَبَ ، وَلا حَيْثُ وَقَعَ ، إذَا غَابَ عَنّا وَفَرَغْنَا مِنْهُ ، فَأَصْلَحْنَا أَمْرَنَا وَأُلْفَتْنَا كَمَا كَانَتْ .

فَقَالَ الشّيْخُ النّجْدِيّ : لا وَاللّهِ مَا هَذَا لَكُمْ بِرَأْيٍ ، أَلَمْ تَرَوْا حُسْنَ حَدِيثِهِ وَحَلاوَةَ مَنْطِقِهِ وَغَلَبَتِهِ عَلَى قُلُوبِ الرّجَالِ بِمَا يَاتِي بِهِ ، وَاللّهِ لَوْ فَعَلْتُمْ ذَلِكَ مَا أَمِنْتُمْ أَنْ يَحِلّ عَلَى حَيّ مِنْ الْعَرَبِ ، فَيَغْلِبَ عَلَيْهِمْ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِ وَحَدِيثِهِ ، حَتّى يُتَابِعُوهُ عَلَيْهِ ، ثُمّ يَسِيرُ بِهِمْ إلَيْكُمْ ، حَتّى يَطَاكُمْ بِهِمْ فِي بِلادِكُمْ ، فَيَأْخُذَ أَمْرَكُمْ مِنْ أَيْدِيكُمْ ، ثُمّ يَفْعَلَ بِكَمْ مَا أَرَادَ ، دَبّرُوا فِيهِ رَأْيا غَيْرَ هَذَا .

قَالَ فَقَالَ أَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ : وَاللّهِ إنَّ لِي فِيهِ لَرَأْيًا مَا أَرَاكُمْ وَقَعْتُمْ عَلَيْهِ بَعْدُ ، قَالُوا : وَمَا هُوَ يَا أَبَا الْحَكَمِ ؟ قَالَ : أَرَى أَنْ نَأْخُذَ مِنْ كُلّ قَبِيلَةٍ فَتًى شَابًا جَلِيدًا نَسِيبًا وَسِيطًا فِينَا ، ثُمّ نُعْطِي كُلّ فَتًى مِنْهُمْ سَيْفًا صَارِمًا ، ثُمّ يَعْمِدُوا إلَيْهِ فَيَضْرِبُوهُ بِهَا ضَرْبَةَ رَجُلٍ وَاحِدٍ ، فَيَقْتُلُوهُ ، فَنَسْتَرِيحَ مِنْهُ ، فَإِنّهُمْ إذَا فَعَلُوا ذَلِكَ تَفَرّقَ دَمُهُ فِي الْقَبَائِلِ جَمِيعًا ، فَلَمْ يَقْدِرْ بَنُو عَبْدِ مَنَافٍ عَلَى حَرْبِ قَوْمِهِمْ جَمِيعًا ، فَرَضُوا مِنّا بِالْعَقْلِ فَعَقَلْنَاهُ لَهُمْ .

قَالَ : فَقَالَ الشّيْخُ النّجْدِيّ : الْقَوْلُ مَا قَالَ الرّجُلُ هَذَا الرّأْيُ الّذِي لا رَأْيَ غَيْرُهُ ، فَتَفَرّقَ الْقَوْمُ عَلَى ذَلِكَ وَهُمْ مُجْمِعُونَ لَهُ...} .

واتە : کاتێك کە سەرانو قسە ڕۆیشتووانی قورەیش کۆبوونەوە ، کە لە (بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ) عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو ، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بوون ، وە لە (بَنِي نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ مَنَاف) : طوعەیمەی کوڕی عەدیيو ، جوبەیری کوڕی موطعیم و ، حارسی کوڕی عامری کوڕی نەوفەل ، وە لە (بَنِي عَبْدِ الدَّارِ بْنِ قُصَيّ) نەزری کوڕی حارسی کوڕی کیلدە ، وە لە (بَنِي أَسد بْنِ عَبْدِ الْعُزّى) ئەبو لبەختەریی کوڕی هیشامو ، زومعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی موتتەلیبو ، حەکیمی کوڕی حیزام ، وە لە (بَنِي مَخْزُومٍ) ئەبو جەهلی کوڕی هیشام ، وە لە (بَنِي سَهْمٍ) ، (نُبَيْهٌ وَمُنَبّهٌ) کوڕانی حەججاج ، وە لە (بَنِي جُمَح) ئومییەی کوڕی خەلەف ، هەروەها جگە لەوانەش خەڵکی دیکەشیان لەگەڵدا هەبوو ، وە لە هۆزی قورەیش نەدەژمێردران هێندە زۆر بوون ، وە خەڵکی دیکەشیان تێدابوو کە لە هۆزی قورەیش نەبوو ، هەندێکیان بە هەندێکیان گوت : بۆ خۆتان دەزانن : ئەو پیاوە تا ئێستا چی کردووەو چۆنی کردوە ؟! (واتە : موحەممەد ﷺ) سوێند بە خوا ئێمە لەوە دڵنیانین کە ئەگەر بچێتە ئەو شوێنەی کە شوێنکەوتووانی کۆچیان بۆ کردوە (واتە : مەدینە) ، وە دوایی هەموویان یەکدەنگ بنو دژایەتیی ئێمە بکەن ، با ڕاوێژ بکەین ، بزانین چی بکەین باشە ؟

یەکێکیان گوتی : پێم باشە کەلەپچەی ئاسنی بخەینە دەستو پێ ، وە حەپسی بکەین ، وە دەرگای لەسەر دابخەین ، دوایی لێی دەگەڕێین وەك ئەو شاعیرانەی پێش خۆی ، وەك زوهەیرو نابیغە وەك خەڵکی دیکەی غەیری وانیش کە قسەی وایان کردووەو بیروڕای وایان هەبووەو ، مەترسییمان لێیان هەبووە ، حەپسمان کردوون تاکو مردوون ، ئەویش حەپس دەکەین تاکو دەمرێ .

پیاوە بە تەمەنە نەجدییەکە (کە مەبەست ئیبلیسە ، بەڵام لە شێوەی پیاوێکی بە تەمەن دا بوو) گوتی : نەخێر ، بە خوا ئەوە ڕایەکی باش نیە ، بەخوا ئەگەر بێتو حەپسی بکەن ، وەك ئێوە دەیڵێن ، دوایی ئیشەکەی وی لە پشت دەرگاوە کە لێتان داخستوە ، بەرەو هاوەڵەکانی دەچێ ، وە زۆر نیزیکە کە هاوەڵەکانی لێتان ڕاببەڕن ، وە پەلامارتان بدەن ، وە شەڕیشتان لەگەڵدا بکەنو بەسەریشتاندا زاڵ بن ، بۆیە ئەوە ڕایەکی باش نیە ، بزانن ڕایەکی دیکە هەڵبژێرن .

دووبارە ڕاویژیان کردەوە ، یەکێکی دیکە گوتی : لە نێو خۆماندا نەفی دەکەین ، دووری دەخەینەوە بۆ شوێنێکی دیکە ، هەر کاتێك لە نێو ئێمەدا نەما ، ئەو کاتە گوێ نادەینێ داخۆ بۆ کوێ دەچێو چی لێدێ ؟ وە ئەگەر لێرە نەما ئێمە لە دەستی دەربازمان دەبێ ، وە ئێمەش ئەوکاتە کاروباری خۆمان چاك دەکەینەوە ، وە ئەو تەباییەی هەمان بوو پێش ئەوەی ئەو باسی پێغەمبەرایەتیی بکات ، ئەو تەباییە بۆ نێو خۆمان دەگێڕینەوە .

پیاوە بە تەمەنە نەجدییەکە گوتی : سوێند بە خوا ئەوەش ڕایەکی باش نیە ، ئایا تەماشا ناکەن قسەی چەند چاکە ، گفتوگۆی چەند شیرینە ، وە چۆن بەو قسانەی کە هێناونی بەسەر دڵی پیاواندا زاڵ دەبێ ، بە خوا ئەگەر وابکەن ، ئەوە ئێوە دڵنیا نابن ، کە بچێتە لای هۆزێك لە هۆزەکانی عەرەب ، ئیقناعیان بکات ، بەهۆی قسەی خۆشیو وتەی جوانی ، وە دوایی لەگەڵ ئەو هۆزەدا بێتو بەسەرتاندا بدات ، وە کاروبارتان لە دەست دەربێنێ ، وە ئەوەی بیەوێ پێتان بکات ، بۆیە بۆ ڕایەکی دیکە بگەڕێن ، ئەم ڕایە بەکەڵك نایەت .

ئەبو جەهلی کوڕی هیشام گوتی : بە خوا من ڕایەکەم هەیە ، پێم وایە تاکو ئێستا ئێوە پەیتان بەو ڕایە نەبردوە .

گوتیان : ئەی ئەبو لحەکەم ! ڕایەکەت چییە ؟

گوتی : من ڕام وایە کە لە هەر هۆزێك لە هۆزەکان ، گەنجێکی بە تینو تاقەتی خاوەن ڕەچەڵەکی خۆشەویست لە نێوماندا بێنین ، وە هەر کامێك لەوانە شمشێرێکی پێ بدەین ، پاشان ئەو گەنجانە هەموویان وەك یەك پیاو هێرشی بکەنە سەری ، پێکەوە لێی بدەنو بیکوژن ، ئەو کاتە ئێمە لێی دەرباز دەبینو ئاسوودە دەبین ، وە ئەگەر واشمان کرد ، خوێنەکەی لە نێو هۆزەکانی هەموو عەرەبدا بڵاو دەبێتەوە ، وە (بَنُو عَبْد مَنَاف) ناتوانن شەڕ لەگەڵ هەموو هۆزەکاندا بکەن ، بۆیە ڕازی دەبن کە خوێنیان بدەینێ ، ئێمەش خوێنیان دەدەینێ .

پیاوە پیرە نەجدییەکە گوتی : ڕای ڕاست ئەوەیە کە ئەم پیاوە گوتی ، وە منیش جگە لەو ڕایەم پێ باش نیە ، خەڵکەکە لەسەر ئەو ڕایە ڕێککەوتن .

٤) کە باسی بە جێهێشتنی عەلییە خوا لێی ڕازی بێ لەسەر جێی پێغەمبەری خوا ﷺ ، {فَأَتَى جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ رَسولَ اللهِ ﷺ ، فَقَالَ : لا تَبِتْ هَذِهِ اللَّيْلَةَ عَلَى فِرَاشِكَ الَّذِي كُنْتَ تَبِيتُ عَلَيْهِ ، قَالَ : فَلَمَّا كَانَتْ عَتَمَةٌ مِنَ اللَّيْلِ اجْتَمَعُوا عَلَى بَابِهِ يَرْصُدُونَهُ مَتَى يَنَامُ ، فَيَثِبُونَ عَلَيْهِ ، فَلَمَّا رَأَى رَسولُ اللهِ ﷺ ، مَكَانَهُمْ ، قَالَ لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ : نَمْ عَلَى فِرَاشِي وَتَسَجَّ بِبُرْدِي هَذَا الأَخْضَرِ ، فَنَمْ فِيهِ ، فَإِنَّهُ لَنْ يَخْلُصَ إِلَيْكَ شَيْءٌ تَكْرَهُهُ مِنْهُمْ ، وَكَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَنَامُ فِي بُرْدِهِ ذَلِكَ إِذَا نَامَ .

لَمَّا اجْتَمَعُوا لَهُ وَفِيهِمْ أَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ ، فَقَالَ وَهُمْ عَلَى بَابِهِ : إِنَّ مُحَمَّدًا يَزْعُمُ أَنَّكُمْ إِنْ تَابَعْتُمُوهُ عَلَى أَمْرِهِ ، كُنْتُمْ مُلُوكَ الْعَرَبِ وَالْعَجَمِ ، ثُمَّ بُعِثْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ ، فَجُعِلَتْ لَكُمْ جِنَانٌ كَجِنَانِ الأُرْدُنِّ ، وَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا ، كَانَ لَهُ فِيكُمْ ذَبْحٌ ، ثُمَّ بُعِثْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ ، ثُمَّ جُعِلَتْ لَكُمْ نَارٌ تُحْرَقُونَ فِيهَا .

قَالَ : وَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسولُ اللهِ ﷺ فَأَخَذَ حَفْنَةً مِنْ تُرَابٍ فِي يَدِهِ ، ثُمَّ قَالَ : أَنَا أَقُولُ ذَلِكَ وَأَنْتَ أَحَدُهُمْ ، وَأَخَذَ اللهُ تَعَالَى عَلَى أَبْصَارِهِمْ عَنْهُ ، فَلا يَرَوْنَهُ فَجَعَلَ يَنْثُرُ ذَلِكَ التُّرَابَ عَلَى رُءُوسِهِمْ ، وَهُوَ يَتْلُو هَؤُلاءِ الآيَاتِ مِنْ يس :

﴿ يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ ﴾ ، إِلَى قَوْلِهِ ﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ ﴾ ، حَتَّى فَرَغَ رَسولُ اللهِ ﷺ مِنْ هَؤُلاءِ الآيَاتِ وَلَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ رَجُلٌ إِلاَّ وَقَدْ وَضَعَ عَلَى رَأْسِهِ تُرَاباً ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى حَيْثُ أَرَادَ أَنْ يَذْهَبَ ، فَأَتَاهُمْ آتٍ مِمَّنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ فَقَالَ : مَا تَنْتَظِرُونَ هَاهُنَا ؟ قَالُوا : مُحَمَّداً ، قَالَ : خَيَّبَكُمُ اللهُ قَدْ وَاللهِ خَرَجَ عَلَيْكُمْ مُحَمَّدٌ ، ثُمَّ مَا تَرَكَ مِنْكُمْ رَجُلاً ، إِلاَّ وَقَدْ وَضَعَ عَلَى رَأْسِهِ تُرَابا ، وَانْطَلَقَ لِحَاجَتِهِ ، أَفَمَا تَرَوْنَ مَا بِكُمْ ؟ قَالَ : فَوَضَعَ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ فَإِذَا عَلَيْهِ تُرَابٌ ، ثُمَّ جَعَلُوا يَتَطَلَّعُونَ فَيَرَوْنَ عَلِياً عَلَى الْفِرَاشِ مُتَسَجِّياً بِبُرْدِ رَسولِ اللهِ ﷺ فَيَقُولُونَ : وَاللَّهِ إِنَّ هَذَا لَمُحَمَّدٌ نَائِماً ، عَلَيْهِ بُرْدُهُ ، فَلَمْ يَبْرَحُوا كَذَلِكَ ، حَتَّى أَصْبَحُوا فَقَامَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ الْفِرَاشِ فَقَالُوا : وَاللهِ لَقَدْ كَانَ صَدَقَنَا الَّذِي حَدَّثَنَا} .

واتە : جبریل هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە پێی فەرموو : ئەم شەو لە جێگاکەی خۆتدا کە پێشتر لێی دەخەوتی ، مەخەوە ، جا کاتێك کە شەو داهات ، کافرەکان کە بڕیار بوو هەموو پێکەوە وەك یەك پیاو هێرشی بکەنە سەریٚو بیکوژن ، لەبەر دەرگاکەی کۆبوونەوە ، وە چاوەڕیٚ بوون کە کەی دەخەویٚ ، وە پاشان هەموو هێرشی بکەنە سەریٚ ، وە پاشان کە پێغەمبەری خوا ﷺ بینی لەو شوێنەن ، فەرمووی : تۆ لەم جێگایەی مندا بخەوە ، وە ئەم بوڕدە[١] حەزرەمییە سەوزەی من بەسەر خۆت دا بدە ، وە تێیدا بخەوە ، وە دڵنیابە کە لەوانەوە هیچ زیانێکت پێناگات ، پێت ناخۆش بیٚ ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وا بوو ئەو بوڕدەی بە خۆی دادەدا .

ئنجا کاتێك کە کۆبوونەوە ئەبو جەهلی کوڕی هیشامیشیان لەگەڵدا بوو ، ئەبو جەهل گوتی : موحەممەد پێی وایە ئەگەر شوێنی بکەون (واتە : شوێن بەرنامەکەی بکەون) ، ئێوە دەبن بە پاشای عەرەبو جگە لە عەرەبان ، وە دوای مردنیشتان زیندوو دەکرێنەوە ، وە چەندان باغو بێستانی وەك باغو بێستانەکانی ئوردونتان پیٚ دەدریٚ ، وە ئەگەر شوێنی نەکەون ، ئەوە لەلایەن ویەوە تووشی کوژرانو سەربڕدران دەبن ، وە دوایی پاش مردنیشتان زیندوو دەکرێنەوەو ، ئاگرێکتان بۆ ساز دەکریٚو تێیدا دەسووتێنرێن (واتە : بە تەوسو توانجەوە ئەم قسانەی کردن) .

پێغەمبەری خواش ﷺ هاتەدەر لە ماڵەکەی خۆی ، وە چنگە خۆڵێکی هەڵگرتو دوایی فەرمووی : ﴿أَنَا أَقُولُ ذَلِكَ وأَنْتَ أَحَدُهُمْ﴾.

واتە : بەڵیٚ من وا دەڵێمو تۆش یەکێکیانی ، وە خوای پەروەردگاریش چاویانی گرت ، پێغەمبەری خوایان ﷺ نەبینی ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ چنگە خۆڵێکی بەسەر سەریان دا کرد ، لە کاتێکدا کە ئەم ئایەتانەی سووڕەتی (یس)ی دەخوێندەوە : ﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ۝٢ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٣ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝٤ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ۝٥﴾ تاکو دەگاتە : ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنۢ

---

١) بورد : قوماشێکی ئەستوورە ، وەك لێفەو بەتانیی ئەم سەردەمە وابووە ، بۆ بەخۆدادانو خەوتن بەکارهاتوە.

﴿ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ ﴾ ، وە هیچ پیاوێك لەوانەی كە لەبەر دەرگای پێغەمبەر بوون ، نەما ، كە لەو چنگە خۆڵەی نەكەوێتە سەر سەر ، وە پێغەمبەری خواش بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت كە دەیوست .

ئەوانیش هەر لەوێ بوون ، كە یەكێك هات بۆ لایان كە لەگەڵ وان نەبوو ، گوتی : چاوەڕێی چی دەكەن لێرە ؟ گوتیان : چاوەڕێی موحەممەد دەكەین ، گوتی : خوا بەدبەختتان بكات ! موحەممەد بە لاتاندا ڕۆیشتە دەر ، وە هیچ كامێكی لە ئێوە نەهێشتۆتەوە ، تۆزە خۆڵێكی نەخستبێتە سەر سەر ، وە موحەممەد بۆ ئیشی خۆی ڕۆیی ، ئایا نابینن چیتان لێ هاتوە ، دەڵێ : هەر كامێك لەو پیاوانە دەستی گەیاندە سەری ، تەماشای كرد : تۆزە خۆڵێكی لەسەرە .

ئنجا دوایی تەماشای ژوورەكەیان كرد ، بینییان عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) لەسەر جێگای پێغەمبەرە ﷺ و ئەو پێخەفەی پێغەمبەری خوای ﷺ بەخۆی داداوە ، ئەوانیش گوتیان : بە خوا ئەوە موحەممەدە ، خەوتوەو پێخەفەكەش هەر هی موحەممەدە ، بۆیە هەر لەوێ بوون تاكو ڕۆژیان كردەوە ، كە ڕۆژداهات عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) لەسەر جێگایەكەی هەڵسا ، گوتیان : وا دیارە ئەو كەسەی كە هەواڵەكەی بۆ هێنابووین ، ڕاستی كردوە .

٢ / هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی كە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ ، ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه ، قَالَ : قَالَ أَبُو جَهْلٍ : اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هذا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ ، فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ، فَنَزَلَتْ : ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ فِي (التفسير) برقم : (٤٣٧١) ، وَمُسْلِم فِي (ذكر المنافقين والكفار) برقم : (٢٦٩٧)} .

واتە : ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) ، دەڵێ : ئەوە ئەبو جەهل بوو کە گوتی : خوایە ! ئەگەر ئەم (قورئان)ە هەقە لەلایەن تۆوە ، بەردبارانمان بکە لە ئاسمانەوە ، یاخود سزایەکی بە ئێشمان بۆ بێنە ، خوای بەرزیش ئەمەی دابەزاند : ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ .

٣ / هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ ، ﴿عَنِ الزّهْرِيّ وَمُحَمّدُ بْنُ يَحْيَى وَعَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ وَالْحُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرّحْمَنِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ : أُصِيبَ يَوْمَ بَدْرٍ مِنْ كُفَّارِ قُرَيْشٍ : أَصْحَابُ الْقَلِيبِ ، وَرَجَعَ كُلُّهُمْ إِلَى مَكَة ، وَرَجَعَ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ بَعِيرِهِ : مَشَى عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ ، وَعِكْرِمَةُ بْنُ أَبِي جَهْلٍ ، وَصَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ ، فِي رِجَالٍ مِنْ قُرَيْشٍ ، مِمّنْ أُصِيبَ آبَاؤُهُمْ وَأَبْنَاؤُهُمْ وَإِخْوانُهُمْ يَوْمَ بَدْرٍ ، فَقَالُوا : يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ ! إِنَّ مُحَمَّدَاً قَدْ وَتَرَكُمْ ، وَقَتَلَ خِيَارَكُمْ فَأَعِينُونَا بِهَذَا الْمَالِ عَلَى حَرْبِهِ ، فَلَعَلَّنَا نَدْرِك مَعَهُ ثَأْرَنَا بِمَنْ أَصَابَ مِنَّا ، فَفَعَلُوا (قَالَ فِيهِم كَمَا ذكِرَ عَنِ ابْنِ عَبَاس) أَنْزَلَ اللّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبَيْهَقِي فِي (الدلائل) ج ٣ ، ٢٢٤ ، ٢٢٥ ، وَابْنُ هِشَام ج ٣ ، ص ٣ ، ٤ ، وَابْنُ أَبِي حَاتِم فِي (تفسيره) برقم : (٩٠٥٥) ، وَالطَّبَرِي، ج ٩ ، ص ١٦٠ ، وَابْنُ المنذرِ فِي (تفسيره) كما فِي الدر المنثور ، وَقَالَ مُؤَلفا الإِسْتِيعَاب ، ج ٢ ، ص ٢٣٨ ، قُلْنَا وَهَذَا مُرْسَلٌ ، صَحِيحُ الإِسناد} .

واتە : زوهریی‌و موحەممەدی کوڕی یەحیاو عاصیمی کوڕی عەمری کوڕی قەتادەو حوصەینی کوڕی عەبدوڕەحمان‌و عەمری کوڕی سەعدی کوڕی موعاز (کە هەموویان زانایانی تابیعینن) گوتوویانە : دوای ئەوەی لە جەنگی بەدردا ئەوە بەسەر کافرەکانی قوڕەیش هات ، ئەوانەیان کوژران کە جەنازەکانیان فڕێدرانە قەلیبەوە ، وە هەموو ئەوانەی گەڕانەوە بۆ مەککە ، ئەبو سوفیانیش

بە کاروانەکەیەوە بە سەلامەتیی گەڕایەوە بۆ مەککە ، عەبدوڵلای کوڕی ڕەبیعەو عیکرِمەی کوڕی ئەبو جەهلو صەفوانی کوڕی ئومەییە لەگەڵ پیاوانێکی دی لە قورەیش ، کە بابیان کوژرا بوو ، یان برایان کوژرا بوو ، یان کوڕیان کوژرا بوو ، لە جەنگی بەدردا ، گوتیان : ئەی کۆمەڵی قورەیش ! مەحەممەد بەو شێوەیەی لێکردوون ، کە ناودارەکانی ئێوەی کوشتوە ، بۆیە ئێوە بەو ماڵو سامانەی کە لەو کاروانەدا بووە ، کە ئەبو سوفیان هێناویەتەوە لە شام ، هاوکارییان بکەن ، بۆ ئەوەی جەنگی لە دژی موحەممەد پێ بکەین ، تاکو تۆڵەی خۆمانی پێ لێ بکەینەوە ، لە بەرانبەر ئەو هەموو خەڵکەی ئێمەدا کە کوژراونو ، ئەوانەی کە گیراونو ، ئەوانەی کە بریندار کراون ، ئەوانیش وایانکرد ، ئنجا وەك عەبدوڵلای کوڕی عەبباس گێڕاویەتەوە ، خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٣٦﴾ ﴾ .

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا سەرەتا باسی ئەوە دەکاتو ، دەیخاتەوە یادی پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە پاشان یادی ئۆممەتەکەی دەخاتەوە بەگشتی ، وە بەتایبەت هاوەڵانی بەرێزی ، کە چۆن پێغەمبەری خۆی ﷺ دەرباز کردوە ، لە پیلان‌و فێڵی کافرەکانی مەککە ، کاتێك کە لە مەککە بوون .

ئنجا ئێمە لە سەرەتای پێناسەی ئەم سوورەتەدا باسمان کرد ، کە هەندێك لە توێژەرەوان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ، تۆزێك سەتحییانە تەماشای ئایەتەکانیان کردوەو ، گوتوویانە : لە ئایەتی (٣٠)یەوە تاکو (٣٦) ، واتە : حەوت ئایەت لە مەککە هاتوونە خوار ، بۆچی ؟

چونکە باسی ئەو ڕووداوە دەکەن ، کە لە مەککە ڕوویداوە !

بەڵام بێگومان ئەمە وانیە ، بەڵکو خوا لە مەدینە لە گەرمەی ڕووداوەکانی بەدرو ، دوای جەنگی بەدردا ئەم سوورەتەی ناردۆتە خوارو هەموویشی پێکەوە هاتۆتە خوار ، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا چەند شتێکی دیکەشی خستۆتەوە یادی پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە هاوەڵان ، بۆ وێنە : کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ ، دەفەرموێ : یاد بکەنەوە ! کاتێك ئێوە کەم بوون‌و چەوسێنراوە بوون لە زەویداو ، دەترسان خەڵك بتانرفێنێ ، بۆیە لێرەش کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ ، یاد بکەوە کاتێك ئەوانەی بێبڕوان پیلانیان لە دژی تۆ دەگێڕا ، (واتە لە شاری مەککە)، بە تەمای فێڵ‌و تاکتیکێك بوون ، کە ئەویش لە سێ شت دا خۆی دەنواند : ﴿ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَ ﴾ :

١) یان حەپست بکەنو زیندانییت بکەن .

٢) یان بتکوژن .

٣) یان دەرت بکەن .

کە پێشتر بەسەرهاتەکەمان بە دوو ڕیوایەت هێنا ، هەم بە کورتیی‌و هەم بە درێژیی ، کە سەرەنجام کافرەکانی مەککە بڕاردەی کوشتنیان تەبەننیی کردوە ، ﴿ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ ﴾ ، ئەوان پیلانیان دەگێڕاو فێڵیان دەکرد ، خواش تەگبیری دەکرد ، هەڵبەتە بۆیە بۆ خوای پاك ، وشەی فێڵ بەکارناهێنم ، چونکە لە کوردییدا وشەی فێڵ ، زیاتر بۆ حاڵەتی خراپو مەبەستی خراپ بەکاردێ ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا وشەی (مکر) هەم باری چاکەدا بەکاری دێنن ، وە هەم بە باری خراپەدا بەکاری دێنن ، بەڵام کە لە کوردییدا کە گوترا : فێڵ ، یان فێڵباز ، یان فێڵ زان ، ئەوە بۆ کەسێکە کە دەیەوێ خەڵك هەڵخەڵەتێنێ‌و کاری خراپ بکات .

بۆیە ئەم وشەیە لە کوردییدا نابێ واتایەکەی بەکاربێ ، بەڵکو دەبێ تەعبیرێك بەکاربێ ، کە شایستەی خوای بێ وێنە بێ ، ﴿ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴾ ، وە بێگومان خوا باشترین تەگبیرکارو نەخشە دانەرە .

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەی کافرەکان دەکات ، دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا قَالُواْ قَدۡ سَمِعۡنَا لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ ﴾ ، وە کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە ، گوتیان : ئەوە بیستمان (واتە : تێگەیشتین ، دەزانین چییە ؟) ئەگەر بمانەوێ ، ئێمەش وێنەی ئەو قسەیە دەکەین : ﴿ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ ، ئەوە جگە لە ئەفسانەکانی پێشینان ، هیچی دیکە نیە .

دیارە ئێمە دوایی هەڵوەستەی زیاتر دەکەین ، کە بۆچی ئەوەیان گوتوە ؟!

